# هۆشیاریدان سەبارەت بە هەڵەی هەندێ لەنوێژخوێنان



وەرگێرانی
ناصح ئیبراهیم سازانی

پێداچوونەوەی: مامۆستا عبدالرحمن حسین پور

١٤٣٣ك - ٢٠١٢ز
چاپی دووەم

# هۆشیاریدان
# سەبارەت بە هەڵەی هەندێ
# لە نوێژخوێنان

وەرگێڕانی

ناصح ئیبراهیم سازانی

پێداچوونەوەی

م . عبدالرحمن حسین پور

چاپی دووهەم

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوۡقُوتًا ١٠٣﴾ النساء: ١٠٣.


★ ناوی كتێب: هۆشیاریدان سەبارەت بە هەڵەی هەندێ لە نوێژخوێنان.

★ كۆكردنەوەو رێكخستنی: مەحمود مصری (أبو عمار).

★ وەرگێڕانی: ناصح ئیبراهیم سازانی .

★ پێداچوونەوەی م . عبدالرحمن حسين پور

★ چاپی: دووهەم .

★ ساڵی چاپ: ٢٠١٢ زایینی - ١٤٣٣ كۆچی .

★ ژمارەی سپاردنی (١٩٧٥) ساڵی ٢٠٠٩ز پێدراوە .





★ چاپخانە: چاپەمەنی سیما - سلێمانی

# پێشەکی وەرگێڕ

**إنَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغْفِرُهُ ونَعُوذُ باللهِ مِن شُرُورِ أنفُسِنَا وسَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا مَن يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ ومَن يُضْلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وأشْهَدُ أن لاَّ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.**

لە دوایدا..

لەم ڕۆژگارەدا زۆر لە نوێژخوێنان کەوتوونەتە هەڵەوە و مزگەوتەکانیش بێ بەش نین لەو هەڵانە، جا بۆیە هۆشیاریدان سەبارەت بەو هەڵانە ئەرکی سەرشانی هەموو موسڵمانێکی شارەزایە لە قورئان و سوننەت.

ئەم پەرتوکە بە نرخەی بەڕێز (محمود المصری) زۆربەی ئەو هەڵانەی بە جوانی ڕوونکردۆتەوە، بۆیە ئێمەش بە چاکمان زانی بە پشتیوانی خوای پەروەردگار وەرگێڕینە سەر زمانی شیرنی کوردی بۆ ئەوەی نوێژخوێنان سوودی لێ وەربگرن و بەدووربن لەو هەڵانەی کە بڵاوبوونەتەوە.

جا هەرکەسێك ئەیەوێت بەندەی خوا بێت و خواپەرستی بکات ئەوە دەبێت لە هەموو گوفتارو کردارێکدا ملکەچ و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی بێت، بەپێی بەرنامەو شەرعی خواو ئەوەی خوا پێی خۆشە و ڕەزامەندی لەسەریەتی هەڵسوکەوت بکات، نە لێی زیاد بکات، وە نە لێشی کەم بکات، هیچ شتێکی داهێنراوی تێکەڵ نەکات، وە بەبێ بەڵگەی قورئان و سوننەت هیچ پەرستشێك ئەنجام نەدات.

خوای خاوەن دەسەڵات لە(حجة الوداع) واتە لە حەجی ماڵئاوایدا ئەم ئایەتەی دابەزاندووە بۆ پێغەمبەرەکەی صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ﴿٣﴾﴾ المائدة: ٣. واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتانداو، ڕازی بووم کە ئیسلام دینتان بێت.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (كُلُّ بِدعَةٍ ضَلاَلَة وكُلُّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار)[1]. هەموو شتێكی داهێنراو لە دیندا گومڕاییە، هەموو گومڕاییەكیش سەرەنجامی بۆ ناو ئاگری دۆزەخە.

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ هاتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ أحْدَثَ فِي أمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[2]. واتە: هەر كەسێك شتێك لەم دین و شەرعەی ئێمە زیاد بكات كە تیایدا نەبێت، ئەوە لێی قبوڵ ناكرێت و دەدرێتەدواوە. لە ریوایەتی پێشەوا (مسلم)دا فەرمویەتی: (مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيهِ أمرُنا فَهُوَ رَدٌّ). واتە: هەر كەسێك هەر كارو كردەوەیەك بكات كە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت و بەپێی شەرع نەبیّ ئەوە دەدرێتەدواوە.

هەر لەوبارەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (قَدْ تَرَكْتُكُمْ عَلَى الْبَيْضَاءِ لَيْلُهَا كَنَهَارِهَا لَا يَزِيغُ عَنْهَا بَعْدِي إِلَّا هَالِكٌ، مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ فَسَيَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا، فَعَلَيْكُمْ بِمَا عَرَفْتُمْ مِنْ سُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ)[3]. واتە: بەڕاستی من لەسەر ڕۆشناییەك ئێوەم جیّ هێشتووە، شەوی وەك ڕۆژی ڕووناك وەهایە، هەركەسیّ دوای من لێی لابدات بێگومان تیاچووە، ئەوەی بژی ناكۆكی زۆر دەبینیّ بۆیە پێویستە بە توندی دەسبگرن بەوەی دەیزانن لە سوننەتەكانی من و خەلیفە ڕاشیدینەكان.

لە (حذیفة)ەوە ڕەزای خوای لیّ بیّ هاتووە دەڵێت: (كَانَ النَّاسُ يَسْأَلُونَ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنِ الْخَيْرِ، وَكُنْتُ أَسْأَلُهُ عَنِ الشَّرِّ مَخَافَةَ أَنْ يُدْرِكَنِي فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا كُنَّا فِي جَاهِلِيَّةٍ وشَرٍّ، فَجَاءَنَا اللهُ بِهذَا الْخَيْرِ، فَهَلْ بَعْدَ هذَا الْخَيْرِ مِنْ شَرّ؟ قَالَ: نَعَمْ قُلْتُ: وَهَلْ بَعْدَ ذلِكَ

---

[1]- قال الشيخ الألباني: صحيح في سنن النسائي: ١٨٨/٣ برقم: ١٥٨٧.

[2]- مُتَفَقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري ٢٤١/٣ ( ٢٦٩٧ ) ، ومسلم ١٣٢/٥ ( ١٧١٨) ( ١٧ ) و( ١٨).

[3]- سلسلة الأحاديث الصحيحة برقم: ٩٣٧.

الشَّرَّ مِنْ خَيْرٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَفِيهِ دَخَنٌ قُلْتُ: وَمَا دَخَنُهُ؟ قَالَ: قَوْمٌ يَهْدُونَ بَغَيْرِ هَدْيِي، تَعْـرِفُ مِـنْهُمْ وَتُنْكِرُ)[4].

واتە: خەڵك پرسیاری چاكەیان لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەكرد، منیش پرسیاری خراپەم لێ دەكرد لەترسی ئەوەی نەوەك پێم بگات، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئێمە لە خراپە و نەفامیدا بووین خوا ئەم خێرەی بۆ هێناین، واتە: ئیسلام. ئایا لەدوای ئەم خێرە خراپە هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ). وتم: ئایا لەپاش ئەو خراپە خێر هەیە؟ فەرمووی: (بەڵێ، بەڵام خڵتەی تێدایە). وتم: خڵتەكەی چیە؟ فەرمووی: (كۆمەڵێكن لەسەر ڕێبازێك جگە لە ڕێبازەكەی من دەڕۆن، بەجگە لە ڕێنمایی من ڕێنمایی دەكەن، چاكەو خراپەیان لێ دەبینیت).

شاعیر دەڵێ:

عرفت الشر لا للشر ... لكن لتوقيـه

فمن لا يعرف الشر ... من الخير يقع فيه

واتە: خراپەم ناسی نەك لەبەر خودی خراپەكـە بـەڵكو بـۆ خۆپاراسـتن لێـی، هەركەسێك خراپەو چاكە لێك جیانەكاتەوە دەكەوێتە ناو خراپەوە.

ناصح ئیبراهیم سازانی

سلێمانی

ساڵی ١٤٣٣ی كۆچی

٢٠١٢ی زاییـنی

[4]- اخرجه البخاري (١٣ / ٢٩) وغيره.

# پێشەکی بەڕێز دکتۆر

(زكي محمد أبو سريع)... خوا بیپارێزێت.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستهديه، ونؤمن به ونتوكل عليه، ونثنى عليه الخير كله، نشكره ولا نكفره، ونترك من يكفره.. وأشهد أن لا اله الاالله وحده لا شريك له، من يهد الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادى له ويذرهم في طغيانهم يعمهون.**

**واشهد ان محمدا عبده ورسوله، وحبيبه من خلقه وخليله.. لأخرج به الناس من الظلمات إلى النور بإذن ربهم إلى صراط العزيز الحميد.**

**اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد، اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على آل إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد.**

لە دوایدا..

خوای گەورەو پەروەردگار ئادەمیزاد و جنۆکەی بۆ پەرستنی خۆی خەڵق کردووە، وەك لە قورئانی پیرۆزدا بە ئاشکرا لەوبارەوە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنْهُم مِّن رِّزْقٍ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطْعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦ - ٥٨. واتە: من هەر بۆیە جنۆکەو ئادەمیم دروستکردووە بم ناسن و بم پەرستن. من هیچ رزق و رۆزیم ناوێ لەوان بۆ خۆم، ناشمەوێ خۆراکم بدەنێ. چونکە تەنها خوا رۆزیدەرەو خاوەنی هێزی چار نەکراو. کەسیش ناتوانێت زاڵ بێت بە سەریدا.

ویستی خوای پەروەردگار وایە بەندەکانی خۆی بەپاکی دروستکردوون لەسەر بە تەنها خوا پەرستی، بەڵام شەیتانەکان بۆ لایان دەچن و فێڵیان لێدەکەن و دەیان خەڵەتێنن و لەڕێی راست لایان دەدەن، رەحمەتی خواوەند وایە پەیامبەران و فروستادەی بۆ ناردوون بۆ ئەوەی رەزامەندی پەروەردگاری خۆیان بەدەست بهێننن: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ

عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾ النساء: ١٦٥. واتە: پێغەمبەران (مان ناردووە) کە موژدەدەرن و ترسێنەرن بۆ ئەوەی بۆ خەڵك نەبێت بە بەڵگە بەسەر خواوە دوای ناردنی پێغەمبەران، وە خوا هەمیشە زاڵی کار دروستە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ ﴾ البقرة: ٢١٣. واتە: ئادەمی یەك كۆمەڵ بوون (بە سروشت) ئینجا خودا پێغەمبەرانی نارد بە موژدەدەر و ترسێنەر وە کتێبی راستی و دروستی لەگەڵدا ناردونە خوارەوە تا بڕیار بدات لەناو خەڵکدا لەو شتانەی کە دووبەرەکی بوون تیایدا، وە کەس دووبەرەکی نەکرد لە کتێبی ئاسمانیدا، مەگەر ئەوانەی کە کتێبیان پێ درا بوو دوای ئەوەی نیشانەو بەڵگەی رۆشنیان بۆ هات بەهۆی حەسادەتی ناو خۆیانەوە، ئینجا خوا خۆی رێنموونی بڕوادارانی کرد بۆ ئەو رێگا راستەی کە دووبەرەکیان تیادا دەکرد وە خوا کێی بوێت رێنموونی دەکات بۆ رێبازی راست.

بەردەوام فروستادە و پەیامبەران پەیامی پەروەردگاری خۆیان گەیاندووە و کاری چاکسازی و گومڕایی بەدیهێنراوانیش تەنها خوا دەسەڵاتدارە بەسەریا وەك قورئانی پیرۆز بە ئاشکرا - لە بەسەرهاتی پێغەمبەری خوا هود- سەلامی خوای لەسەر بێ گێڕاویەتیەوە و دەفەرموێت: ﴿ إِنِّي تَوَكَّلۡتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّي وَرَبِّكُمۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذُۢ بِنَاصِيَتِهَآۚ إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾ ﴾ هود: ٥٦. واتە: بە ڕاستی من پشتم بە خوا بەستووە کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە هیچ گیان لەبەرێك نیە مەگەر خوا دەسەڵاتدارە بەسەریا، بە ڕاستی پەروەردگارم لەسەر رێگایەکی راستە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ مَّا يَفۡتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحۡمَةٖ فَلَا مُمۡسِكَ لَهَاۖ وَمَا يُمۡسِكۡ فَلَا مُرۡسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ ﴾ فاطر: ٢. واتە: خوا هەر بەهرەو چاکەیەك بۆ خەڵك بکاتەوە ئیتر بەرگری کەرێکی بۆ نیە، وە خوا هەر بەهرەیەك بگرێتەوە ئیتر لەپاش گرتنەوەی خوا، بەرەڵاکەرو نێرەری بۆ نیە، وە خوا زاڵی کار دروستە.

بە درێژایی رۆژگار کاری فروستادەو پەیامبەران بەو شێوەیە بوو یەك لەدوای یەك،

هەتا خوای گەورە ڕێزی لە جیهانیان ناو دواهەمین پەیامبەرو چاکترین فروستادەو هەڵبژاردەی خۆی بۆ ناردن.. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾ الأنبياء: ١٠٧ . واتە: (ئەی موحەممەد) تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردووە کە ڕەحمەت بیت بۆ جیهانیان.

هەروەکو چۆن فەزڵ و بەخششی خۆی ڕژاندووە بە سەرماندا بەوەی فەرمانەکانی دینەکەی بە تەواوی بۆ ئاشکرا کردووین .. خوای خاوەن دەسەڵات دەفەرموێت: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ٣ ﴾ المائدة: ٣. واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم تەواو (کامڵ) کردووە بۆتان و چاکەو بەهرەی خۆم بەتەواوی ڕشتووە بەسەرتانداو، ڕازی بووم کە ئیسلام دینتان بێت.

یەکێك لە ئاسەواری ڕەحمەت و فەزڵی خوای گەورە ئەوەیە ئەم دینە بەرنامەیەکی گشتی و تەواوە بۆ ژیانی دنیا و قیامەت، ترساندن و هاندانی بۆ خێر و چاکە هەمە چەشنەیە، بەخشینی ڕژدی تێدا نیە، نورو روناکی لە هیچ سەردەمێ لە سەردەمەکاندا ناکوژێتەوە هەرچەندە ژیان درێژە بکێشێت.. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ٨٩ ﴾ النحل: ٨٩. واتە: وە ئێمە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بۆت کە ڕوونکەرەوەیە بۆ هەموو شتێ، وە ڕێنمونی و میهرەبانی و مژدەیە بۆ موسڵمانان.

بەشەکانی ئیمان زۆرن، شەست و ئەوەندە - یان حەفتاو ئەوەندە بەشە - گەورەترینی وشەی (لا إله إلا الله)یە، هەرە خوارەوەکەیان لابردنی ئازاری سەر ڕێگایە.

گەورەترین بەخشیشی خوای گەورە لەدوای وشەی: (لا اله الا الله) یەکتاپەرستی: بەڕێوەبردن و بەرزکردنەوەی نوێژە- بە باوەڕ و گوفتار و کردار- بەڵگەش بۆ بەرزی پلەو پایەی نوێژ ئەوەیە: یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئیسلام و کۆڵەکەو پایەی دینە، کە بەبێ نوێژ ڕاناوەستێ.. نیشانەو بنچینەی سەرفرازی و بەختەوەری و سەرکەوتنە .. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢ ﴾ المؤمنون: ١ - ٢ . واتە: بەڕاستی ئەو ئیماندارانە سەرکەوتو سەر فەراز بوون.. ئەوانەش ئەو کەسانەن لە نوێژەکانیان دا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراوون، دڵیان لای خوای خۆیانە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

به نوێژکردن باوەڕداران لە بێ باوەڕان جیادەکرێنەوە، کەمتەرخەمی و گوێنەدان بە نوێژ یان بەهەندێ لە روکنەکانی نیشانەیەکە لە نیشانەکانی مونافیقی: خوای پەروەردگار دەربارەی مونافیقەکان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾﴾ النساء: ١٤٢. واتە: هەر کاتێك هەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی و سستی هەڵدەستن روپامایی بۆ خەڵك دەکەن، وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت.

ئەو نوێژ نەکەرەی کە باوەڕی بە مەشروعیەتی نوێژ نەبێت و نکولی بکات: پێی کافر دەبێت بە کوفرێکی ئاشکرا لە کۆمەڵی موسڵمانان دەچێتە دەرەوە، سێ جار داوای لێ دەکرێت تەوبە بکات ئەگەر نەیکرد ئەوا بە پێی شەرع لەلایەن حاکمەوە دەکوژرێت. بەڵام ئەگەر لەبەر تەمەڵی تەرکی نوێژ بکات و نکولی نەکات پێی کافر نابێت سێ جار داوای لێ دەکرێت تەوبە بکات، ئەکەر نەیکرد وەك سزادان دەکوژرێت.

لە سەردەمە زێڕینەکانی ئیسلامدا موسڵمانان ئەوەندە گرنگیان بە نوێژ داوە کە پیاوی نەخۆشی وا کە لەسەر قاچی خۆی نەگرتووە بەدوو نەفەر هێنراوەو خراوەتە ناو ریزی نوێژخوێنانەوە بە هیوای دەستکەوتنی پاداشتی زۆر و ترسان لەو هەڕەشە و بەڵێنانەی کە دراوە بەوانەی تەرکی نوێژ دەکەن و کەمتەرخەمی تیادەکەن .. ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾﴾ الماعون: ٤-٥. واتە: وای بۆ نوێژکەران، ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان.

ژیان و بەسەرهاتی ئوممەت بە پێی قەدەری خوا نەوەو سەردەمەکانیەوە لە چاکەوە گۆڕا بۆ خراپە، پاشان بەرەو خراپتر، ئەکەر خوا کارێك بەدی بهێنێ هەر بەدی دێت.. ئەم قەزاو قەردەرەی خوا لەم فەرمودەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم دەبینین کە دەفەرموێت: (خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم.. ثم يأتي أقوام يقرأون القرآن لا يجاوز حناجرهم..). واتە: چاکترین خەڵك خەڵکانی سەردەمی منن، پاشان دوای ئەوان، پاشان دوای ئەوان.. پاشان خەڵکانێك دێن لەدوای ئەوان قورئان دەخوێنن لە قوڕقوڕاگەیان تێپەڕ ناکات.

لە (مأثور)دا هاتووە کە (عبدالله)ی کوڕی مەسعود رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: سەردەمێك دێتە پێشەوە ئیسلام هیچ شتێکی نامێنێتەوە جگە لە شێوەکەی، قورئانیش تەنها پیتەکانی دەمێنێتەوە .

ئەم فەرمودە(موقوف)ە وێنەیەکی رەشی ئەو گۆڕانە بنەڕەتیەمان دەداتێ کە موسڵمانەکان بە جۆرێك وازیان لە دینەکەیان هێناوەو کار گەیشتۆتە ئەو رادەیە بەدیهێنراوان پێی رازی نین چ جای خالق و کردگاری زانا!!.

## لەو وێنە رەش و ئابڕوبەرانە:

گاڵتەکردنی نوێژخوێنانە بە نوێژ و دەستنوێژ و پاك و خاوێنی هەتا کار گەیشتۆتە حاڵەتێ کە دینیان شێوەیە نەك ناوەڕۆك و جەوهەر، وە هیچ رۆحی تێدا نیە .. (كم من قائم حظه من قيامه التعب والنصب، وكم من صائم حظه من صيامه إلا الجوع والعطش)[5]. واتە: چەند نوێژخوێن هەیە هیچی پێ نابڕێت جگە لە هیلاکی و ماندوێتی، وە چەند رۆژووەوانیش هەیە تەنها برسێتی و تینوێتی بۆ دەمێنێتەوە.

هەر لەبەر گرنگی و بەرزی پلەو پایەی نوێژ بووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تەرکیزی کردۆتە سەر نوێژ، تەنانەت لە نەخۆشی سەرەمەرگدا هۆشداری داوە بە موساڵمانان ئاگایان لە نوێژەکانیان بێ و لەگەڵ بەندەکانی ژێر دەستیان بەچاکی رەفتار بکەن و زوڵم و ستەمیان لێ نەکەن: (الصَلاّة، الصَلاّة، وما مَلَكَتَ أَيْمانُكم)[6].

ئەوەی کە راستگۆ و بەڕاست زانراو پێشبینی کردبوو کە موسڵمانان- جگە لەوانەی کە خوا رەحمی پێ کردوون- سوکایەتی و کەمتەرخەمی بە نوێژ و دەستنوێژ و پاك و خاوێنی دەکەن رویداو گوناهی خۆیان لە ئەستۆی خۆیانەو رەحمیان پێ ناکرێ، زۆربەیان دوای ئەوەی نوێژ بەجێ دێنن نازانن چیان بیستووە یان چیان خوێندووە، هەتا کاتێ لە نوێژکردن دەبنەوە هەناسەیەکی حەوانەوەی لێ هەڵدەکێشن وەك ئەوەی کۆڵێکی قورسیان لە کۆڵ بوبێتەوە زمان حاڵیان دەڵێ: (أَرِحنا منها يا بيلال)!!! واتە: ئەی بیلال رزگارمان بکە لە نوێژکردن. (فإنا لله وإنا إليه راجعون)، خودایە پاداشتی بەڵاو ناخۆشیەکانمان بدەرەوە و جێگاکەمان بەچاکتر بۆ پڕبکەرەوە..

---

[5]- رواه إبن ماجه وغيره بسند حسن عن النبي صلى الله عليه سلم .

[6]- رواه إبن ماجه، صحيح سنن أبو داود (٤٢٩٥)، وانظر الإرواء: (٢١٧٨).

برای بەڕێز و تێکۆشەر شێخ مەحمود المصری (أبو عمار) چەند ساڵانێکە دەیناسم کەسێکە زۆر بە لەسەرخۆیی و هێمنیەوە دەخوێنێتەوە، مادە زانستیەکان بە خۆشەویستیەوە کۆدەکاتەوە، بە خۆڕاگریی و ئارامیەوە وردبینی دەکات، بە ورەیەکی بەرزەوە لێکۆڵینەوە دەکات، بە نەرمونیانی دەدوێت، چاکەو بەخشینی کارەکانی زیاد بێت خوای گەورە نمونەی زۆر بکات و پاداشتی بداتەوە بەوشێوەیەیەی کە شایانیەتی..

﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ٢١﴾ الحديد: ٢١. واتە: ئەو پاداشتە فەزڵ و بەخششێکی خوایە دەیدات بە هەرکەسێك کە خۆی بیەوێت، وە خوا خاوەنی فەزڵ و بەخششی گەورەیە.

ئەم پەرتوکەی لەبەر دەستماندایە: (إرشاد السالكين الى أخطاء المصلين) کارێکە لە کارەکانی، قەبارەی بچوکە بەڵام پلەو پایەی گەورەیە، دەقەکانی کۆکردۆتەوەو هەمووی لەخۆ گرتووە، هاندەرە بۆ خێر و چاکە، سەبارەت بە خراپە هۆشیاریداوەو "بە دژەکان شتەکان جیادەکرێنەوە". چاکە لای خوا چاوەڕوان کراوە، پەنا بۆ خوا بردن گەیشتنە بە موراد، خوای گەورە پاداشتی چاکەی دانەرەکەی بداتەوە بە چاکترین پاداشت، وەك چۆن پاداشتی پێشینە چاکەکانی داوەتەوە بارانی ڕەحمەت و ڕەزامەندی بڕژێ بەسەریاندا لە بەهەشتی بەرینی پڕ لە نازو نیعمەتی بەردەوام و ڕەحمەتی تەواو نەبڕاوەدا ئێمەش و ئەوانیش کۆکاتەوە.

لە کۆتاییدا دوعاو پاڕانەوەمان ئەمەیە سوپاس و ستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان. درود و سڵاو لەسەر خۆشەویستی موحەممەد و خانەوادەو هاوەڵانی.

**دکتۆر (زكی محمد ابو سريع) مامۆستای تەفسیرو**

**زانستی قورئان لە زانكۆی ئەزهەر**

# پێشەکی دانەر

الحمد لله غمر العباد بلطائفه، وعمر قلوبهم بأنوار الدين و وظائفه، فارق الملوك مع التفرد بالجلال و الكبرياء بترغيب الخلق في السؤال والدعاء فقال: هل من داع فأستجيب له، وهل من مستغفر فأغفر له؟ وباين السلاطين بفتح الباب، ورفع الحجاب فرخص للعباد في مناجات بالصلوات كيفما تقلبت بهم الحالات في الجماعات والخلوات، ولم يقتصر علة الرخصة، بل تلطف بالترغيب والدعوة وغيره من ضعفاء الملوك لا يسمح بالخلوة إلا بعد تقديم الهدية والرشوة.

فسبحانه ما أعظم شأنه وأقوى سلطانه، وأتم لطفه، وأعم إحسانه، والصلاة على محمد نبيه المصطفى و وليه المجتبى وعلى آله وأصحابه مفاتيح الدجى وسلم تسليما.

له دوایدا:

بەڕاستی نوێژ کۆڵەکەی دینە، خۆگرتنە بەپەتی دڵنیاییەوە، چڵە پۆپەی خێر و چاکەیە، سەرەتای گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریە[7].

یەکەم فەرزە لەدوای ئیخلاص و یەکتاپەرستی.. خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۞﴾ البينة: ٥ .

له ئیبن عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (أُمِرْتُ أنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أنْ لاَ إلهَ إلاَّ اللهُ، وَأنَّ مُحَمَّداً رسول الله ، وَيُقِيمُوا الصَّلاةَ ، وَيُؤتُوا الزَّكَاةَ، فَإذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِني دِمَاءهُمْ وَأمْوَالَهُمْ ، إلاَّ بِحَقِّ

[7]- الإحياء علوم الدين للغزالي: (١/ ٢١٤) ط مكتبة الإيمان.

الإِسْلَامِ ، وَحِسَابُهُم عَلَى الله)[8]. واته: من فەرمانم پێکراوە لەگەڵ خەڵکدا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن و دەڵێن: (أشهد أن لا إلە إلا الله، و أن محمدا رسول الله)، نوێژ بکەن بە ڕێکوپێکی و زەکات بدەن، ئەگەر ئەوانە ئەوەیان کرد خوێن و ماڵیان دەپارێزن لێم بەحەقی ئیسلام نەبێت، دوای ئەوە لێپرسینەوەیان لەلای خوایە.

کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم موعاز ڕەوانەی یەمەن دەکات بۆ ئەوەی بانگەوازی خەڵك بکات بۆ سەر ئایینی ئیسلام پێی فەرموو: (يَا مَعاذ إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ)[9]. واته: ئەی موعاز! یەکەم شت بانگیان بکە شایەتومان بهێنن، جا ئەگەر گوێڕایەڵیان کردی و شایەتومانیان هێنا، فێریان بکە و تێیان بگەیەنە خوای گەورە لە شەوو ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەر فەرزکردوون، بە چاکی و لەکاتی خۆیاندا بەجێی بهێنن.

بەڵکو لە ڕاستیدا خوای گەورە نوێژی فەرزکردووە لەسەر هەموو پەیامبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ:

خوای پەروەردگار دەربارەی موسا دەفەرموێت: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوْمِكُمَا بِمِصْرَ بُيُوتًا وَٱجْعَلُواْ بُيُوتَكُمْ قِبْلَةً وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ۗ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ يونس: ٨٧.

دەربارەی پاڕانەوەکانی ئیبراهیم دەفەرموێت: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ ابراهيم: ٣٧ .

دەربارەی ئیسماعیل دەفەرموێت: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرْضِيًّا ﴿٥٥﴾ ﴾ مريم: ٥٤ - ٥٥

---

8- متفقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري: (٥٧/١) الإيمان ، ومسلم (٢٠٦/١، ٢٠٧).

9- اخرجه مسلم: (١٩٦/١، ١٩٧) الإيمان.

دەربارەی نوح و هەموو پەیامبەرانی دوای ئەو دەفەرموێت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ﴿٥٨﴾﴾ مريم: ٥٨.

خوای گەورە رایگەیاندووە کە پەیامبەران نوێژیان کردووە خوایان بە تـەنیا پەرستووەو خێر و چاکەیان کردووە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵێن و پەیمانی لەسەر نوێژکردن وەرگرتووە، لە (جریر کوڕی عبدالله) وە هاتووە دەڵێت: (بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ)[10]. واتە: بەڵێن و پەیمانمدا  بە پێغەمبەر کە نوێژ بکەم و زەکات بدەم و ئامۆژگاری هەموو موسڵمانێك بکەم.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە کۆڵەکەی دین وەسفی کردووە و بەبێ کۆڵەکەیش دین راناوەستێ دەفەرموێت: (بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ وَإِقَامِ الصَّلاَةِ وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ وَحَجِّ الْبَيْتِ وَصَوْمِ رَمَضَانَ)[11]. واتە: ئیسلامەتی لەسەر ئەم پێنج پایە دامەزراوە: شایەتومان، نوێژکردن بە رێکوپێکی، زەکات دەرکردن، حەج کردن، رۆژوو گرتنی مانگی رەمەزان.

نوێژکردن لە یەکەم کاتی خۆیدا خۆشەویسترین کردەوەیە لەلای خوا، لە عبدالله کوڕی مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم  چ کردەوەیە خێرو گەورەیە لای خوا؟ فەرمووی: (الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا). واتە: نوێژکردن لەکاتی خۆیدا. وتم: پاشان چی تر؟ فەرمووی: (ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ). واتە: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك. وتم دوای ئەو؟ فەرمووی: (الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ)[12]. واتە: جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوا. لە ریوایەتێکی تردا: (أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟). چ کردەوەیە چاکترینە.

نوێژ یەکەم کردەوەی ئەندامەکانە کە لەرۆژی قیامەتدا لێپرسینەوەی لەسەر دەکرێ.

10– أخرجه البخاري: (٧/٢) مواقيت الصلاة، ومسلم: (٣٩/٢) الإيمان.

11– أخرجه البخاري: (٤٩/١) الإيمان، ومسلم: (١٧٧/١) الإيمان.

12– أخرجه البخاري: ٩/٢ (٥٢٧) مواقيت الصلاة، ومسلم: ٢/ ٧٣ (٨٥).

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إنَّ أوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِـنْ عَمَلِهِ صَلاتُهُ ، فَإنْ صَلَحَتْ ، فَقَدْ أفْلَحَ وأنْجحَ ، وَإنْ فَسَدَتْ ، فَقَدْ خَابَ وَخَسرَ ، فَإنْ انْتَقَصَ مِـنْ فَرِيضَتِهِ شَيْءٌ ، قَالَ الرَّبُّ عز وجل: انْظُرُوا هَلْ لِعَبدي من تطوّعٍ ، فَيُكَمَّلُ مِنْهَا مَـا انْـتَقَصَ مِـنَ الفَرِيضَةِ ؟ ثُمَّ تَكُونُ سَائِرُ أعْمَالِهِ عَلَى ذلِكَ)[13].

واتە: یەکەم شتێ بەندە لە قیامەتدا موحاسەبەی دەکەن لەسەری نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی پەسەند و تەواو بوون، ئەوا کردەوەکانی تریشی چاك و تەواو دەبن و سەرفراز و سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەر خراپ ئەنجامی دابوون و تەواو نەبوون ئەوا کردەوەکانی تریشی خراپ و ناتەواو دەبن، ئەوکاتە دۆڕاوو پەشیمانە، ئەگەر هەندێ نوێژی چوو بوو یان هەندێ نوێژی ناتەواوی و کەموکوڕی هەبوو، ئەوا خوا دەفەرموێت: تەماشا بکەن بزانن ئایا ئەم بەندەیەی من نوێژی سوننەتی هەیە وە سوننەتەکانی نوێژی جێبەجێ کردووە؟ جا ئەگەر هەیبوو ئەوا دەفەرموێت: ناتەواوی فەرزەکانی ئەم بەندەیەم لە سوننەتەکانی تەواو بکەن، ئیتر هەموو کردەوەکانی تریشی بەم شێوەیە لێ وەردەگیرێت.

خوای پەروەردگار نوێژی کردووە بە هۆی کەفارەتی تاوان و گوناهەکان... دەفەرموێت: ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيۡلِۚ إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ ﴾ هود: ١١٤. واتە: ئەگەر موسوڵمان دەستنوێژی گرت بە چاکی، پاشان پێنج فەرزەی نوێژی کرد، گوناهەکانی هەڵئەوەرێت وەك گەڵای ئەو درختە. پاشان فەرموی: خوای گەورەش دەفەرموێت: نوێژ بەچاکی ئەنجام بدە لەهەر دووسەری رۆژەوە و لە بەشێك لە شەویشدا، بەڕاستی کردەوە چاکەکان خراپەکان لادەبەن و گوناهەکان دەشۆنەوە، ئەوە ئامۆژگاری و بیر خەرەوەیە بۆ ئەوانەی زیکرو یادی خوا دەکەن و پەند وەردەگرن.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (الصلوات الخمس والجمعة الى الجمعة كفارات لما بينهما ما اجتنب الكبائر)[14]. واتە: پێنج فەرزەی نوێژ، وە نوێژی جومعە بۆ جومعەیەکی تر دبێتە هۆی شۆردنەوەی گوناه و تاوانی نێوانیان بەمەرجێ لە تاوانە گەورەکان نەبن.

خوای پەروەردگار ستایشی نوێژخوێنانی پێ کردووە و دەیانکات بە خەڵکانی فیردەوسی بەرزو بڵند، دەفەرموێت: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾ المؤمنون: ١

---

[13]- رواه التِّرمِذِيُّ وَالنسائي عن أبي هريرة – صحيح الجامع: ٢٠٢٠.

[14]- أخرجه : مسلم ١٤٤/١ ( ٢٣٣ ) ( ١٤ ) ، وابن ماجه:(١٠٨٦).

- ٢ . واته: بەڕاستی ئەو ئیماندارانە سەرکەوتو سەر فەراز بوون.. ئەوانەش ئەو کەسانەن لە نوێژەکانیان دا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراوون دڵیان لای خوای خۆیانە و بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن، پاشان باسی پاداشتیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾ المؤمنون: ٩ - ١١.

واتە: وە ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان، هەر ئەوانەن میرات گران، ئەوانەی کە دەبنە خاوەن فیردەوس(بەهەشت)، ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا فَرَغَ اللَّهُ مِنْ الْقَضَاءِ بَيْنَ عِبَادِهِ وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِنْ النَّارِ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ مِمَّنْ كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَمَرَ الْمَلَائِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوهُمْ فَيَعْرِفُونَهُمْ بِعَلَامَةِ آثَارِ السُّجُودِ وَحَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ مِنْ ابْنِ آدَمَ أَثَرَ السُّجُودِ فَيُخْرِجُونَهُمْ قَدْ امْتُحِشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءٌ يُقَالُ لَهُ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ)[١٥]. واتە: دوای ئەوەی خوای گەورە لە دادگایی کردنی بەندەکانی لێ بوویەوە، ویستی هەر بەندەیەك لەو بەندانەی کە شایەتمانیان هێناوە بە تاك و تەنیایی خوا بێنێتە دەرەوە لە دۆزەخ فەرمان دەکات بە مەلائیکە بیان هێننە دەرەوە ئەوانیش بە شوێنی سەجدەکانیان دەیانناسنەوە واتە نێوچاوانیان، خوای گەورە سوتاندنی شوێنی سەجدەی لەسەر ئاگر حەرام کردووە، جا دەیان هێننە دەرەوە وەك خەڵوز وان پێستیان سوتاوەو ئێسکەکانیان بەدەرەوەیە ئاوێکیان پێدا دەکەن پێی دەڵێن ئاوی حەیات ئیتر دەژێنەوە وەك ئەو دەنکە تۆوەی کە لافاو دەیبات لە شوێنێکا بە جوانی سەوز دەبێت.

هەر لەم پێناوەدا بوو نوێژ دوا وتە و ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو بۆ ئوممەتەکەی.

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: دوا وەسیەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە کاتی سەرەمەرگدا ئەوە بووە دەیفەرموو: (الصَّلَاةَ،

---

[15]- جزء من حديث أخرجه البخاري: (٤٤٥/١١) الرقاق، ومسلم: (٢٢/٣) الإيمان.

الصَلاّة، اتّقُوا اللهُ فِيما مَلَكَتَ أيْمانُكم)[16]. واته: نوێژەکانتان، نوێژەکانتان، دەربارەی بەندەکانی ژێر دەستان تەقوای خواتان ببێت و زوڵم و ستەمیان لێ مەکەن.

هەر لەم پێناوەدا پێویستە لەسەرمان هەڵوێستەیەکی راستگۆیانە بکەین لەگەڵ نوێژ و حاڵی نوێژخوێناندا، بەڕاستی ئەوەی یەکەم لە هاوەڵان زۆر سوربوون لەسەر ئەوەی چۆن خۆشەویست صلى الله عليه وسلم نوێژەکانی بەجێ دەهێنا ئەوانیش بەو شێوەیە بەجێی بهێنن.

لەگەڵ بەدوای یەکدا هاتنی رۆژگار و شەواندا ئوممەتی موسڵمان " مەگەر ئەوەی خوا رەحمی پێ کردبێ" دورکەوتنەوە لە سەرچاوەی نور و هیدایەت، بیدعە وهەڵەی زۆریان تێکەڵاوی نوێژ کرد (لا حول ولا قوة إلا بالله) بۆیە پێویستە لەسەرمان ئەو چەمکانە راست بکەینەوەو هەڵەکانیش نەهێڵین ئەویش بە رونکردنەوەی ئەو بیدعانە دەبێت کە بڵاوبوونەتەوە، هەروەها بە رونکردنەوەی ئەو سوننەتانەی کە فەرامۆشکراون بیانخەینەوە بیری موسڵمانان.

من داواکارم لە خوای گەورە لە کەموکوڕیەکانم ببورێت وە دوای لێ دەکەم سەرکەوتووم بکات بۆ ئەوەی خۆی پێی خۆشە و لێی رازییە.

سوێند بە خوا لە کاتێکدا ئەم پەیامە پێش کەشی خوشك و براکانم دەکەم زمانی حاڵ و وتەکانم دەڵێ: ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾﴾ هود: ٨٨. واتە: من هیچ مەبەستێکم نیە بێجگە لە چاکەکردن ئەوەندەی بتوانم سەرکەوتوویم تەنها بە (پشتیوانی) خوایە، پشتم هەر بەو بەستووە، هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە.

داواکارم لە خوای گەورە لە گوفتار و کرداردا ئیخلاصم پێ ببەخشێت، بیخاتە سەر تای تەرازووی کردەوەکانم ئەو رۆژەی دەپێچرێم لە کفنەوە سوودمەند بێ بۆ هەموو کات و سەردەمێك.

ئەم بەرهەمە پێشکەش دەکەم بە باوك و دایکی خۆشەویستم من ناتوانم پاداشتیان بدەمەوە بۆیە داواکارم لە خوای گەورە بە چاکترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

هەروەها پێشکەشی دەکەم بە بەڕێز شێخ (محمد عبد المقصود) کە سوودی زۆری پێ گەیاندم، من ناتوانم پاداشتی بدەمەوە بۆیە داواکارم لە خوای گەورە بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

---

[16]– رواه أحمد: ٣/ ١١٧، وابن ماجه: (٢٦٩٧) وصححه الألباني في الإرواء: (٢١٧٨).

پێشکەشی دەکەم بە مامۆستای هەمیشە لە یاد نەچووم کە لە پێش زانست و زانیاریەوە فێری سۆز و بەزەیی کردم بەڕێز دکتۆر (زکی محمد أبو سریع).. من ناتوانم پاداشتی بدەمەوە بۆیە داواکارم لە خوای گەورە بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە

پێشکەشی دەکەم بە شێخ (محمد حسان) کە هەمیشە لە یادمە چۆن پشتیوانی لێ کردم، داواکارم لە خوای گەورە بە چاکترین شێوە پاداشتی بداتەوە.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا الله أستغفرك وأتوب إليك وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

نووسینی هەژاری بەر قاپی ڕەحمەتی پەروەردگار (محمود المصری أبو عمار).

# بیدعەو هەڵەکانی مزگەوتەکان

### ١- نەکردنی نوێژی چوونە مزگەوت:

یەکێك لەو سەرپێچیانەی کە بڵاوبۆتەوە لەناو نوێژخوێناندا ئەوەیە: کاتێك دەچنە ناو مزگەوتەوە دادەنیشن بەبێ ئەوەی دوو رکات نوێژی چوونە مزگەوت بکەن.

لە ئەبی قەتادەی سەلیمەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمْ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ)[١٧]. واتە: هەر کەسێك لە ئێوە چووە ناو مزگەوت پێش ئەوەی دابنیشێت با دوو رکات نوێژ بکات.

جارێك (أبو ذر) چووە ناو مزگەوت و دانیشت، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (أَرَكَعْتَ رَكْعَتَيْنِ ؟) واتە: ئایا دوو رکات نوێژت کرد؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: (قُمْ فَارْكَعْهُمَا)[١٨]. واتە: هەستە دوو رکات نوێژ بکە.

(إبن حبان) لە راڤەی ئەم فەرموودەیەدا دەڵێ: نوێژی چوونە مزگەوت بەدانیشتن نافەوتێت، واتە دوای ئەوەی دانیشت دەتوانێت هەستێتەوە ئەو دوو رکات نوێژە بکات. هەروەها بۆی هەیە لەهەموو کاتەکاندا بیانکات تەنانەت لەو کاتانەشدا کە نوێژکردن تێیاندا قەدەغەکراوە، وەك لە دوای کازیوەی بەیانی و لەدوای نوێژی عەسر.. چونکە لە نوێژە خاوەن

---

[17]- أخرجه البخاري: (٤٤٤).

[18]- أخرجه ابن حبان في صحيحه، كما في الفتح: (١/ ٥٣٨).

هۆكانن وەك نوێژی تەوافی ماڵی خواو نوێژی خۆر گیران.

**٢- نەكردنی پاڕانەوەی چوونە مزگەوت و هاتنەدەر:**

زۆر لە نوێژخوێنان سوننەتی چوونە مزگەوت و هاتنەدەرەوە و ئەو زیكرانەی لەو بارەوە هاتووون نازانن... لەبەرئەوە پێیان دەڵێم: ئەوەی دەیەوێت بچێتە مزگەوت سوننەتە پێی ڕاستی پێش بخات، كاتێكیش هاتەدەرەوە پێی چەپی.

سەبارەت بە زیكرەكانی چوونە مزگەوت و هاتنەدەرەوە، ئەوە ئێوەو چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە كە ئەم كارە ڕوون دەكەنەوە:

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ دەچووە مزگەوت دەیفەرموو: (بسم الله اللهمَّ صلِّ على محمد). وە لە كاتی هاتنەدەردا دەیفەرموو: (بسم الله اللهمَّ صلِّ على محمد)[١٩]. واتە: بەناوی خوا، خودایە بارانی درود و میهرەبانیت بڕژێنە بەسەر موحەممەددا.

لە ئەبی حومەید یا ئەبی ئوسەیدەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویانە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: ئەگەر یەكێ لە ئێوە ویستی بچێتە مزگەوتەوە با سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پاشان بڵێ: (اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ). واتە: خودایە دەرگای ڕەحمەتی خۆتم بۆ بكەرەوە.

كاتێ كە هاتەدەرەوە بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ)[٢٠]. واتە: خودایە داوای بەخشش و بەهرەی خۆتت لێ دەكەم.

لە (عبدالله)ی كوڕی عەمرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم كاتێ دەچووە مزگەوت دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)[٢١]. واتە: پەنا دەگرم بە خوای گەورەو، ڕووی پیرۆزی و دەسەڵاتی هەمیشەیی لە شەیتانی نەفرین كراو. فەرمووی: ئەگەر ئەمەی وت، شەیتان دەڵێ:

---

[19]– رواه ابن السني في(عمل اليوم والليلة) وحسنه الألباني في(الكلم الطيب) (٦٣).

[20]– أخرجه مسلم: (٧١٣)، صلاة المسافرين – وابن ماجة: (٧٢٢).

[21]– رواه أبو داود: (٤٤٦) وصححه الألباني في صحيح الجامع : (٤٧١٥).

ئەمڕۆ بە بەردەوامی لە خراپەی من پارێزراوە.

**٣- چوونە مزگەوتەکان بە جل و بەرگی پیسەوە لەکاتێکدا کە بتوانێت جوانیان بکات:**

هەندێ کەس بە جل و بەرگی دڕاو و بە بۆنی ناخۆشەوە دەچنە ناو مزگەوتەکان و لەبەردەم پەروەردگاریاندا رادەوەستن، لە کاتێکدا دەتوانن خۆیان بڕازێننەوە و پۆشاکی خاوێن لەبەربکەن، گریمان ئەو نوێژ خوێنە داوای لێ بکرێت بچێت بۆ چاو پێکەوتنی سەرۆکی ئەو شوێنەی کاری تێدا دەکات ئایا بەو جل و بەرگانەوە دەڕوات؟. بێگومان نەخێر!.

خوای گەورە هانی موسڵمانان دەدات بەوەی کاتێ کە دەچن بۆ مزگەوتەکان خۆیان بڕازێننەوە: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم لەکاتی هەموو نوێژێکدا بە خۆداپۆشین خۆتان بڕازێننەوەو خۆتان جوان بکەن، بخۆن و بخۆنەوە (لەوەی کە حەڵاڵە بۆتان) و زیادەڕەوی مەکەن.

بەڵکو پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَلْبَس ثَوْبَيْه فَإِنَّ اللهَ أَحَقُّ مَنْ تُزُيِّنَ لَهُ)[22]. واتە: ئەگەر یەکێك لەئێوە ویستی نوێژ بکات با هەردوو پۆشاکەکەی لەبەر بکات، چونکە خوای گەورە شیاوترە کە خۆی بۆ بڕازێنرێتەوە.

**٤- چوونەدەرەوە لەمزگەوت دوای بانگ:**

هەندێ کەس لە دوای بانگ یەکسەر لە مزگەوت دێنە دەرەوە، ئەمەش یەکێکە لە سەرپێچیە سەرزەنشت کراو و خراپەکان.

لە (أبي شعثاء)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: رۆژێ لە مزگەوت لای ئەبو هورەیرە دانیشتبووین، لەو کاتەدا کە بانگدەر بانگی دەدا پیاوێك لەناو مزگەوتەکە هەستاو رۆشتەدەرەوە، ئەبو هورەیرە چاوی تێبڕی تا لە مزگەوت چووەدەرەوە جا فەرمووی: (أَمَّا هَذَا

---

22- أخرجه الطبراني في الأوسط عن ابن عمر، صحيح الجامع: ٦٥٢ .

فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٢٣]. واته: بەڵێ ئەم پیاوە بەم دەرچوونەی لە فەرمانی باوکی قاسم صلی الله علیه وسلم دەرچوو.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی چوونەدەرەوە لە مزگەوت لە دوای بانگ کەراهەتی هەیە تاکو نوێژە فەرزەکە نەکرێت، مەگەر لەبەر عوزرێکی شەرعی. خوای پەروەردگاریش زاناترە[٢٤].

### ٥- تف رۆکردن لە مزگەوتدا:

هەندێ کەس تف رۆدەکەن لە مزگەوتدا لەکاتێکدا کە لە ماڵەکانی خۆیاندا هەرگیز کاری ناشیرینی لەو شێوە ناکەن.. (ولا حول ولا قوە إلا بالله).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ فَلَا يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلَا عَنْ يَمِينِهِ وَلَكِنْ عَنْ شِمَالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ)[٢٥]. واتە: ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەستا بۆ نوێژکردن با تف نەکاتە بەردەمی، چونکە لەو کاتەدا لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە، هەروەها نەیکاتە لای ڕاستی، بەڵکو با بەلای چەپدا تف بکات یان لەژێر پێیدا رۆی بکات.

ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قەدەغەکراوە تف و بەڵغەم رۆبکرێتە بەردەم و لای ڕاست، ئەمەش گشتییە بۆ مزگەوت و جگە لە مزگەوت، (وليبزقن تحت قدمه وعن يساره). واتە: با تف رۆبکات بەرەو لای چەپ یان ژێر پێی. ئەمە بۆ جگە لە مزگەوتە، بەڵام نوێژ خوێن لە مزگەوتدا دەبێت تفەکەی رۆبکاتە ناو چمکی کراسەکەی بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا)[٢٦]. واتە: گوناهە تف رۆکردن لە مزگەوتدا، کەفارەتی ئەو گوناهەش تەنها شاردنەوەیەتی.

### ٦- با لێ بەربوونەوە لە مزگەوتدا:

---

[23]- أخرجه مسلم عن أبي هريرة: ١٢٤/٢ (٦٥٥) (ح ٢٥٨ المساجد).

[24]- المجموع لإمام النووي: (٢/ ١٧٩).

[25]- أخرجه مسلم عن أنس: (٥/ ٥٥) (ح ٥٤ المساجد) .

[26]- أخرجه مسلم عن أنس: (٥/ ٥٦) (ح ٥٥ المساجد) .

یەکێکی تر لەو سەرپێچیانەی کە ناپەسەندە لە مزگەوتەکاندا بکرێت با لێ بەربوونەوەیە، چونکە دەبێتە هۆی ئازاردانی مەلائیکە و موسڵمانان.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رایگەیاندووەو فەرموویەتی: بەردەوام مەلائیکە سڵاوات لەسەر کەسێك لە ئێوە دەدەن بڕواتە مزگەوت بۆ نوێژکردن هەتا لە شوێنی نوێژەکەی بمێنێتەوە دەڵێن: (اللهم صل عليه اللهم ارحمه ما لم يؤذ فيه ما لم يحدث فيه)[٢٧]. واتە: خودایە لێی خۆش ببە، خودایە رەحمی پێ بکە، هەتا ئازاری کەس نەدات و روداو لێی روبدات، وتیان: هەتا ئازاری کەس نەدات و روداو لێی روبدات مانای چییە؟ فەرمووی: (يفسو أو يضرط). واتە: هەتا ترو تسی لێ دەرنەچێت.

هەروەها فەرمویەتی: (فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ)[٢٨]. واتە: هەرچی ئازاری ئادەمیزاد بدات ئازاری مەلائیکەش دەدات.

**٧- راگەیاندنی پرسە بە بڵندگۆی مزگەوتەکان:**

یەکێکی تر لە بیدعەی مزگەوتەکان کە لە نێوان بیدعەی حەرام و ناپەسەندایە ئەوەیە ئەگەر زانایەك وەفاتی کرد بانگبێژان ئایەتی سورەتی(الإنسان) بە دەنگی بەرز دەخوێننەوە و دەیدەن بە بڵندگۆی مزگەوتەکان: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ يَشْرَبُونَ مِن كَأْسٍ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ۝٥ ﴾ الإنسان: ٥.

هەروەها لە زۆربەی دێهاتەکاندا ئەگەر یەکێك مرد پرسەکەی بە بڵندگۆی مزگەوتەکان رادەگەیەنن و دەڵێن فلانی کوڕی فلان مردووە.. ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە، چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەم جۆرە شتانە دروست نەکراون.

وێنەی ئەمەش ئەوە بووە لەسەردەمی نەفامیدا لەناو کۆڵان و کوچەو بازاڕەکاندا هەواڵی پرسەیان رادەگەیاند.

خاوەنی کتێبی (سبل السلام) دەڵێ: لە راگەیاندنە قەدەغەکراوەکانە راگەیاندنی پرسەی

---

27- أخرجه مسلم: (٦٦١) والنسائي: (٢/٥٥).

28- أخرجه مسلم: (٥٦٤) وأحمد: (٣/٣٧٤).

زاناکان لەم سەردەمەدا لەمەنارەی مزگەوتەکانەوە[29].

**٨- خوێندنی سورەتی (الکهف) بۆ خەڵك لە رۆژی جومعەدا:**

بیدعەیە خوێندنی سورەتی کەهف بەدەنگی بەرز و ئاوازەوە لە رۆژی جومعەدا، لەکاتێکدا کە خەڵك لەرکوع و سەجدەدان یان خەریکی خواپەرستی و قورئان خوێندنن یا بیردەکەنەوە... نەزانی وا هەیە بەدەنگی بەرز بەدوایدا دەیڵێتەوە لە خۆشی دەنگی ئەو بەبێ ئەوەی گوێ بداتە رێزگرتنی قورئان و مزگەوت، هەروەها دەبێتە هۆی ژاوەژاو و ئازاردانی یەکتر، ئەمانەش هەموویان سەرزەنشت کراون و دروست نین[30].

**٩- گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵك سەبارەت بەدنیا:**

ئیسلام لە مزگەوتدا قسەی چاك و رەوای قەدەغەنەکردووە بەمەرجێ نەبێتە هۆی ژاوەژاو و ئازاردانی خواپەرستان، بەجۆرێك سەرقاڵ نەبن بەقسەکردنەوە پەرستش و نوێژەکانیان فەرامۆش بکەن.

سابت بووە لە هاوەڵانەوە رەزای خوایان لێ بێ کە لەمزگەوتدا دەربارەی سەردەمی نەفامی قسەیان کردووەو پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم گوێ بیستیان بووە.

لە (سماك کوڕی حرب)ەوە هاتووە دەفەرموێت: وتم بە جابری کوڕی سەمورە: ئایا تۆ ئامادەی دانیشتنەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەبوویت؟ وتی: بەڵێ، زۆر: (كَانَ لَا يَقُومُ مِنْ مُصَلَّاهُ الَّذِي يُصَلِّي فِيهِ الصُّبْحَ أَوْ الْغَدَاةَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَإِذَا طَلَعَتْ الشَّمْسُ قَامَ وَكَانُوا يَتَحَدَّثُونَ فَيَأْخُذُونَ فِي أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ فَيَضْحَكُونَ وَيَتَبَسَّمُ)[31]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو شوێنەی نوێژی بەیانی تێدا دەکرد هەڵنەئەسا هەتا خۆر دەرنەکەوتایە، کاتێك خۆر دەردەکەوت هەڵئەسا، دەفەرموێت: لەو ماوەیەدا قسەیان دەکرد دەربارەی سەردەمی نەفامی و زەردەخەنەیان دەکرد و پێدەکەنین.

---

29- الإبداع في مضار الابتداع- للشيخ علي محفوظ (ص: ١٦٥/١٦٦) بتصرف.

30- الإبداع في مضار الابتداع- للشيخ علي محفوظ (ص: ١٧٧).

31- اخرجه مسلم: (٦٧٠).

ئەمە بۆ ئەو قسانەیە کە نەبنە هۆی ژاوەژاو و ئازاردانی خەڵکانی تر و قەدەغەکردنیان لە هەستان بە راپەڕاندنی خواپەرستی و فەرمانەکانیان، واز لێ هێنانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەبەر پلە بە پلەی بانگەواز بوو.. خوای پەروەردگاریش زاناترە.

**فائیدەیەکی گرنگ:**

هەندێ کەس لە مزگەوتدا بە گشتی قسەکردن قەدەغەدەکەن لەبەر ئەم فەرمودە: (الكلام في المسجد يأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب)[32]. واتە: قسەکردن لە مزگەوتدا کردەوەی چاکە دەسوتێنێ وەك چۆن ئاگر داری وشك دەسوتێنێ.

ئەم فەرمودە هیچ بنەمایەکی نیە"وەك (الحافظ العراقي) دەڵێت: لە تەخریج)ی (الإحیاء)دا[33].

(تقی الدین السبکی) دەڵێ: ئەم فەرمودە هیچ سەنەدێکی نیە[34].[35].

**١٠- دەنگ بەرزکردنەوە لە مزگەوتدا:**

یەکێ لە سەرپێچیە ناپەسەندەکان قسەکردنە سەبارەت بە کاروباری دنیا لەمزگەوتدا چونکە هەندێ جار دەبێتە هۆی پێکەنین و دەنگ بەرزکردنەوەو چەپڵە لێدان و فیکەکردن، ئەمەش هەتك کردنی ماڵەکانی خوایە کە ئامادەی کردوون بۆ پەرستنی، هەروەها دەبێتە هۆی ئازاردانی نوێژخوێنان و رێگری لە خواناسان[36].

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەنگ بەرزکردنەوەی لەمزگەوتدا قەدەغەکردووە.

---

32- الإحياء: ١/ ١٣٦ فقال مخرجه الحافظ العراقي : لم أقف له على أصل.

33- الإحياء: (١/ ١٣٦).

34- طبقات الشافعية: (٤/ ١٤٥).

35- بتصرف من أخطاء المصلين/ محمد صديق المنشاوي (ص: ٢٢٩- ٢٣١).

36- الإبداع في مضار الابتداع (ص: ١٧٩).

لە ئەبی سەعیدی خودریەوە ڕەزای خوای لێ بێ ریوایەت کراوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئیعتیکافی کردبوو لە مزگەوتدا گوێی لێ بوو بە دەنگی بەرز قورئانیان دەخوێند، پەردەکەی لاداو فەرمووی: (أَلاَ إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ فَلاَ يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضًا وَلاَ يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ)[٣٧]. واتە: ئاگاداربن بەڕاستی ئێوە هەمووتان لە نوێژدا لەگەڵ پەروەردگاتان ئەدوێن، کەستان ئازاری کەستان مەدەن و کەستان دەنگ بەرز نەکاتەوە بە قورئان خوێندن بەسەر کەسدا.

ئەم قەدەغەکردنە بۆ قورئان خوێندن و یادی خوایە بە دەنگی بەرز ئەی دەبێت بۆ قسەی پڕوپوچی دنیایی و ژاوەژاو چۆن بێت؟!!.

## ١١- بانگەواز بۆ شتی ونبوو:

هەندێ کەس کاتێ شتێکیان لێ ون دەبێت خێرا ڕادەکەن بۆ مزگەوت و داوا دەکەن کە بانگەوازیان بۆ بکرێت لە بڵندگۆی مزگەوتەکانەوە.. ئەمەش هەڵەیە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ سَمِعَ رَجُلًا يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ: لَا رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْكَ فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا)[٣٨]. واتە: ئەگەر بەرگوێتان کەوت یەکێك لەمزگەوتدا بانگەوازی کرد بۆ شتی ونبوو، بڵێن: یاخوا نەیدۆزێتەوە چونکە مزگەوتەکان بۆ ئەمە دروست نەکراون.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ)[٣٩]. واتە: مزگەوت بۆ خواپەرستی دروستکراوە، نەك بۆ ئەم جۆرە شتانە.

ئیمام نەوەی دەڵێ: ئەم فەرمودە چەند سوودێکی لێ وەردەگیرێ:

---

[37]- أخرجه أبو داود: (١٢٠٣) وأحمد: (٩٤/٣) بسند صحيح.

[38]- أخرجه مسلم: (٥/ ٧٥) (ح ٧٩ المساجد).

[39]- أخرجه مسلم: ٨٢/٢ (٥٦٨) (٧٩) .

قەدەغەكردنی بانگەواز كردن بۆ شتی ونبوو، كڕین و فرۆشتن و بەكرێدان و گرێبەست و لەمزگەتدا، هەروەها قسەكردنیش بەدەنگی بەرز دەگرێتەوە.

فەرمودەی: (إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ). واتە: مزگەوت دروستكراوە بۆ یادی خواو نوێژ و زانست و زانیاری و گفتوگۆی چاك و هاوشێوەی ئەوانە.

**١٢- كڕین و فرۆشتن لە مزگەوتدا:**

هەندێ كەس لە مزگەوتدا كڕین و فرۆشتن دەكەن.. لەكاتێكدا كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قەدەغەیكردووە و دەفەرمووێت: (إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ، فَقُولُوا: لا أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ)[40]. واتە: ئەگەر دیتان كەسێك لەمزگەوتدا مامەڵە دەكات شت دەكڕێت یان شت دەفرۆشێت، بڵێن: یاخوا ئەم بازرگانیەت قازانج نەكات، ئەمە مزگەوتە خۆ بازاڕ نیە.

**١٣- درەخت رواندن لەناو مزگەوتدا:**

پێشەوا (الزركشی)دەڵێ: ناشتنی دارو درەخت و دارخورماو هەڵكەندنی بیر لەناو مزگەوتدا كەراهەتی هەیەو ناپەسەندە، چونكە لە كردەوەی پێشینە چاكەكان نیەو دەبێتە هۆی تەنگەلانی بۆ نوێژخوێنان[41].

**١٤- هەڵواسینی پڕوپاگەندەی بازرگانی لەمزگەوتدا:**

وەك پڕوپاگەندەی هاتوچۆی بازرگانی چوون بۆ حەج و عەمرە، یان هەڵواسینی پڕوپاگەندەی ئەنجامی نرخی هەندێ شمەكی بازرگانی بەتایبەتی ئەگەر حەرام بێت وەك جگەرەو مەیی و كۆمپانیای دابینكردن و بانقەكان و جگە لەوانیش، ئەمانەش هەموویان سەرپێچین و ناگونجێن لەگەڵ رێز و گەورەیی مزگەوتدا.

**١٥- خوێندنەوەی هۆنراوەی حەرام:**

لە ئیبن عەمرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە دەفەرمووێت: (إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنِ الشِّرَاءِ وَالْبَيْعِ فِي الْمَسْجِدِ، وَأَنْ تُنْشَدَ فِيهِ ضَالَّةٌ؛ أَوْ يُنْشَدَ فِيهِ شِعْرٌ...)[42]. واتە: پێغەمبەری

---

40- أخرجه الترمذي: (١/ ٢٤٨) (١٣٢١) والحاكم: ٢/ ٥٦ بسند صحيح عن أبي هريرة.

41- مختصر من إعلام الساجد بأحكام المساجد (ص ٣٤٢).

42- أخرجه أحمد وأبو داود: (١٠٧٩) عن ابن عمرو- صحيح الجامع: (٦٨٨٥).

خوا صلى الله عليه وسلم ئەم شتانەی قەدەغەکردووە لەمزگەوتدا: کڕین و فرۆشتن، بانگەواز بۆ شتی ونبوو، خوێندنەوەی هۆنراوە.

بێگومان خوێندنەوەی هۆنراوەی حەڵاڵ وەك مەدحی ئیسلام و هاندان بۆ جیهاد و تێکۆشان و باسی رەوشتە بەرزەکان دروستەو هیچ شتێکی تێدا نیە، بەمەرجێك زێدەڕۆیی تێدا نەکرێت و نەبێتە رێگر لەبەردەم قورئان خوێندن و تێکدانی نوێژی نوێژخوێنان.

لە ئەبی هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: عومەر رەزای خوای لێ بێ بەلای (حسان)دا تێپەڕی لە مزگەوتدا هۆنراوەی دەخوێندەوە، بە مۆڕەوە سەیرێکی کرد حەسان وتی: لەکاتێکدا شیعرم دەخوێندەوە ئەو کەسەی تێدا بوو کە لەتۆ چاکترە، پاشان رووی کردە ئەبو هورەیرەو وتی: سوێندت دەدەم بە خوا تۆ پێم بڵێ گوێت لە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم نەبووە دەیفەرموو:

(أَجِبْ عَنِّي اللَّهُمَّ أَيِّدْهُ بِرُوحِ الْقُدُسِ)[43]. واتە: لەجیاتی من وەڵام بدەرەوەو دوعای بۆ دەکردم و دەیفەرموو: (خوایە جوبرەئیل بکە بەپاڵ پشتی). ئەویش وتی: بەڵێ: گوێم لێ بووە.

**١٦- دانانی سەکۆ لەمزگەوتدا:**

یەکێکی تر لە بیدعە سەرزەنشت کراوەکان دانانی سەکۆیە لەمزگەوتدا بۆ بانگبێژان و گەیەنەران و ئەوانەی سورەتی کەهف دەخوێننەوە لە رۆژی جومعەدا، هەروەها ئەو کورسیەی کە لە زۆربەی مزگەوتەکاندا دادەنرێت بۆ ئەومەبەستە.

**١٧- رازاندنەوەی مزگەوتەکان بە گڵۆپ و گوڵ گوڵزار لە بۆنەکاندا:**

ئەم کارە لە رێبازی پیاوچاکانی پێشین نیە، بەرز ڕاگرتنی ماڵەکانی خوا بە خواپەرستی و زیکر و یادی خوا دەبێت، نەك بە زۆری زەخرەفەو گڵۆپی رەنگاو رەنگ.. بەڵکو ئەم کارە موسڵمان دەچوێنێ بە کافران کە لەناو کەنیسەو پەرستگاکانیاندا ئەم جۆرە کارانەیان دەکرد، بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم خۆچواندنی بە کافران قەدەغەکردووە.

---

43- أخرجه البخاري: (١/ ٥٤٨) وأحمد(٢/ ٢٢٢) والنسائي: (٢/ ٤٨).

**١٨- زۆری مزگەوت لە گەڕەکێکدا:**

ئیمام (سیوطي) لە کتێبی (الأمر بالاتباع والنهی عن الابتداع)دا دەڵێ: یەکێکی تر لە بیدعەکان زۆری مزگەوتە لە گەڕەکێکدا، ئەمەش دەبێتە هۆی نەمانی یەك ریزی و جیاوازی نوێژخوێنان و رەونەق و جوانی خواناسان پێکەوەو زۆربوونی رای جیاوازو نەمانی یەك هەڵوێستی و دژی حیکمەتی مەشروعیەتی نوێژی جەماعەتە، واتە دژی یەکدەنگیە لەسەر ئەنجامدانی پەرستشەکان، ئەمەو جگە لەوەی ئەگەر ئەو مزگەوتانە بۆ ناوبانگ و شوهرەت بکرێنەوە دەبنە هۆی بەفیڕۆدانی سامانی موسڵمانان کە پێویست نیەو باشتر وایە لە پرۆژەی خێرخوازی تردا بەکار بهێنرێت.

**١٩- بەکارهێنانی کەل و پەلی مزگەوتەکان لە شوێنەکانی تردا:**

هەروەها لەوانەی وا پەیوەندیان بە مزگەوتەوە هەیە: هەندێ کەس کەل و پەلی مزگەوتەکان وەك گسك و ئەو پانکانەی دەگوێزرێنەوەو هەندێ جار مایکرۆفۆن و بڵندگۆکان دەبەن بۆ شوێنەکانی تر لە بۆنەو ئاهەنگە گشتیەکاندا بەکاریان دەهێنن.

پێشەوا (ابن نحاس) دەڵێ: لەوانە بردنی وەقف کراوەکانی مزگەوتە بۆ گوێزەبانە و ئاهەنگی خۆشی و شادی، کە ئەمەش دروست نیە[٤٤]، چونکە وەقف کراون بۆ مزگەوتەکان.

**٢٠- بەکارهێنانی کاتژمێری گەورە بۆ جەرەس لێدان:**

شێخ ئەلبانی دەڵێ: یەکێکی تر لە سەرپێچیەکان: دانانی کاتژمێری گەورەیە بۆ جەرەس لێدان کە لەسەری سەعاتدا زەنگ لێ دەدەن وەك زەنگ لێدانی گاورەکان[٤٥].

**٢١- مزگەوت کردن بەڕێگا:**

هەروەها یەکێکی تر لە سەرپێچیەکان ئەوەیە یەکێك لە ئێمە مزگەوت دەکات بە ڕێگا بۆ تێپەڕبوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر.. بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمەی قەدەغەیکردووە دەفەرموێت: (لا تَتَّخِذُوا الْمَسَاجِدَ طُرُقًا إِلا لِذِكْرٍ أَوْ صَلاةٍ)[٤٦]. واتە: مزگەوتەکان مەکەن بە ڕێگا، ئیللا بۆ نوێژکردن و زیکرو یادی خوا نەبێت.

---

[44]- تنبيه الغافلين لإبن نحاس: (ص: ٢٦٧) .

[45]- حجاب المرأة المسلمة للألباني: (ص ٨٣-٨٤).

[46]- رواه الطبراني في الكبير عن ابن عمر، صحيح الجامع: (٧٢١٥).

### ٢٢- تێکەڵاوی پیاوان و ئافرەتان لەمزگەوتدا:

یەکێکی تر لەو بەڵایانەی رووی کردۆتە موسڵمانان ئەوەیە.. هەندێ کەس ماڵ و سامانی زۆریان هەیە ئەگەر بیانەوێت ئاهەنگی خۆشی و شادی بگێڕن لە یانەو میواخانەکاندا ئاهەنگ ناگێڕن لەبەر ئەوەی زۆری تێ دەچێت، دەڵێن: لەمزگەوتەکاندا ئاهەنگ دەگێڕین - نیەت و مەبەستیان زیندوکردنەوەی سوننەت نیە، ئەگەر نیەتیان سوننەت بوایە بە واجب هەڵنەسان پێش ئەوەی هەستن بەزیندوکردنەوەی سوننەت، ئەویش بەوەی کە خێزان و کچەکانیان پابەند دەبوون بە پۆشاکی شەرعیەوە، ئەمەش دەبێتە هۆی تێکەڵاو کردنی پیاوان و ئافرەتان و وروژاندنی غەریزەی جنسی گەنج و لاوەکان و روودانی فیتنە، بەڵکو کار دەگاتە ئەو رادەیەش بە کامێرای ڤیدیۆ وێنەی ئاهەنگەکە دەگیرێ هەندێ جاریش گۆرانی و مۆسیقای حەرامی تێدا بەکار دەهێنرێت...(فإنا لله وإنا إليه راجعون).

### ٢٣- قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لەمزگەوتدا:

ئەوەی کاریگەری هەیە بۆسەر ئەوانەی کە لەمزگەوتدا نوێژ دەکەن قورئان خوێندنە بە دەنگی بەرز... ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەوانە لەگەڵ پەروەردگاریان موناجات دەکەن و دەپاڕێنەوە بۆیە نابێت بە هیچ شێوەیەك کەس دەنگی بەرزکاتەوە بەسەر کەسدا.

### ٢٤- داخستنی مزگەوتەکان لەدوای نوێژ بەبێ هۆیەکی پێویست:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ وَسَعَىٰ فِى خَرَابِهَآ ﴿١١٤﴾ ﴾ البقرة: ١١٤.

واتە: کێ ستەمکار ترە لەو کەسەی کە قەدەغەی مزگەوتانی خوا دەکات لەوەی کە ناوی خوایان تێدا ببرێت، وە هەوڵ دەدات بۆ وێران کردنیان.

مزگەوتەکان وەك چۆن بە روخاندن دەبنە وێرانە بەهەمان شێوە بە قەدەغەکردنی نوێژخوێنان و خواپەرستان لە چوونە ناوی دەبنە وێرانە.

یەکێکی تر لەو بیدعانەی کە گومانی تێدا نیە حەرامە داخستنی زۆربەی مزگەوتەکانە لەهەموو کاتەکاندا جگە لەکاتی یەکەمی نوێژ، هەندێ جار ئەمە دەبێتە هۆی فەوتانی

نوێژی ئەو کەسانەی بۆیان ئاسان نیە لە یەکەم کاتی نوێژدا ئامادەبن. شاراوە نیە ئەمەش ڕێگرتنە لە دینی خوا و هەوڵدانە بۆ وێران کردنیان و قەدەغەکردنی سەردانی ماڵەکانی خوایە.

(بەڵێ) داخستنی مزگەوت ڕەوایە بێجگە لە یەکەم کاتی نوێژ لەترسی گاڵتەکردن بە مزگەوتەکان، وەك چوونە ژوورەوەی منداڵ و ئاژەڵان و ئەنجامدانی کاری خراپە، یان لەبەر ئەوەی ئامێر و کەل و پەلەکانی نەدزرێن، بەڵام بەمەرجێك ڕێ نەگیرێت لە قوتابیانی قورئان و وتنەوەی وانەی شەرعی و ئەو کەسەی کە ئیعتیکافی تێدا دەکات، ئەگەر ڕێ لەوانە بگیرێت ئەوا داخستنی مزگەوت حەرامە با ترسی گاڵتەکردن و دزینی ئامێر و کەل و پەلەکانیش هەبێت، (بەڵێ) ئەگەر دڵنیابوون لە یەکێك لەو دووکارە ئەوە دروستە داخستنی چونکە نەهێشتنی زەرەر و زیانەکان لە پێش بەدەسهێنانی بەرژەوەندیەکانەوەیە[٤٧].

## ٢٥- ڕێگرتن لە قوتابیانی قورئان و خوێندنی زانستی شەرعی:

ئەم بیدعەیەش لە ئەنجامی بیدعەکەی پێشووەوە دروست دەبێت ئەویش دەرکردنی نوێژخوێنان و قوتابیانی زانستی شەرعیە لەدوای نوێژی عیشاوە، قەدەغەکردنیانە لە فێربوونی زانست و زانیاری، کوژاندنەوەی پانکەو گڵۆپەکان لەبەر ئەوەیە خێرا نوێژ بکەن و مزگەوت دابخەن، بێگومان سونەتە هەموو کاتێك مزگەوتەکان کراوە بن، چونکە لەسەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و خەلیفە ڕاشدینەکاندا ڕەزای خوایان لێ بێ بەو شێوەیە بووە.

## ٢٦- دانانی میحراب و ڕازاندنەوەی:

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکانی شەرع، چونکە سابت نەبووە کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانیان میحرابیان دانابێت لەمزگەوتدا.. بەڵکو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە دەفەرموێت: (اتَّقُوا هَذِهِ الْمَذَابِحَ. يَعْنِي الْمَحَارِيبَ.)[٤٨].
واتە: بترسن لەو میحرابانە.

---

[47]- الإبداع في مضار الابتداع (ص: ١٦٥).

[48]- رواه الطبراني في والبيهقي عن ابن عمرو- صحيح الجامع: (١٢٠).

ئەوەی زیاتر ناپەسەندە رازاندنەوەی ئەو میحرابانەیە چونکە نوێژخوێنان سەرقاڵ دەکەن و خشوع لە دڵیاندا نامێنێت، مزگەوتەکان هیچ پێویستیان بەو میحرابانە نیە، بەڵکو با ئەو ماڵ و سامانە بدرێت بە هەتیوی موسڵمانان و لە برسێتی رزگاریان بێت.

**٢٧- بەرزکردنەوەی مینبەری مزگەوتەکان:**

ئەو مینبەرە شەرعیەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵە بەڕێزەکانی وتاریان لەسەر دەدا لە دوو پلە و جێگەی حەوانەوەیەك زیاتر نەبوو، ئەمەش نابێتە هۆی پچڕانی ڕیزەکان، ئامادەبوانیش بە ئاسانی وتاربێژ دەبینن. بەڵام بەرزکردنەوەی دەبێتە هۆی دیارنەمانی وتاربێژ بە تایبەتی هەندێ نەزان پەرچەمیشی بۆ دەکەن و دیواری مینبەرەکە بەرزدەکردنەوە و گومەزی لەسەر دادەنێن، هەروەها درێژکردنەوەی دەبێتە هۆی پچڕانی ڕیزێك یان دوو ڕیز لەکاتی نوێژکردندا، ئەمەو جگە لەوەی کە ئیسرافەو بەفیڕۆدانی سامانە لە دروستکردنیدا، لەکاتێکدا کە موسڵمانان پێویستیان بەو ماڵ و سامانە هەیە[49].

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ)[50]. واتە: هەرکەس ریزێك بگەیەنێت خوا دەیگەیەنێت بە روحمی خۆی، هەر کەسیش ریزێك بپچڕێنێت خوا لە روحمی خۆی دەیپچڕێنێت.

**٢٨- خوێندنی هەندێك ئایەت و سورەت لەنێوان بانگ و قامەتدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە بیدعە حەرامەکان، هیچ سەنەد و بنەمایەکی نیە، بەو کارەش دەبنە هۆی تەشویش دروستکردن بۆ نوێژخوێنان ئەوانەی لەوکاتەدا خەریکی ئەنجامدانی سوننەتی راتبەن، وەك لەپێشەوە ئاگادارمان کردنەوە دەبێتە هۆی لەدەستدان و نەمانی بەهاو جوانی خشوع، ئەمەش هەمان بەڵگە دەیگرێتەوە کە لەپێشەوە باسکرا سەبارەت قورئان خوێندنی پێش نوێژی جومعە[51].

**٢٩- دروستکردن و بەرزکردنەوەی مەنارەکان:**

بێگومان دروستکردن و بەرزکردنەوەیان بەتایبەتی ئەگەر ژمارەیان زۆر بێت لە

---

[49]- السنة والبدعة/ د. فؤاد مخيمر (١/: ١٠٠).

[50]- رواه النسائي والحاكم، صحيح الجامع: ٦٥٩٠.

[51]- السنة والبدعة/ د. فؤاد مخيمر: (١/ ١٠١- ١٠٣).

مزگەوتێکدا دەبێتە هۆی ئیسراف.... لەکاتێکدا کە هەژارە موسڵمانەکان پێویستیان بەو ماڵ و سامانە هەیە، ئەمەو جگە لەوەش لە سوننەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم هیچ بنەمایەکی نیە، وە لەلای هاوەڵانیشی ڕەزای خوایان لێ بێ.

موسڵمانانی ئەم سەردەمە زۆر گرنگی دەدەن بە دروستکردن و بەرزکردنەوەی مەنارەکان، بەڵکو جاری واش هەیە خەرجیەکەی چەندەی تێ چوو لەسەر یەك کەسە، مەبەستیان لەمە بەرزکردنەوەی وشەی خوا و، دەرخستنی مزگەوتەکانە، لەگەڵ ئەم نیەتەشدا هەر کەراهەتی هەیە و شتێکی ناپەسەندە چونکە لەسەردەمی زێڕینی ئیسلامدا شتی وەها نەبووە- تەنها خواش ئاگاداری نیەت و مەبەستەکانە[52].

### ٣٠- سوالکردن لە مزگەوتەکاندا:

بێگومان سوالکردن لەهەموو شوێنێك کارێکی دزێو و ناشیرینە چ جای لە ماڵەکانی خوای گەورەدا.

### ٣١- جگەرەکێشان لەسەرئاو:

لەگەڵ ئەوەدا کە جگەرەکێشان لەهەموو کات و شوێنێکدا حەرامە، بەڵام لە ماڵەکانی خوادا زیاتر حەرامە.

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان کاتێ دەچنە سەرئاو جگەرە دادەگرسێنن و دەیکەن بە چەڕە دوکەڵ، بەڵکو هەندێکیان کاتێك دەچنە مزگەوتەوە جگەرەکەیان هەر بەدەمەوەیە هەتا دەگەنە جێگای نوێژکردنەکەیان ئەو کاتە دەیکوژێننەوە، جا یەکسەر دەچنە ناو نوێژەوە، ئازاری برا نوێژخوێنەکانیان دەدەن بە بۆنی ناخۆشی ئەو دوکەڵە.

---

[52]- السنة والبدعة/ د. فؤاد مخيمر.

## ئەو سەرپێچیانەی تایبەتن بە شوێنی نوێژکردنەوە

### ١- رازاندنەوەی مزگەوتەکان:

سوننەت لە دروستکردنی مزگەوتەکاندا: میانەڕەوی و زێدەڕۆیی نەکردنە.

ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ دەفەرموێت: (لَتُزَخْرِفُنَّهَا كَمَا زَخْرَفَتْ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى)[٥٣]. واتە: بە تەئکید ئێوە دەیان رازێننەوە وەك چۆن جولەکەو گاورەکان رازاندیانەوە.

لەمەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە عیللەتی قەدەغەکردنی لەبەر ئەوەیە نەبێتە هۆی فیتنە بۆ نوێژخوێنان و سەرقاڵ نەبن بە سەیرکردنەوە و خشوعیان لەدەست نەچێت، عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ لەکاتێکدا فەرمانی کرد بە نۆژەن کردنەوەی مزگەوتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (أَكِنَّ النَّاسَ مِنْ الْمَطَرِ وَإِيَّاكَ أَنْ تُحَمِّرَ أَوْ تُصَفِّرَ فَتَفْتِنَ النَّاسَ)[٥٤]. واتە: بەهەر شێوەیەك بێت خەڵك لەباران بپارێزێت نەکەن سورو زەردی بکەن و خەڵك بێ ئاگا بکەن.

هەروەها زەخرەفەی مزگەوتەکان هۆکاری ریایی و شانازیکردنە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ)[٥٥]. واتە: قیامەت هەڵناسێ تاکو خەڵك گرنگیەکی زۆر دەدەن بە رازاندنەوەی مزگەوتەکان و شانازی پێوە دەکەن.

### ٢- گۆڕستان کردن بە مزگەوت:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ)[٥٦]. واتە: نەفرینی خوا لە جولەکەو گاورەکان بێت گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردووە بە مزگەوت و شوێنی نوێژکردن.

---

[53]– أخرجه البخاري مع الفتح: (١/ ٥٣٩) موقوفا على ابن عباس.

[54]– أخرجه البخاري مع الفتح: (١/ ٥٣٩) موقوفا على عمر.

[55]– رواه أحمد وابن حبان عن أنس– صحيح الجامع: (٧٤٢١).

[56]– أخرجه البخاري: (٣/ ١٥٦) ومسلم: (٢/ ٦٧).

هەر چوار مەزهەبەکە یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە گۆڕستان کردن بە مزگەوت حەرامە[٥٧].

حوکمی نوێژکردن لەو مزگەوتانەی کە گۆڕیان تێدایە:

زانایان دەڵێن: ئەگەر پیاو بچێتە ئەو مزگەوتانە نوێژ بکات بەنیەتی تەبەڕوك بە گۆڕەکەو خاوەنەکەی وە داوای کۆمەکی و یارمەتیان لێ بکات ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە کە نوێژەکەی بەتاڵە.

بەڵام ئەگەر تەنها بۆ نوێژکردن بچێت: ئەوە جمهوری زانایان رایان وایە کەراهەتی هەیە نوێژکردن لەو مزگەوتانەدا، چونکە ئەوە خۆچواندنە بە جولەکەو گاورەکان، هەروەها ئەوە دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو بەرزڕاگرتنی گۆڕ و کەوتنە ناو شەریك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردان.

پێشەوایان ئیبن تەیمیە و ئیبن قەیم رایان وایە نوێژکردن لەو جۆرە مزگەوتانەدا بەتاڵە. شێخ ئەلبانیش رەئی وایە کەراهەتی هەیە بەڵام نوێژەکە بەتاڵ نابێتەوە، خوای پەروەردگاریش زاناترە.

**٢- نوێژکردن لەو جێگایەنەدا کە وێنەیان لەسەرە:**

لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بەرگێکی رەنگاو رەنگدا نوێژی دەکرد، کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە فەرمووی: (اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي)[٥٨]. واتە: ئەم بەرگە بەرنەوە بۆ ئەبو جوهم و، بەرگێکی سادە بۆ من بهێنن، چونکە خەیاڵی بردم لە نوێژدا.

(الطيبي) دەڵێ: کاتێ ئەو وێنانەو شتە دیارەکان کاریگەریان دەبێت بۆ دڵ و دەروونی پاك و بێگەرد، کەواتە بۆ کەسانی خاوەن دڵی ئاسایی چۆن نابێت

زانایان رایان وایە نوێژکردن لە جێگایەکدا وێنەی لەسەر بێت کەراهەتی هەیە چونکە نوێژخوێن بەسەیرکردنی وێنەکان خەیاڵی دەڕوات و خشوعەکەی نامێنێ لەکاتێکدا کە خشوع بەشێکە لە تەواوی نوێژ.

---

[57]- تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد للألباني (ص ٣٣).

[58]- اخرجه البخاري: (٣٧٣) ومسلم: (٥٥٦).

### ٤- نوێژکردن له مۆڵگەی وشتردا:

نوێژکردن له مۆڵگەی وشتردا که چواردەوری ئاو بێت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم به ئاشکرا قەدەغەیکردووە دەفەرموێت: (صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ وَلَا تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الْإِبِلِ)[٥٩]. واته: لەمۆڵگەی مەڕدا نوێژ بکەن بەڵام لەمۆڵگەی وشتردا نوێژ مەکەن.

ئەم فەرمودە بەڵگەیه لەسەر ئەوەی نوێژکردن لەمۆڵگەی مەڕدا دروستە، هەروەها لەمۆڵگەی وشتردا حەرامە، ئەمەش رای ئیمام ئەحمەدە که دەڵێ: بەهیچ شێوەیەك نوێژکردن لەمۆڵگەی وشتردا دروست نیە، وه دەڵێ: ئەوەی لەمۆڵگەی وشتردا نوێژ بکات هەردەبێ نوێژەکەی بگێڕێتەوە.

له ئیمام مالیکیان پرسی ئەگەر بێجگە لەمۆڵگەی وشتر شوێنی تر دەسنەکەوت دروستە نوێژی تێدا بکرێت؟ فەرمووی: نەخێر، نوێژی تێدا مەکەن. وتیان: ئەی ئەگەر قوماشێك رابخەین و نوێژی لەسەر بکەین دروستە؟ فەرمووی: نەخێر. ئیبن حەزم دەڵێ: نوێژکردن لەمۆڵگەی وشتردا دروست نیه[٦٠].

### ٥- نوێژکردن له جێگایەکدا که خەڵکەکەی ستەمکاربوبن و خوا لەناوی بردبن:

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (لَا تَدْخُلُوا عَلَى هَؤُلَاءِ الْمُعَذَّبِينَ إِلَّا أَنْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَإِنْ لَمْ تَكُونُوا بَاكِينَ فَلَا تَدْخُلُوا عَلَيْهِمْ لَا يُصِيبُكُمْ مَا أَصَابَهُمْ)[٦١].

واته: مەچنە ناو ئەو سزادراوانەوە بەگریانەوە نەبێت، جا ئەگەر گریانتان نەهات مەچنە سەریان با ئێوەش تووشی ئەوە نەبن که ئەوان تووشی بوون.

له (عبداللە)ی کوڕی (أبي المُحلّ)ەوە هاتووە، که وتویەتی: جارێ ئێمە لەگەڵ ئیمام عەلی دامان بەلای سزادراوانی بابلدا نوێژی نەکرد هەتا تێپەڕین.. له رێگایەکی ترەوە هاتووە که ئیمام عەلی سێ جار فەرمووی: (مَا كُنْت لِأُصَلِّيَ فِي أَرْض خَسَفَ اللَّهُ بِهَا). واته: من له جێگایەکدا نوێژ ناکەم خەڵکەکەی ستەمکاربوبن و خوا بەستەمەکەی خۆیان لەناوی بردبن و سزای دابن.

---

[59]- أخرجه الترمذي: (٣٤٨) عن أبي هريرة – صحيح الجامع (٣٧٨٧).

[60]- نيل الأوطار للإمام الشوكاني: ٢/١٦٠ طبع دار الحديث.

[61]- أخرجه البخاري عن ابن عمر: (٤٣٣).

ئیبن حەجەر دەڵێ: ئەم فەرمودە هاندانە لەسەر چاودێری و قەدەغەکردنی نوێژکردن لە جێگایەکدا کە خەڵکەکەی ستەمکاربوبن و خوا بەستەمەکەی خۆیان لەناوی بردبن و سزای دابن[62].

### ٦- نوێژکردن لە زەوی زەوتکراودا:

شەرع زانان یەك دەنگ و کۆن لەسەر ئەوەی نوێژکردن حەرامە لە زەوی زەوتکراودا، چونکە مانەوە لەسەر زەوی زەوتکراودا بۆ غەیری نوێژ حەرامە، کەواتە بۆ نوێژکردن لەپێش ترە کە حەرام بێت، بۆ دروستی و وەرگیرانی نوێژەکە رای جیاواز هەیە، جمهوری زانایان و شەرع زانان رایان وایە دروستە و وەرگیراوە و فەرزەکەی لەسەر لادەچێ، ئەمەش وتەی شافیعیەکان و مالیکیەکان و حەنەفیەکانە[63].

بەڵام حەنبەلیەکان لەڕای مەشهوریاندا لایان وایە نوێژەکەیان دروست نیەو وەرناگیرێ[64].

### ٧- نوێژکردن لە گۆڕستان و گەرماودا:

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا الْمَقْبَرَةَ وَالْحَمَّامَ)[65]. واتە: زەوی هەمووی مزگەوتەو نوێژی تێدا دەکرێت جگە لە گۆڕستان و گەرماو.

ئیبن حەزم دەڵێ: ئەو فەرمودانەی قەدەغەی نوێژ دەکەن لە گۆڕستان و گەرماودا فەرمودەی موتەواتیرن بۆ کەس نیە تەرکیان بکات.

---

62- فتح الباري: (١/٦٣١- ٦٣٢).

63- المجموع: (٣/ ١٦٤).

64- المغني: (٢/ ٧٤).

65- رواه أحمد وأبو داود والترمذي عن أبي سعيد- صحيح الجامع: (٢٧٦٧).

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژکردن لە گۆڕستان و گەرماودا قەدەغەیە، بەڵام خەڵك لەمەدا رایان جیاوازە، ئیمام ئەحمەد رای وایە نوێژکردن لە گۆڕستاندا حەرامە، جا ئیتر جیاوازی دانەناوە لەنێوان ئەو گۆڕانەدا کە هەڵدرابنەوە یان هەڵنەدرابنەوە، یا شتێکی لەسەر راخرابێت یان نا، وە هەروەها نوێژەکە لەسەر گۆڕەکە بێت یان لەژوورێکی جیاواز لەناو گۆڕەکاندا ئەمە رای زاهیریەکانیشە، جیاوازیش ناکەن لەنێوان گۆڕستانی موسڵمانان و کافراندا"[66].

ئیمام شافیعی دەڵێ: جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو گۆڕانەی کە هەڵدرابنەوە یان هەڵنەدرابنەوە، دەڵێ: ئەگەر ئێسك و خوێن و کێم و جەراعەتی مردووەکانی تێکەڵاو بوو ئەوا دروست نیە نوێژی تێدا بکرێت لەبەر پیسیەکەی، بەڵام ئەگەر شوێنەکە پاك بوو کەسێك نوێژی تێدا کرد ئەوە نوێژەکەی دروستە.

پێشەوایان (ثوري)و ئەوزاعی و ئەبو حەنیفە رایان وایە نوێژکردن لە گۆڕستاندا کەراهەتی هەیە، ئەمانە جیاوازی ناکەن لەنێوان ئەو گۆڕانەدا کە هەڵدرابنەوە یان هەڵنەدرابنەوە وەك ئیمام شافیعی.

ئیمام ئەحمەد رای وایە نوێژکردن لە گەرماودا دروست نیە، ئەوەی لە گەرماودا نوێژ بکات هەردەبێ نوێژەکەی بگێڕێتەوە.

حیکمەتی قەدەغەکردنی نوێژ لە گۆڕستاندا ئەوەیە دەڵێن: ژێری جێگا نوێژەکە پیسی تێدایە. هەروەها دەڵێن: بۆ رێزگرتنە لەمردووەکان .... حیکمەتی قەدەغەکردنی نوێژ لە گەرماودا ئەوەیە پیسی زۆری تێدایە. وە دەڵێن: شوێن و ماوای شەیتانە.

---

66- نیل الأوطار: (٢/١٥٥).

## سەرپێچی لە کاتەکانی نوێژدا

**١- وتەی نوێژی مەغریب کاتەکەی درێژدەکرێتەوە هەتا عیشا:**

زۆربەی نوێژخوێنان وا دەزانن نوێژی مەغریب کاتەکەی درێژدەکرێتەوە بۆ نوێژی عیشا. ئەمەش هەڵەیە، چونکە یەکەم کاتی نوێژی مەغریب ئەوەیە کە خۆر ئاوا دەبێت دوایین کاتیشی تا سوورایی خۆر دەمێنێ هەر بەردەوامە، بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: (وَوَقْتُ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ مَا لَمْ يَغِبْ الشَّفَقُ)[٦٧]. واتە: کاتی نوێژی مەغریب لەرۆژئاوا بوونەوەیە هەتا شەفەق سوورایی ئاسمان ون نەبێ.

لە ریوایەتی بەیهەقیدا: (وقت صلاة المغرب إذا غابت الشمس ما لم يسقط الشفق)[٦٨]. واتە: کاتی نوێژی مەغریب لەرۆژئاوا بوونەوەیە هەتا سوورایی ئاسمان نامێنێ.

**٢- وتەی نوێژی عیشا درێژ دەبێتەوە هەتا بەرەبەیان:**

زۆربەی نوێژخوێنان پێیان وایە نوێژی عیشا کاتەکەی درێژدەبێتەوە هەتا نوێژی بەیانی، بۆیە دەبینین زۆربەیان نوێژ دوادەخەن تا ئەو کاتەی خۆیان بە گونجاوی دەزانن.

ئەم فەرمودەیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان: (أَمَا إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْرِيطُ عَلَى مَنْ لَمْ يُصَلِّ الصَّلَاةَ حَتَّى يَجِيءَ وَقْتُ الصَّلَاةِ الْأُخْرَى)[٦٩]. واتە: لە خەودا درێغی نیە، بەڵکو درێغی کردن لەوەدایە کە یەکێك نوێژ نەکات هەتا کاتی نوێژێکی تر دێت.

شێخ ئەلبانی لە (تمام المنة)دا دەڵێ: ئەم فەرمودە نابێتە بەڵگەی ئەوە کە کاتی نوێژی عیشا درێژدەبێتەوە هەتا بەربەیان، چونکە کاتەکانی نوێژ دیاری ناکات، بەڵکو ئەوە ڕووندەکاتەوە هەر کەسێك نوێژ دوادەخات بە قەستی هەتا کاتی (مطلقاً) ڕەهای نامێنێ پێی گوناهبار دەبێ، ئیتر یەکسانە نوێژی تر بەدوایدا بێت وەك نوێژی عەسر لەگەڵ شێوان یان نا.

---

67– أخرجه مسلم: (٦١٢)وأحمد والنسائي عن ابن عمرو– صحيح الجامع: (٧١١٥).

68– تحذير الساجد من اتخاذ القبور مساجد للألباني (ص ٣٣).

69– أخرجه مسلم عن أبي قتادة: ٦٨١.

ئیبن حەزم لە کتێبی (المحلى: ٣/ ١٧٨)دا دەڵێ: ئەمەی کە دەڵێن نوێژی عیشا درێژدەبێتەوە هەتا بەرەبەیان ئەم فەرمووده هەرگیز نابێتە بەڵگە، چونکە ئەوان کۆن لەگەڵمان لەسەر ئەوەی کاتی نوێژی بەیانی درێژنابێتەوە هەتا نیوەڕۆ، کەواتە ئەم فەرمووده بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کاتی هەموو نوێژێك درێژدەبێتەوە هەتا کاتی نوێژی دوای خۆی، بەڵکو تەنها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەسێك نوێژ دواخات هەتا نوێژێکی تر دێتە پێشەوە پێی گوناهبار دەبێ، ئیتر یەکسانە بگات بەدوا کاتی ئەو نوێژەدا یان نەگات، ئەوەش ناگەیەنێت ئەگەر کەسێك نوێژ دواخات هەتا دواکاتی زێدەڕۆیی نەکردووە مادەم کاتی نوێژی دوای ئەو نەهاتبێت یان زێدەڕۆیی کردووە، بەڵکو لەم هەواڵەدا لێی بێدەنگ بووە، لە شوێنەکانی تردا نەمانی کاتی هەموو نوێژێکی بەدەق روون کردۆتەوە، زەرورەت ئەوە واجب دەکات هەر کەسێك لەو سنوورە دەربچێت کە خوا دیاریکردووە بۆ هەر کارێك ئەوە ستەمکارە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ ﴾ البقرة: ٢٢٩. واتە: هەر کەسێك لە سنووری خوا دەربچێت، ئائەوانە ستەمکارن.

بەڕاستی سابت بووە کە فەرموودەکە بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی نوێژی عیشا درێژدەبێتەوە هەتا بەرەبەیان، بۆیە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ئەو فەرمودانەی تر کە بە ئاشکرا کاتی نوێژی عیشایان دیاریکردووە بۆ نمونە وەك ئەم فەرموودە: (وَوَقْتُ صَلاَةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ الأَوْسَطِ)[٧٠]. واتە: کاتی نوێژی عیشا درێژدەبێتەوە هەتا کاتی یەکەمی نیوەی شەو.

نامەکەی عومەری کوڕی خەتاب کە ناردی بۆ ئەبی موسای ئەشعەری رەزای خوایان لێ بێ پاڵپشتی ئەم رایە دەکات: (... ئەگەر نوێژی عیشات کرد ئاگاداربە لە سەرەتای سێیەکی شەودا ئەنجامی بدە، ئەگەر دواکەوتی ئەوا لەکاتی یەکەمی نیوە شەوا بەجێی بهێنە، لەوانە مەبە کە بێ ئاگان)[٧١].

---

[70]– رواه مسلم وغيره، وقد مضى بتمامه في الكتاب.

[71]– أخرجه مالك والطحاوي وابن حزم، وسنده صحيح.

ئەم فەرمودە بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر ئەوەی نوێژی عیشا درێژدەبێتەوە هەتا کاتی یەکەمی نیوەی شەو، ئەمەش راستە، لەبەرئەوە پێشەوا شەوکانی لە (الدرر البهية)دا ئەم رایەی هەڵبژاردووەو دەڵێت: (... دوا کاتی کاتی نوێژی عیشا کاتی یەکەمی نیوەی شەوە)، صدیق حەسەن خانیش شوێنی ئەو کەوتووە لە (/٦٩-٧٠) شەرحی کتێبەکەیدا هاتووە، کە وتەی ئیمام مالیکیشە لە (بداية المجتهد)دا، ئەمەش هەڵبژاردەی کۆمەڵێك لە شافیعیەکانە وەك(أبي سعيد الأصطخري) و جگە لەویش. سەیری کتێبی (المجموع)ی پێشەوا نەوەوەی بکە: (٣/ ٤٠)[٧٢].

### ٣- هەڵە لەکاتی نوێژ گێڕانەوەدا:

هەندێك لە نوێژخوێنان بۆ نمونە ئەگەر نوێژی شێوانیان بفەوتێت ئەوا لەکاتی نوێژی شێوانی رۆژی داهاتوودا دەیگێڕنەوە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ فَإِذَا نَسِيَ أَحَدُكُمْ صَلَاةً أَوْ نَامَ عَنْهَا فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا)[٧٣]. واتە: لە خەودا درێغی نیە، بەڵکو درێغی کردن لە بە ئاگاداییی دایە، جاهەر کەس لە ئێوە نوێژێکی لەیاد چوو یان خەوی لێکەوتبوو، با هەرکاتێك کەوتەوە یادی بیکاتەوە.

لەبەرئەوەی کەس نازانێت کەی مردن یەخەی دەگرێ، کەواتە پێویستە لەسەری هەقی خوا بداتە پێش هەموو شتێکەوە.

### ٤- نوێژکردن لەو کاتانەدا کە نوێژکردنیان تێدا قەدەغەکراوە:

هەندێ لە نوێژخوێنان هەندێ جار لەکاتێکدا نوێژە سوننەتەکانیان دەکەن کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە لەو کاتانەدا نوێژ بکرێت... ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایانە، چونکە باش نیە نوێژە سوننەتەکان لەهەموو کاتێکدا بکرێن، بەڵکو هەندێ کات هەیە قەدەغەکراوە نوێژی سوننەتیان تێدا بکرێت.

---

72– نقلا عن تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ١٤١– ١٤٢).

73– رواه أبو داود والترمذي وابن ماجة – صحيح الجامع: (٢٤١٠).

له (عَمْرُو)ى كوري (عَبَسَةَ)وه هاتووه، دهڵێت: وتم: ئهى پێغهمبهرى خوا صلى الله عليه وسلم فێرم بكه دهربارهى نوێژ، فهرمووى: (صَلِّ صَلَاةَ الصُّبْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنْ الصَّلَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ حَتَّى تَرْتَفِعَ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ حِينَ تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ ثُمَّ صَلِّ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى يَسْتَقِلَّ الظِّلُّ بِالرُّمْحِ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنْ الصَّلَاةِ فَإِنَّ حِينَئِذٍ تُسْجَرُ جَهَنَّمُ فَإِذَا أَقْبَلَ الْفَيْءُ فَصَلِّ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَحْضُورَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ ثُمَّ أَقْصِرْ عَنْ الصَّلَاةِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَحِينَئِذٍ يَسْجُدُ لَهَا الْكُفَّارُ)[٧٤]. واته: نوێژى بهيانى بكه، پاشان وازبهێنه له نوێژكردن تا خۆر دهردهچێت و بهرزدهبێتهوه، چونكه كاتێك دهردهچێت لهنێوان دووشاخهى شهيتاندا دهردهچێت، لهو كاتهدا كافرهكان سهجدهى بۆ دهبهن، پاشان نوێژبكه چونكه لهو كاتهدا مهلائيكه ئاماده دهبن و دهبنه شايهت، تا سێبهرى رم نامێنێ، پاشان وازبهێنه له نوێژكردن چونكه لهو كاتهدا دۆزهخ گهرم دهكرێت، جا ئهگهر سێبهرى بۆ دروست بووهوه ئهوا نوێژ بكه چونكه مهلائيكه ئاماده دهبن و دهبنه شايهت، پاشان وازبهێنه له نوێژكردن تا خۆر ئاوا دهبێت، ئهوه لهو كاتهدا له نێوان دووشاخهى شهيتاندا ئاوا دهبێت، لهو كاتهدا كافرهكان سهجدهى بۆ دهبهن.

له ريوايهتى ئهبو داوددا بهم شێوهيه هاتووه دهڵێت: وتم: ئهى پێغهمبهرى خوا صلى الله عليه وسلم چ نوێژێك باشتر گيرا دهبێت، فهرمووى: (جَوْفُ اللَّيْلِ الْآخِرُ فَصَلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلَاةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الصُّبْحَ)[٧٥]. واته: له سێيهكى دواى شهو، ههتا دهتوانيت نوێژى تێدا بكه چونكه لهو كاتهدا وهرگيراوهو مهلائيكه ئاماده دهبن و دهبنه شايهت تاكو نوێژى بهيانى دهكرێت.

وتهى (وترتفع) واته تا خۆر دهردهچێت ماناى ئهوه دهگهيهنێ كه لهپاش نوێژى بهيانى ههتا خۆر بهرزدهبێتهوه نوێژكردن قهدهغهكراوه، ههر دهبێ خۆر بهرز بێتهوه، نهك ههتا ئهو كاتهى خۆر ههڵدێت.

ئهم فهرموده بهڵگهيه لهسهر ئهوهى نوێژى سوننهت كهراههتى ههيه پاش نوێژى بهيانى و عهسر، ههر لهسهر ئهمه كهراههتى ههيه ئهو كاتهى خۆر ههڵدێت، ئهو كاتهى خۆر گهيشته ناوهڕاستى ئاسمان ههتا نهختێك لار دهبێتهوه، له پاش نوێژى عهسريش ههتا خۆر ئاوا دهبێت.

---

74– أخرجه مسلم: ٨٣٢.

75– أخرجه مسلم: (١/ ٢٩٤) مسافرين، وأبو داود: (٢/ ١٢٧٧).

عوقبەی کوڕی عامر ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ أَنْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ)[٧٦]. واتە: سێ کات هەیە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەی لێ دەکردین کە نوێژی تێدا بکەین، یان مردووی تێدا بنێژین: کاتێك کە خۆر دەردەچێت تا بەرزدەبێتەوە، یان کاتێك کە وشتر هەڵدەسێت — لەگەرمیدا - تا خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان لادەدات، یا کاتێك کە خۆر بەرەو ئاوا بوون دەچێت تا ئاوا دەبێت.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: زانایان ڕایان جیاوازە لەو نوێژە سوننەتانەدا کە هۆکار هەیە بۆ کردنیان وەك نوێژی چوونە مزگەوت و سەجدەی قورئان خوێندن و سوپاسگوزاری و نوێژی جەژن و نوێژی خۆرگیران و نوێژی جەنازەو گێڕانەوەی نوێژی فەوتاو.. لە مەزهەبی ئیمام شافیعی و هەندێکی تردا لە هەموو ئەو کاتانەدا دروستە ئەم نوێژە هۆکار دارانە بکرێن و کەراهەتی نیە، بەڵام لە مەزهەبی ئەبو حەنیفەو هەندێکی تردا دەچنە ڕیزی قەدەغەکراوانەوە بەگشتی فەرمودەکان[٧٧].

بەڵام بۆ فەوتانی نوێژە فەرزەکان جمهوری زانایان ڕایان وایە گێڕانەوەی دروستە لە هەموو کاتێکدا تەنانەت لەو کاتانەشدا کە نوێژکردنی تێدا قەدەغەکراوە، بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً أَوْ نَامَ عَنْهَا فَكَفَّارَتُهَا أَنْ يُصَلِّيَهَا إِذَا ذَكَرَهَا)[٧٨]. واتە: هەر کەسێك نوێژێکی لەیادچوو یان خەوی لێکەوتبوو، با هەرکاتێك کەوتەوە یادی بیکاتەوە. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا)[٧٩]. واتە: هەر کەسێك نوێژێکی لەیاد چوو هەرکاتێك کەوتەوە یادی بیکاتەوە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾ طه: ١٤. واتە: بە چاکی نوێژ بەجێ بێنە تا منت بێتەوە یاد.

سەبارەت بە نوێژی جەنازە، ئایا ئەم قەدەغەیە بەگشتی دەیگرێتەوە:

شێخ ئەلبانی دەڵێ: واجبە دواخستنی شاردنەوەی مردوو هەتا کاتی کەراهەت نامێنێ مەگەر ترسی ئەوە هەبێت مردووەکە تێك بچێت[٨٠].

---

[76]– أخرجه مسلم: (١/ ٢٩٣ ) مسافرين، والترمذي: (٣/ ١٠٣٠).

[77]– نيل الأوطار: (٣/١١٠).

[78]– متفق عليه عن أانس، صحيح الجامع: (٦٥٧١).

[79]– أخرجه مسلم وأبو داود والنسائي عن أبي هريرة – صحيح الجامع: (٦٥٦٩).

[80]– أحكام الجنائز للألباني: (ص: ٨٣).

# سەرپێچیەکانی نوێژخوێنان لە پۆشاکدا

**١- بەردانەوەی پۆشاک:**

لەبەرکردنی جلی شۆڕ ئەگەر بۆ فیزو دەعیەو رۆح زلی بێت ئەوە حەرامە، ئەگەر بەبێ مەبەست بێت ئەوە کەراهەتی هەیە، بێگومان لە نوێژدا زیاتر کەراهەتی هەیە![81].

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ أَسْبَلَ إِزَارَهُ فِي صَلاَتِهِ خُيَلاَءَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي حِلٍّ وَلاَ حَرَامٍ)[82]. واتە: هەر کەسێك بە جلی شۆڕەوە نوێژ بکات بۆ فیزو دەعیەو رۆح زلی ئەوە باوەڕی بەحەڵاڵ وحەرامی خوا نیە.

بەڵام ئەگەر بۆ غەیری فیزو دەعیەو رۆح زلی بوو ئەوا دەفەرموێت: (مَا أسْفَل مِنَ الكَعْبَيْنِ مِنَ الإزَارِ فَفِي النار)[83]. واتە: ئەو جل و بەرگەی لە خوار قولەپێوە بێت بۆ فیزو دەعیە ئەوە جێیەکەی لەناو ئاگری دۆزەخدا دەبێت.

زۆر لە نوێژخوێنان گاڵتەیان دێ بەم کارە هەتا کار گەیشتۆتە ئەو رادەیە کە تەوبە ناکەن لەسەر ئەم تاوانە، بەڵکو گاڵتە بەو کەسانەش دەکەن کە پۆشاکی کورت لەبەر دەکەن و خۆیان دەچوێنن بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (ثلاثةٌ لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، الْمَنَّانُ الَّذِي لَا يُعْطِي شَيْئًا إِلَّا مَنَّهُ، وَالْمُنْفِقُ سِلْعَتَهُ بِالحَلِفِ الفاجر– وفي لفظ آخر بِالحَلِفِ الكاذب)[84]. واتە: سێ کەس لە رۆژی قیامەتدا خوا نایان دوێنێ و روویان تێ ناکات و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە و سزای توندیان بۆ دەبێت: کەسێك جلی شۆڕ لەبەر بکات، وە کەسێك خێر بە هەژارێك بکات و دوایی منەتی بەسەردا بکات و بیداتەوە بەناوچاویدا، کەسێ شمەك و کەل و پەلی بە سوێندی درۆ ساغ بکاتەوە.

---

[81]– ئەم تاوانە دووبەشە: یەکەم: بۆ فیزو دەعیەو خۆ بەزل زانی. دووەهەم: بەبێ مەبەست.

بەشی یەکەم: ئەبێت بەهۆی چوار سزا لەلایەن خوای گەورەوە: (لا يُكَلِّمُهُمُ اللهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ، وَلاَ يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ). بەڵام بەشی دووەهەم: واتە بەبێ مەبەست یەك سزاو تۆڵەی بۆ دیاریکراوە: (مَا أسْفَل مِنَ الكَعْبَيْنِ مِنَ الإزارِ فَفِي النار). بەم شێوەیە لاوازی فەرموودەکەی پێشەوا ئەودوی دەرکەوت کە دەڵێ: بەبێ مەبەست کەراهەتی هەیە. ئەم بۆچوونە ناراستە چونکە گوناهی گەورە(کبیرە) ئەوەیە کە سزاو تۆڵەی بۆ دیاری کرابێت، کە هەروەکو دیمان بۆی دیاری کراوە کەواتە بەبێ مەبەستیش گوناهی (کبیرة)یەو حەرامە. بڕوانە (شرح رياض الصالحين لشيخ ابن عثيمين).

[82]– أخرجه أبو داود: (٤٦٧) عن ابن مسعود – صحيح الجامع: (٦٠١٢).

[83]– أخرجه البخاري: ( ٥٧٨٧ ) والنسائي: (٨/ ٢٠٧) عن أبي هريرة.

[84]– أخرجه مسلم: ( ١٠٦ ) واحمد عن أبي ذر – صحيح الجامع: (٣٠٦٧).

### ٢- نوێژکردن بە جلی تەنکەوە:

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان یەکێ لەوان بە جل و بەرگی روون یان تەنکەوە نوێژ دەکات بە شێوەیەك عەورەتی دیارە یان ژێری پۆشاکەکەی بەدەرەوەیەو دەردەکەوێت..

لە شێخ عبدالعزیز بن باز پرسیار کرا سەبارەت بە جل و بەرگی تەنك و نیمچە روون کە ئایا عەورەت دادەپۆشێ یان نا؟ وە ئایا دروستە نوێژی پێوە بکرێت و موسڵمان بۆی هەیە لەبەری بکات؟

لە وەڵامدا فەرمووی: ئەگەر ئەوەندە تەنك بوو عەورەتی یان سورو سپی پێستی دیار بوو ئەوە بۆ پیاو نوێژەکەی دروست نیە مەگەر شەرواڵێ یان پۆشاکێ لەبەر بکات نێوان ئەژنۆ و ناوکی داپۆشێت.. بەڵام ئەگەر ئافرەت وێنەی ئەو جل و بەرگانە لەبەر بکات ئەوە نوێژەکەی دروست نیە مەگەر لە ژێریەوە پۆشاکێ لەبەر بکات هەموو جەستەی داپۆشێت. بەڵام لە ژێریەوە پۆشاکی کورت لەبەر کردن بۆ ئافرەت بەس نیە. ئەگەر پیاو وێنەی ئەو جل و بەرگانە لەبەر بکات پێویستە فانیلەیەك یان شتێکی تر بپۆشێت سەرشانەکانی یا یەکێکیان داپۆشێت لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: (لاَ يُصَلِّي أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ مِنْهُ شَيْءٌ). واتە: با هیچ کەسێك لە ئێوە بە تەنها قوماشێکەوە نوێژ نەکات، تاکو شتێك بە شانیەوە نەبێت[85].

### ٣- نوێژکردن بەشانی رووتەوە:

ئەم هەڵەش بەزۆری لەحەرەمەین روو دەدات، ئەوانەی دەچن بۆ حەج و عەمرە دەبینین عەباکەیان لەسەر زەوی دادەنێن و بە قوماشێکەوە نوێژدەکەن لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی کردووە دەفەرموێت: (لاَ يُصَلِّيَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ لَيْسَ عَلَى عَاتِقِهِ مِنْهُ شَيْءٌ)[٨٦]. واتە: با هیچ کەسێك لەئێوە بە تەنها قوماشێکەوە نوێژ نەکات، تاکو شتێك بە شانیەوە نەبێت.

---

85– نقلا من مختصر الطهارة الصلاة / الشيخ عبد العزيز السدحان.

86– أخرجه البخاري: (٣٥٩) ومسلم: (٥١٦).

ئیمام مالك و ئەبو حەنیفە و شافیعی رەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ وە جمهوری زانایان دەڵێن: ئەمە قەدەغەکردنی تەنزیهیە نەك حەرام، ئەگەر کەسێك بە قوماشێکەوە نوێژ بکات عەورەتی داپۆشراو بێت ئەوە نوێژەکەی دروستە لەگەڵ ئەوەشدا کە کەراهەتی هەیە ئیتر توانای هەبێت شتێك بدات بەسەرشانیدا یان نا.

ئیمام أحمد و هەندێ لە پێشینە چاکەکان رەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ دەڵێن: نوێژەکەی دروست نیە ئەگەر توانای هەبێت ئیلا دەبێت شتێك بدات بەسەرشانیدا بەپێی رواڵەتی فەرمودەکە[٨٧].

٤- نوێژی کەسێك عەورەتی دیار بێت:

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: ئەی نەوەی ئادەم، پۆشاکی جوان و ڕازاوەتان بپۆشن لەکاتی هەموو نوێژێکدا وە بخۆن و بخۆنەوە(لەوەی کە حەڵاڵە بۆتان) و زیادە ڕەوی مەکەن، بیٚ گومان خوا زیادەڕەوانی خۆش ناوێ.

ئەندازەی عەورەتی پیاو نێوان ناوك و ئەژنۆیەتی، کەواتە ناوك و ئەژنۆ عەورەت نین.

بەڵام ئافرەت لەکاتی نوێژکردندا هەموو جەستەی عەورەتە: بۆیە پێویستە لە نوێژدا هەموو جەستەی داپۆشێت جگە لە روخسارو هەردوو دەستی.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵیٚ: نوێژی کەسێك رانەکانی رووت بیٚ دروست نیە، ئەگەر توانای هەبێت دایان بپۆشێت.. زانایان رایان جیاوازە لەسەر کەسێك عەورەتی دیار بێت لە چۆڵەوانیدا، بەڵام بۆ نوێژکردن جیاوازیان نیە و هەر دەبێت عەورەتی داپۆشراو بێت[٨٨].

ئیتر پێویست بە دوودڵی ناکات کە ڕان عەورەتە چونکە رەئی زۆربەی زانایانی لەسەرە، پێشەوا شەوکانیش بڕیاری لەسەر داوە[٨٩].

---

[87]- مسلم بشرح النووي: (٣-٤/ ٤٧٩).

[88]- مجموع الفتاوى: (٢٢/ ١١٦).

[89]- نيل الأوطار: (٢/ ٥٢-٥٣) والسيل الجرار: (١/ ١٦٠- ١٦١).

شێخ ئەلبانی دەڵێ: بەڵێ، لەوانەیە وتەی عەورەتی ڕان سوکتر بێت لە عەورەتی پاش و پێش، کە ئیبن قەیم لە کتێبی (تهذيب السنن)دا هەمان بۆچوونی هەیە وەك لێم گێڕاوەتەوە لە (الإرواء)دا، ڕواڵەتی دەستدان لەڕان کە لە فەرمودەکەی (أبي ذر)دا هاتووە ئەوە دەگەیەنێت کە لەسەروو پۆشاکەوە بووە، وەك حوکمی دەستدان لە پاش و پێش نیە[٩٠].

**٥- کۆکردنەوەی پرچ و پۆشاك:**

لە ئیبن عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعٍ وَلاَ أَكْفِتَ الشَّعْرَ وَلاَ الثِّيَابَ)[٩١]. واتە: فەرمانم پێکراوە لەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرم و پرچ و پۆشاکم کۆنەکەمەوە.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: فەرمودەی (لا نَكفِت الشعر ولا الثياب). بە نونی سەرەو فای ژێرە واتە پرچ و پۆشاك کۆنەکرێتەوە، (والكفت) واتە پێکەوە کۆکردنەوە، هەروەها لەم فەرمایشتەی خواشدا هەر ئەم مانایە دەگەیەنێ کە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾﴾ المرسلات: ٢٥. واتە: ئایا ئێمە زەویمان نەکردۆتە کۆکەرەوە بۆ زیندوان و مردووان.

(کۆکردنەوەی پرچ لەپشتی سەر) زانایان کۆ و یەکدەنگن لەسەر قەدەغەکردنی نوێژی ئەو کەسەی کە پرچ و پۆشاکی کردوەتەوە یان پرچی کۆدەکاتەوەو دەیکات بە پەلکە یان لولی دەکات لەژێر مێزەرەکەیدا هەموویان قەدەغەکراون و زانایان یەك دەنگن لەسەری، ئەمەش کەراهەتی تەنزیهیە نوێژەکەی دروستە بەڵام تەواو نیە.

زانایان دەڵێن: حیکمەت لەوەدا کە کراهەتی هەیە ئەوەیە پرچەکە لەگەڵیدا سەجدە دەبات[٩٢].

پێشەوا ئیبن حەجەر دەڵێ: مەبەست لە کۆکردنەوەی پرچ و پۆشاك بە دەستەکانی ڕواڵەتی فەرموودەکەی ئەوە دەگەیەنێت قەدەغەکردنەکە بۆ کاتی نوێژە[٩٣].

---

[90]- نقلا عن تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ١٦٠).

[91]- أخرجه مسلم: (٢٣١) الصلاة.

[92]- مسلم بشرح النووي: (٤/ ٢٧٨-٢٧٩).

[93]- فتح الباري: (٢/ ٣٤٤).

جارێکیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێکی بینی پرچی کۆکردبووەوە لەپشتی سەری[94] فەرمووی: (إِنَّمَا مَثَلُ هَذَا مَثَلُ الَّذِي يُصَلِّي وَهُوَ مَكْتُوفٌ)[95]. واتە: بەڕاستی وێنەی ئەم پیاوە وەك كەسێكە بە بەستراوەیی نوێژ بكات.

هەروەها فەرمووی: (ذَلِكَ كِفْلُ الشَّيْطَانِ. يَعْنِي مَقْعَدَ الشَّيْطَانِ. يَعْنِي مَغْرِزَ ضُفُرِهِ)[96]. واتە: ئەوە جێگەی دانیشتنی شەیتانە. واتە: شوێنی كۆكردنەوەی پرچەكەی.

و (كان لا يفترش ذراعيه)[97]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم باسكەكانی ڕانەدەخست. بل (كان يرفعهما عن الأرض ويباعدهما عن جنبيه حتى يبدو بياض إبطيه من ورائه)[98]. واتە: بەڵكو (بەرزی دەكردنەوە لە زەوی و دووری دەخستنەوە لە لاكانیەوە هەتا بن هەنگڵەكانی دەردەكەوت بۆ كەسێك لە پشتیەوە وەستا بێت. و(حتى لو أن بهمة أرادت أن تمر تحت يديه مرت)[99].

واتە: بەشێوەیەك ئەگەر بەرخۆلەیەك بیویستایە بە ژێر باڵیدا تێپەڕ ببێ تێپەڕ دەبوو.

وە زۆر زیادەڕۆیی تێدا دەكرد تاكو هاوەڵان دەیانوت: (إن كنا لنأوي لرسول الله صلى الله عليه و سلم مما يجافي بيديه عن جنبيه إذا سجد)[100] [101]. واتە: ئێمە دڵمان دەسووتا بۆ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەبەر ئەوەی ئەوەندە دەستەكانی دوور دەخستەوە لە لاكانی كە سەجدەی دەبرد.

---

[94] – (ابن أثير) دەڵێ: واتای فەرموودەكە ئەئەوەیە: كە ئەگەر پرچی پەرش و بڵاوكرابێتەوە دەكەوێتە سەر زەوی لەكاتی سەجدە بردندا خاوەنەكەی بەو كردارە پاداشت دەدرێتەوە، بەڵام ئەگەر كرابێت بە پەلكە یان لول درابێت وەك ئەوەی لێ دێت كە سەجدەی نەبردبێت، شوبهێنراوە بە كۆتكراو، چونكە دەستەكانی بەستراودتەوە، لەبەر ئەوەی لەكاتی سەجدەدا ناكەوێتە سەر زەوی.

منیش دەڵێم: ئەم حوكمە تایبەت بە پیاوانە هەروەكو ئیمام شەوكانی لە ئیمام (ابن العربی)ەوە گێڕاویەتیەوە.

[95] – رواه مسلم وأبو عوانة وابن حبان.

[96] – رواه أبو داود والترمذي وحسنه.

[97] – رواه البخاري وأبو داود.

[98] – أخرجه البخاري ومسلم.

[99] – رواه مسلم وأبو عوانة وابن حبان.

[100] – رواه أبو داود: وابن ماجة بسند حسن.

[101] – نقلا عن صفة الصلاة النبي صلى الله عليه و سلم للألباني: (ص: ١١٠).

### ٦- بیروباوەڕی نوێژکردن بەخوف و پێڵاوەوە دروست نیە:

ئەم بیروباوەڕە باوە لەناو خەڵکدا کە نوێژکردن بە نەعل و پێڵاوەوە دروست نیە. ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی کردووە بەپێڵاوەوە نوێژ ئەنجام بدرێت، دەفەرموێت: (خَالِفُوا الْيَهُودَ فَإِنَّهُمْ لاَ يُصَلُّونَ فِي نِعَالِهِمْ وَلاَ خِفَافِهِمْ)[١٠٢]. واتە: پێچەوانەی جولەکەکان بن، چونکە ئەوان بە نەعلەوە یان بەخوفەکانیانەوە نوێژ ناکەن.

لێرەدا فەرمانەکە لە زاهیری خۆی کە واجب بونە لایداوە بەرەو سوننەت بە بەڵگەی فەرمودەکەی ئەبو هورەیرە ڕەزای خوای لێ بێ کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إذا صلى أحدكم فليلبس نعليه أو ليخلعهما بين رجليه و لا يؤذي بهما غيره)[١٠٣]. واتە: ئەگەر هەر یەك لە ئێوە ویستی نوێژەکەی ئەنجام بدات، ئەوا با نەعلەکانی لە پێ بکات، یان دایان کەنێت و لەنێوان پێکانیدا دایان بنێت و کەسیان پێ ئازار نەدات.

لە یەزیدی ئەزدیەوە هاتووە، کە وتویەتی: پرسیم لە ئەنەسی کوڕی مالیك کە ئایا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بە پێڵاوەوە نوێژی ئەنجام داوە: وتی: بەڵێ[١٠٤].

### ٧- نوێژکردن بە پۆشاکی حەرامەوە:

هەندێ کەس لەوانەی کە بازرگانی بە کەلوپەلی حەرامەوە دەکەن، یان لە شوێنێك کار دەکەن کە کەلوپەلی حەرام وەبەردەهێنێ، موچەکەیان هەمووی حەرامە، خۆراکی حەرام دەخۆن، پۆشاکی حەرام دەپۆشن، لەگەڵ ئەوەشدا بەو پۆشاکە حەرامەوە نوێژدەکەن.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئایا نوێژکردن بە پۆشاکی حەرام و زەوت کراوەوە دروستە یان نا؟.

ریوایەت کراوە کە هەر کەسێك پۆشاکێك بکڕێت بە دە درهەم، درهەمێکی حەرامی تێدا بێت، خوای گەورە نوێژی لێ وەرناگرێت لەبەر ئەو درهەمە حەرامەی کە تێی کەوتووە[١٠٥].

---

102- رواه أبو داود والحاكم عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ - صحيح الجامع: (٣٢١٠).

103- رواه الحاكم أبو داود عن أبي هريرة - صحيح الجامع: (٦٥٣).

104 - أخرجه البخاري: (٣٨٦، ٥٨٥٠).

105- ضعيف الجامع: ٥٤٢٠ .

له ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (لأن يجعل أحدكم في فيه ترابا خير له من أن يجعل في فيه حراما)[106]. واتە: هەر یەك لە ئێوە ئەگەر گڵ بخوات باشترە لەوەی ماڵی حەرام بخوات.

لە (یوسف کوڕی الأسباط)ەوە هاتووە دەڵێ: کاتێ گەنجێك خواپەرستی دەکات، شەیتان بە هاوکارانی دەڵێ: سەیر بکەن بزانن خۆراکەکەی حەرامە یان حەڵاڵە؟ ئەگەر حەرام بوو، دەڵێ: وازی لێ بهێنن با خۆی ماندوو بکات، تەنها نەفسی خۆی بەسە بۆ گومڕاکردنی، چونکە خۆ ماندووکردنی لەگەڵ ئەوەدا خۆراکەکەی حەرامە بە کەڵکی نایەت.

(عبدالله کوڕی المبارك) دەڵێ: ئەگەر درهەمێکی شوبهە بدەمە دواوە چاکتر لەلام لەوەی سەد هەزار سەد هەزار ببەخشم هەتا دەگاتە شەست سەد هەزار.

ئەگەر کەسێك بە پۆشاکی زەوت کراوەوە نوێژ بکات ئایا نوێژەکەی دروستە یان نا؟

وەڵام: لە وتەی مەشهوری ئیمام ئەحمەددا هاتووە کە نوێژکردن بە پۆشاکی زەوت کراوەوە دروست نیە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە بە عەمامە یان بە ئەنگوستیلەی ئاڵتونی زەوت کراوەوە نوێژ بکات، بێگومان نوێژەکەی دروستە چونکە نوێژەکە لەسەر ئەوە دانەمەزراوە، دروستیەکەی پێچەوانەی پۆشاکە.

حەنەفیەکان و ئیمام شافیعی و مالیك و زۆرینە دەڵێن: نوێژەکەی دروستە لەگەڵ ئەوەشدا کە پۆشاکەکە حەرامە، ئەمەش ریوایەتی ئیمام ئەحمەدە، چونکە حەرامیەکەی تیبەت نیە بەنوێژەکەوە، قەدەغەکردنی زەوت کراوەکە ناگەڕێتەوە بۆ نوێژەکەو ڕێگر نیە بۆ دروستی. وەك چۆن پۆشاکە چڵکنەکەی دەشوات بە ئاوی زەوت کراو، بە یەکدەنگی زانایان پاك دەبێتەوە[107].

---

106- شعب الإيمان: (٥/٥٧) (٧٦٣٥).

107- الدين الخالص/ للشيخ محمودخطاب السبكي: (٢/ ١١٠).

### ٨- نوێژکردن بە جلی تەسکەوە:

یەکێك لەو سەرپێچیانەی کە بڵاوبووەتەوە وەك بڵاوبوونەوەی ئاگری بڵێسەدار لە پوش وپەڵاشدا – پۆشینی پۆشاکی تەنگە لەناو پیاواندا- کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەندازەی عەورەتی پاش و پێشی دیار بێت، ئەم پۆشاکە هەرکەسێك لەبەری بکات ناتوانێت بەتەواوی کڕنوش و سوژدەکەی ببات و دەبێتە هۆی لەدەستدانی ئارامی و خشوع، لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە نوێژەکەی وەرنەگیرێت، چونکە خشوع روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ.. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو پیاوەی کە نوێژەکەی تەواو نەبوو لەکاتێکدا ئارامی و خشوعی لەدەستدابوو فەرموو: (ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ..)[١٠٨]. واتە: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد.

### ٩- (سدل)ی پۆشاك لە نوێژدا:

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکان، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە.

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (نَهَى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ السَّدْلِ فِي الصَّلَاةِ)[١٠٩]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (سدل). پۆشاك بەردانەوەی قەدەغە کردووە لە نوێژدا.

زانایان رایان جیاوازە لە مانای (السَّدْل)دا:

دەڵێن: (السَّدْل) پۆشاك بەردانەوەیە هەتا دەگاتە زەوی، ئەمەش وتەی ئیمام شافیعی[١١٠]و، (خَطابي)یە[١١١].

دەڵێن: (السَّدْل): ئەوەیە نوێژخوێن پاڵتۆیەك یان چاکەتێك یا هەر شتێکی لەو جۆرە بکاتە سەر شانی بەبێ ئەوەی دەست لە قۆڵەکانیەوە دەربکات، ئەمەش وتەی ئیمام ئەحمەدە[١١٢].

---

[108]– متفقٌ عَلَيْهِ.

[109]– رواه الخمسة والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم.

[110]– المجموع: (٣/ ١٨٠).

[111]– الفتح: (١/ ٥٨٦).

[112]– إرشاد الساري: (٨/٤٨٤).

دەڵێن: ئاڵاندنی پۆشاکە بەخۆوە و دەستکردنە بەناویدا، بەو شێوەیەش رکوع و سەجدە ببرێت، ئەمەش وتەی ئیبن (الأثیر)ە[113].

هەروەها دەڵێن: پۆشاك بەردانەوەیە بەبێ ئەوەی لاکانی کۆکرێتەوە، ئەگەر کۆبکرێتەوە ئەوە (سدل) نیە، ئەمەش وتەی ئەبو عوبەیدە.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر لاکانی پۆشاکەکە کۆبکرێتەوە و دەست نەکرێ بەناو قۆڵەکانیدا ئەوە (إسدال) نیە وەك عەبا.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: دوای ئەو وتانەی کە باسکران لەپێشەوە : هیچ رێگرێ نیە لەبەردەم دانانی فەرمودەکە لەسەر هەموو ئەو مانایانە، ئەگەر (سدل) لە نێوانیاندا هاوبەش بێت، ئەمەش رای مەزهەبی بەهێزە[114].

چاکەت دانە سەرشان بەبێ ئەوەی دەست لە قۆڵەکانیەوە دەربکرێت، هەروەها دانانی دەستەسڕ یان هەر شتێکی تر لەسەر شان (سدل)ە...

زاهیریەکان دەڵێن: (السَّدْل) حەرامە لە نوێژدا، جمهوری زانایان قەدەغەکردنیان داناوە بەسەر کەراهەتدا[115].

**١٠- لەبەرکردنی ئاوریشم و ئیستەبرەق و دیباج و زێڕ بۆ پیاوان:**

ئەم شتانە بۆ ئافرەتان حەڵاڵن، بەڵام بۆ پیاوان حەرامن.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (أُحِلَّ الذَّهَبُ وَالْحَرِيرُ لِإِنَاثِ أُمَّتِي وَحُرِّمَ عَلَى ذُكُورِهَا)[116]. واتە: پۆشینی ئاوریشم و زێڕ بۆ مێینەی ئوممەتم حەڵاڵە، بەڵام بۆ نێرینەکانیان حەرامە.

بەڵام بۆ پیاوان لەلایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بە ئاشکرا قەدەغەکراوە.

---

113– الفتح: (١/ ٥٧٨).

114– نيل الأوطار: (٢/ ٦٧).

115– الدين الخالص: : (٣/١٧٧).

116– رواه احمد، صحيح سنن النسائي: ٥١٤٨ – صحيح الجامع: ٢٠٩.

لە بەرائی کوڕی عازبەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەوت شتی لیٚ قەدەغەکردین: (نَهَى عن خَاتَمِ الذَّهَبِ أَوْ قَالَ حَلْقَةِ الذَّهَبِ وَعَنْ الْحَرِيرِ وَالْإِسْتَبْرَقِ وَالدِّيبَاجِ وَالْمِيثَرَةِ الْحَمْرَاءِ وَالْقَسِّيِّ وَآنِيَةِ الْفِضَّةِ)[117]. واتە: لە ئەنگوستیلەی زێڕ یان فەرمووی ئەڵقەی زێڕ، لە ئاوریشم و ئیستەبرەق و دیباج، لە نەرمە زینی سوری بەرگ ئاوریشمین، لە کاڵاو مشکی و هەوری و پۆشینی تێکەڵ لە ئاوریشم، لە شت خواردنەوە بە حاجەتی زیوو[118].

لە عومەرەوە ڕەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (لاَ تَلْبَسُوا الحَرِيرَ، فَإِنَّ مَنْ لَبِسَهُ فِي الدُّنْيَا لَمْ يَلْبَسْهُ فِي الآخِرَةِ)[119]. واتە: پۆشاکی ئاوریشم لەبەرمەکەن، چونکە بەڕاستی هەر پیاویٚ لە دنیادا لەبەری بکات لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەری ناکات.

## بابەتێکی گرنگ:

پێشەوا شەوکانی لە (نیل الأوطار)دا هێناویەتی لە ژێر ناونیشانی: (بابەتی بوونی بەکارهێنانی کەمێك لەوانە بۆ ئالاو پەرچەم و پینەکردن) بە بەڵگەی ئەم فەرمودە: لە عومەرەوە رازی خوای لیٚ بیٚ هاتووە دەفەرموێت: (نَهَى عَنْ لَبُوسِ الْحَرِيرِ إِلاَّ هَكَذَا، وَرَفَعَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم إِصْبَعَيْهِ الْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةَ وَضَمَّهُمَا)[120]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی لیٚ قەدەغەکردین تەنها ئەوەندە نەبێت، پەنجەی ناوەڕاست و شایەتمانی بەرزکردەوەو نوساندنی پێکەوە.

لە وتەیەکی تردا هاتووە. پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشمی لیٚ قەدەغەکردین تەنها ئەوەندەی جێگەی دوو پەنجە یا سیان یان چوار پەنجە نەبێت[121]. ئیمام ئەحمەد و ئەبو داود ئەمەشیان بۆ زیاد کردووە: ئاماژەی بە دەستی کرد.

---

[117]– أخرجه البخاري عن البراء: (٥٨٦٣).

[118]– دیاج: ئەو ئۆشاکەیە کە روەکەی و بەرەکەی ناوریشمە. ئیستەبرەق: هەر دیاجە بەلآم ئەستور ترە. قسي: ئۆشاکێکە لـە کـەتان و ناوریشم تێکەڵە.

[119]– أخرجه البخاري: (١٠/ ٥٨٣٢) ومسلم ٢١/٣) لباس.

[120]– متفق عليه.

[121]– رواه الجماعة إلا البخاري.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرموده بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەندازەی چوار پەنجە پۆشاکی ئاوریشم حەڵاڵە وەك چنین بەبێ جیاوازی لە نێوان ئەوەی تێکەڵە لەگەڵ پۆشاکەکە یان ڕێسراوە یا بەدرومان دوربیبێتیانەوە پێیەوە، وە زیاتر لە چوار پەنجە پۆشاکی ئاوریشم حەرامە، هەروەها ئاڵتون لەپێش ترە کە حەرام بێت، ئەمەش ڕەئی مەزهەبی جمهورە[122].

هەروەها لەکاتی نەخۆشی و حاڵەتی زەروریدا هاتووە کە روخسەت هەیە پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بکرێت.

لە ئەنەسەوە رازی خوای لێ بێ هاتووە دەڵێت: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَخَّصَ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَالزُّبَيْرِ فِي قَمِيصٍ مِنْ حَرِيرٍ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا)[123]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێی دابوو بە عبدالرحمان کوڕی عەوف و زوبەیر کە پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بکەن چونکە جەستەیان دەخورا.

لە ریوایەتی پێشەوا (مسلم)دا بەم شێوەیە هاتووە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێی دابوو بە کوڕی عەوف و زوبەیر پۆشاکی ئاوریشم لەبەر بکەن چونکە شەکوای حاڵی خۆیان کرد کە ئەسپێیان هەیە[124].

**١١- نوێژکردن بەسەری رووتەوە:**

نوێژکردن بەسەری رووتەوە کەراهەتی هەیە، چونکە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

شێخ ئەلبانی تەعلیق لەسەر وتەکەی ئیبن عەباس دەدات کە دەڵێ: (ان النبی کان ربما نزع قلنسوته فجعلها سترة بین یدیه). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم قلنسوەکەی دادەناو دەیکردە (سوترە) بەربەست لەبەردەم نوێژەکەیدا.

دەڵێم: ئەم فەرموده ناکرێتە بەڵگەی سەر رووت کردن لەبەر دوو ڕوو:

---

122- نيل الأوطار: (٢/ ١٠٢).

123- أخرجه البخاري : (٦/ ٧٣) ، ومسلم: (٢٠٧٦).

124- أخرجه مسلم: (٢٠٧٦).

یەکەم- ئەمە فەرمودەیەکی (ضعیف) لاوازە، وە بەسە بۆ دەلالەت کردنە سەر ئەمە کە ئیبن عەساکیر بە تەنها دەیگێڕێتەوە، وە عیللەتەکەیم ئاشکرا کردووە لە (الضعیفة: ٢٥٣٨)دا.

دووهەم- ئەگەر ئەمە صحیح بێت ناکرێتە بەڵگەی سەر رووت کردن بە (مطلق)ی، لەبەرئەوە زاهیری ئەوەیە ئەو کاتێ ئەم کارەی دەکرد کە شتێکی دەست نەکەوتایە بیکات بە سوترە.. لەبەرئەوەی دانانی سوترە گرنگترە، بە پێی ئەو فەرمودانەی لەوبارەوە هاتوون.

ئەوەی من دەیبینم لەم بابەتەدا ئەوەیە نوێژی سەر رووت مەکروهە، لەبەرئەوەی شتێکی بڕاوەیە کە موستەحەبە موسڵمان بەتەواوترین روخساری ئیسلامیەوە بچێتە ناو نوێژەوە لەبەرئەو فەرمودەیەی کە پێشتر لە کتێبەکەدا هاتووە دەفەرموێت: (.. فَإِنَّ اللَّهَ أَحَقُّ مَنْ تُزَيَّنَ لَهُ)[125]. واتە: بەڕاستی خوای گەورە شیاوترە کە خۆی بۆ بڕازێنرێتەوە. وە بەردەوام سەر رووتی و گەڕان بەسەر رێگاکان و بەم شێوازە چوونە ناو شوێنی خواپەرستن روالەتێکی جوان نیەو لە داب و نەریتی سەلەف نیە، بەڵکو لە داب و نەریتی بێگانەو بیانییە، کشاوەتە ناو زۆربەی وڵاتە ئیسلامیەکانەوە، کاتێك کافرەکان هاتنە ناوی، داب و نەریتی خراپەکانی خۆیان هێنا بۆی، موسڵمانەکانیش چاویان لێ کردن، جا بەمانەو وێنەی ئەمانە نەریت و عادات و تەقالیدی کەسایەتی ئیسلامی خۆیان لەدەستدا، ئەم دیاردە کتوپڕیە بەکەڵکی ئەوە نایەت بکرێتە رێگا خۆشکەر بۆ مخالەفە کردنی عورفی ئیسلامی پێشوویان بکرێت بە بەڵگە بۆ دروستی چوونە ناو نوێژ بە سەری رووتیەوە[126].

بەڵام لێرەدا قاعیدە ئەوەیە ئەو کەسەی بەسەری رووتەوە نوێژ دەکات نوێژکەی دروستە، لەگەڵ ئەوەشدا کە کەراهەتی هەیە، چونکە سەر داپۆشین لەتەواوی نوێژە کە خوای گەورە فەرمانی پێکردووە دەفەرموێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾ الأعراف: ٣١. واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم هەرکاتێك نوێژتان کرد خۆتان داپۆشن بە جوانترین شێوە با عەورەتتان دەرنەکەوێت، بخۆن و بخۆنەوە زێدەڕۆیی مەکەن، چونکە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆشناوێت زێدەڕۆیی دەکەن.

---

125– أخرجه الطبراني والطحاوي في شرح معاني الآثار: ١/ ٣٧٧، صحيح الجامع: ٦٥٢.

126– نقلا عن تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ١٦٤).

### ١٢- نوێژکردن بە پۆشاکێکەوە وێنەی لەسەر بێت:

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بەرگێکی ڕەنگاو ڕەنگدا نوێژی دەکرد، کاتێك لە نوێژەکەی بویەوە فەرمووی: **(اذْهَبُوا بِخَمِيصَتِي هَذِهِ إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّةِ أَبِي جَهْمٍ فَإِنَّهَا أَلْهَتْنِي آنِفًا عَنْ صَلَاتِي)**[١٢٧]. واتە: ئەم بەرگە بەرنەوە بۆ ئەبو جوهم و، بەرگێکی سادە بۆ من بهێنن، چونکە لە نوێژکەمدا خەیاڵی بردم.

نوێژکردن بە جل و بەرگێکەوە وێنەی لەسەر بێت کەراهەتی تەحریمە، هەروەها بوونی وێنەی ئاژەڵان و غەیری ئەوانیش لەبەردەم نوێژخوێندا کە سەرقاڵی بکات - لەلای غەیری حەنەفیەکان- کەراهەتی هەیە، بە بەڵگەی ئەم فەرمودە کە ئیبن عەباس لە ئەبو تەڵحەوە ڕەزای خوایان لێ بێ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (لاَ تَدْخُلُ الْمَلاَئِكَةُ بَيْتاً فِيهِ كَلْبٌ وَلاَ صُورَةٌ)[١٢٨]. واتە: هەر ماڵێك سەگ و وێنەی تێدا بێت مەلائیکە تێی ناچن.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: هەر پۆشاکێك وێنەی سەگ یان خاچ یا هەر شتێکی تری لەسەر بوو کە مرۆڤ مەشغول بکات ئەوە نوێژکردن پێوەی کەراهەتی هەیە هەروەها نوێژکردن بەرەو ڕوی ئەوە فەرمودەی لەسەر هاتووە[١٢٩].

- هەندێ لە زانایان ڕایان وایە نوێژکردن بەو جۆرە پۆشاکانەوە بەتاڵە.

هەندێکی تریان ڕایان وایە نوێژەکەیان دروستە لەگەڵ ئەوەشدا کەراهەتی هەیە.. ئەمەش هەق و ڕاستیە لەم بابەتەدا.

---

127– أخرجه البخاري: ٣٧٣ ومسلم: ٥٥٦.

128– متفقٌ عَلَيْهِ عن أبي طلحة – صحيح الجامع: ٧٢٦٢.

129– المجموع: ٣/١٨٠.

## سەرپێچیەکان لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا

**١- وەسوەسە لە خۆپاککردنەوەدا:**

هەندێك کەس دەست بەئاو گەیاندنی لەسەر خۆی قورس کردووە شەیتانیش ڕێگەی وەسوەسەی بۆ دەکاتەوە بۆیە دەبینین زێدەڕەوی دەکات لەکاتی خۆپاککردنەوەدا و ئاوی زۆر بەکار دەهێنێ و زۆر دەمێنێتەوە هەتا کاتی نوێژەکەی دەڕوات پاشان بە ماوەیەکی زۆر دەستنوێژ دەگرێت، وا دەزانێت دەستنوێژەکەی تەواو نیە.. ئەمانەش هەموویان سەرپێچین و پێویستە موسڵمان خۆی لێیان بەدوور بگرێت، هەتا هەموو ڕێگاکانی شەیتان ببڕێت لەسەر خۆی.

**٢- زیکری خوا نەکردن لەکاتی چوونە سەرئاو و هاتنەدەرەوەدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی کە زۆر لە موسڵمانان تێی کەوتوون - مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات - لە هۆکانی ئازاردانیەتی لەلایەن شەیتانەوە، چونکە وازهێنان لە زیکر دەبێتە هۆی غافڵ بوون لە خوای گەورە و، زاڵ بوونی شەیتانی نەفرەتی.

**سوننەتی چوونە سەرئاو و هاتنەدەر بەم شێوەیە[١٣٠]:**

لە ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیویستایە بچێتە سەرئاو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ)[١٣١].
واتە: ئەی خوایە من پەنات پێ دەگرم لە نێرینەی جنۆکەو مێینەکانیان.

لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بیویستایە دەست بەئاو بگەیەنێت دەیفەرموو:

(بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ)[١٣٢].

---

[130]- بێگومان سوننەتە لەکاتی چوونە سەرئاو قاچی چەپ پێش قاچی ڕاست بخرێ، لەکاتی هاتنەدەرەوەدا قاچی ڕاست پێش قاچی چەپ بخرێ. وەرگێڕ.

[131]- متفق عليه. أخرجه البخاري: (١/ ١٤٢)، ومسلم: (١/١٢٢) (٣٧٥)الحيض.

[132]- رواه أبن أبي شيبة عن أنس – صحيح الجامع: (٤٧١٤).

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: وتەی: (إذا دخل الخلاء). لە کتێبی(فتح)دا دەڵێ: واتە کاتێ بیویستایە بچێتە سەرئاو ئەم زیکرەی دەخوێند نەك لە دوایدا، وە لە کتێبی (الأدب المفرد)دا ئیمام بوخاری ئەمەی هێناوە، لە ئەنەسەوە دەیگێڕێتەوە کە وتویەتی: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەگەر بیویستایە بچێتە سەرئاو دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ). ئەمەش بۆ شوێنی دروستکراو بۆ ئەو مەبەستە ئاوددست، بەڵام بۆ شوێنەکانی تر واتە بیابان لە یەکەم کاتی هەڵکردنی پۆشاکدا دەیخوێند، ئەمەش مەزهەبی جمهوری زانایانە[١٣٣].

## سودێکی گرنك:

ئەگەر یەکێك لەبیری چوو هەتا دەچێتە سەرئاو چۆن ئەم زیکرە بخوێنێ؟

- ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە خوای پەروەردگاریش زاناترە ئەگەر کەسێك لە بیری چوو پێش ئەوەی دانیشێ با بیڵێ، بەڵام ئەگەر دانیشت با بەدڵ پەنا بەخوا بگرێت و زمانی نەجوڵێنێ، لە (صحیح مسلم)دا هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّ رَجُلًا مَرَّ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبُولُ فَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ)[١٣٤]. واتە: جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی بەئاو دەگەیاند، پیاوێك بەلایدا تێپەڕی سلاوی لێ کرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە.

ئەمەش کەراهەتی هەیە نەك حەرام، بە بەڵگەی فەرمودەکەی عائیشە رەزای خوای لێ بێ کە دەڵێت: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ)[١٣٥]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە هەموو کاتێکدا زیکرو یادی خوای دەکرد.

لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: هەرکاتێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەسەرئاو دەربچوایە دەیفەرموو: (غُفرانَكَ)[١٣٦]. واتە: خودایە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم.

---

133– نيل الأوطار (١/ ٩٧).

134– أخرجه مسلم: (١/١٩٤) والترمذي: (١/ ٩٠) وأبو داود: (١/٦١).

135– أخرجه مسلم: (٣٧٣) الحيض .

136– أخرجه مسلم: (١/١٩٤) والترمذي: (١/٧) وصححه الألباني.

پێشەوا شەوكانی دەڵێ: وتەی (غُفرانَكَ). یان (مفعول بـە منـصوب بفعـل مقـدر)ە: واتـە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەكەم خوایە، یا (مفعول مطلق)ە واتە داوای لێ بووردنت لێ دەكەم لێم خۆشببە. دەڵێن: بۆیە داوای لێ خۆشبوون دەكات چونكە لەو حاڵەتەدا وازی لە زیكركردن هێناوە، وەك سابت بووە لە هەموو حاڵەتێكدا زیكری خوای كردووە جگە لە حاڵـەتی دەست بە ئاو گەیاندن، بە شێوەیەك لەسەر ئەو وازهێنانـە خـۆی وا نیـشانداوە كـەموكوڕی كـردووە بۆیە داوای لێ خۆشبوونی لـە خـوا كـردووە، وتویانـە: لەبـەر كـەموكوڕی لـە سوپاسـگوزاری نیعمەتەكانی خوا بەرامبەر بەوەی دەربی كردۆتە دەرەوە لەسەر پێشاو[١٣٧].

**٣- قسەكردن لەكاتی دەست بەئاو گەیاندندا:**

ئەمەش لە سەرپێچیە باوەكانی ناو موسڵمانانە.

پێشەوا شەوكانی لە (نیل الۆگار)دا سەرباسێكی داناوە بە ناونیشانی: وازهێنان لە قسەكردن لەلایەن ئەو كەسەوە كە دەست بەئاو دەگەیەنێت.... فەرمودەكەی ئیبن عومەری كردووە بە بەڵگە كە دەفەرموێت: (أَنَّ رَجُلًا مَرَّ وَرَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبُولُ فَسَلَّمَ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ) [١٣٨]. واتە: جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی بەئاو دەگەیاند پیاوێك بەلایدا تێپەڕی سڵاوی لێ كرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە.

پاشان پێشەوا شەوكانی دەڵێ: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زیكركردن لەكاتی دەست بەئاو گەیاندندا كەراهەتی هەیە، با واجبیش بێت وەك وەڵام دانەوەی سەلام[١٣٩].

بەڵام قەسەكردن دروستە ئەگەر پێویست بێت وەك ئەوەی كوێرێك خەریك بێت بكەوێتە خوارەوە ئەمیش هاواری لێ بكات و ڕێی پیشان بدات یان هەرشتێكی تری لەو شێوە كە پێویست بێت.

تەنانەت ئەگەر پژمی لە دڵی خۆیدا بڵێ: (الحمد لله). لەبەر بە گەورە گرتنی زیكری خوا لەو شوێنەدا.

---

137- نیل الأوطار (١/ ٩٨).

138- أخرجه مسلم: (١/١٩٤) والترمذي: (١/ ٩٠) وأبو داود: (١/٦١).

139- نیل الأوطار للشوكاني: (١/ ١٠٠).

### ٤- خۆ حەشار نەدان لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا:

ئەمەش یەکێکی ترە لە بەلاکان.. کەسانێکی زۆر هەن بە بەرچاوی خەلکەوە دەست بەئاو دەگەیەنن، بە شێوەیەك کە خەلك عەورەتیان دەبینێ.. (ولا حول ولا قوة إلا بالله).

لەکاتێکدا کە پێغەمبەی خوا صلى الله عليه وسلم ئەم کارەی قەدەغەکردووە دەفەرموێت: (لاَ يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ، وَلاَ الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ..)[١٤٠]. واتە: پیاو نابێت تەماشای عەورەتی پیاو بکات، هەروەها ئافرەتیش نابێت تەماشای عەورەتی ئافرەت بکات.

بێگومان ئەو کەسەی لەبەر چاوی خەلك دەست بەئاو بگەیەنێ دەبێتە هۆی ئەوەی تووشی گوناهیان بکات، بەوەی کە تەماشای عەورەتی دەکەن -بێگومان هەردوو لایان وەك یەك گوناهبار دەبن.

پێغەمبەری خۆشەویست صلى الله عليه وسلم رەوشتی وەهابووە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا لەبەر چاوی خەلك ئەوەندە دوور دەکەوتەوە هەتا کەس گوێی لە دەنگ نەبێ و بۆنی ناخۆش نەکات.

لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي سَفَرٍ وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَأْتِي الْبَرَازَ حَتَّى يَتَغَيَّبَ فَلَا يُرَى)[١٤١].

واتە: لەگەڵ پێغەمبەی خوادا صلى الله عليه وسلم دەرچووین بۆ سەفەرێك، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هەرگیز دەستی بەئاو نەدەگەیاند هەتا تەواو وون دەبوو کەس نەیدەبینی.

عبدالله کوڕی جەعفەر کە نازناوی ئەبو جەعفەرە رەزای خوایان لێ بێ فەرمووی: (وَكَانَ أَحَبُّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رسولُ الله صلى الله عليه وسلم لِحَاجَتِهِ هَدَفٌ أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ. يَعنِي: حَائِطَ نَخْلٍ)[١٤٢]. واتە: باشترین شتێك کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خۆی لە پەنادا حەشار بدایە لە کاتی دەست بەئاو گەیاندندا بارستایی و بەرزایی و شورەی باخە خورما بوو.

---

140– أخرجه مسلم والترمذي عن أبي سعيد – صحيح الجامع: (٧٨٠٠).

141– أخرجه ابن ماجة: ٣٣٥/١، وأبو داود: ٢/١ وصححه الألباني .

142– أخرجه مسلم: ١٨٤/١ ( ٣٤٢ ) ( ٧٩ ) الحيض، وأحمد: (١/ ٣٣٥).

پێشەوا شەوکانی دەڵێت: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر ڕەوایی خۆ حەشاردان بۆ کەسێك بیەوێت دەست بەئاو بگەیەنێ هەتا کەس لەسەر ئەو حاڵەتە نەیبینێ[١٤٣].

**٥- هەڵگرتنی ئەو شتانەی کە ناوی خوایان تێدایە:**

هەروەها ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی زۆربەی خەڵك تێی کەوتوون.

خاوەنی کتێبی (الدین الخالص) دەڵێ: وا چاکە بۆ ئەو کەسەی دەست بەئاو دەگەیەنێ هەر شتێك ناوی خواو ناوی پێغەمبەر و مەلائیکەی لەسەر بوو نەیبات لەگەڵ خۆی.

ئەمەش وتەی هەر چوار مەزهەبەکەیە: ئەگەر پێچەوانەی ئەمە کرا ئەوە کەراهەتی هەیە مەگەر لەبەر حاڵەتی پێویست، وەك ئەوەی مەترسی لەناوچوونی هەبێت، ئەمە بۆ بێجگە لە قورئان، بەڵام بۆ قورئان دەڵێن: لەو حاڵەتەدا حەرامە هەڵگرتنی قورئان یان چەند ئایەتێکی قورئان ئیللا مەگەر ترسی لەناوچوونی هەبێت، ئەویش دەبێ لەناو شتێکدا پارێزراو بێت، هەر چۆنێك بێت واجبە بشاردرێتەوە لەو حاڵەتەدا[١٤٤] .

**٦- ڕووکردنە قیبلە لەکاتی دەست بەئاو گەیاندندا:**

ئەم کارەش دروست نیە.. بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆرە، بەڵام تەنها ئەم فەرمودە بەسە.. لە ئەبو ئەیوبەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا أَتَيْتُمْ الْغَائِطَ فَلَا تَسْتَقْبِلُوا الْقِبْلَةَ وَلَا تَسْتَدْبِرُوهَا بِبَوْلٍ وَلَا غَائِطٍ وَلَكِنْ شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا)[١٤٥]. واتە: ئەگەر دەستتان بەئاو گەیاند نە ڕوو لە قیبلە بکەن و نە پشتیشی تێ بکەن، بەڵکو ڕوو لە ڕۆژهەڵات بکەن یان ڕۆژئاوا. جا ئەبو ئەیوب دەیفەرموو: کاتێك کە هاتینە شام بینیمان ئاودەستەکان بەرەو ڕووی قیبلە دروستکراون، جا ئێمەش لار دەبووینەوەو دوای لێ بوردنمان لە خوای گەورە دەکرد.

---

[143]– نيل الأوطار للشوكاني: (ج١/ ١٠٠-١٠٢).

[144]– الدين الخالص: (١/ ٢١٤).

[145]– أخرجه البخاري: ٤١٨/١ ومسلم: ١/ ٢٦٤.

زانایان لەمەدا رایان جیاوازە: بەڵام پوختەی قسە لەو بارەوە کە دڵ بیگرێ ئەمەیە:

ئیبن عەرەبی دەڵێ: هەڵبژاردەی ئەمە -خوا سەرکەوتوومان بکات و پشتیوان بێت- ئەوەیە دروست نیە پشت کردنە قیبلە و روو تێ کردنی جا چ لە بیاباندا بێت یان لەناو ماڵدا، چونکە ئەگەر سەرنجی ماناکەی بدەین بۆمان دەردەکەوێت حەرامیەکەی لەبەر قیبلەیە، ئیتر جیاوازی نیە لە بیاباندا بێت یان لەناو خانوبەرەدا، فەرمودەکەی ئەبو ئەیوبیش گشتیە بۆ هەموو شوێنێ، عیللەتی حەرامیەکەی لەبەر قیبلەیە، فەرمودەکەی ئیبن عومەر و فەرمودەکەی جابر دژی فەرمودەکەی ئەبو ئەیوب نین لەم چوار رووەوە:

**یەکەم**- فەرمودەکەی ئەبو ئەیوب گوفتارە بەڵام ئەوەی ئەوان کردارە، هیچ دژایەتیکش نیە لە نێوان گوفتار و کرداردا.

**دووهەم**- کردارەکە هیچ (صیغة)شێوازێکی دیاریکراوی نیە، بەڵکو بەسەرهاتی حاڵەتێکە، بەسەرهاتی حاڵەتەکانیش شایستەی هۆکار و پاساو هێنانەوەن، بەڵام ئەوە بۆ گوفتارەکان ناگونجێ.

**سێهەم**- وتەی شەرع یەکەمە کرداریش عادەتە، شەرعیش لە عادەت لەپێش ترە.

**چوارەم**- ئەگەر کردارەکە دروست بوایە خۆی حەشار نەدەدا[146].

ئەمەش هەڵبژاردەی ئیبن تەیمیەیە لە (الاختیارات)دا، شەوکانیش لە (السیل الجرار: ٦٩/١) دا، ئەلبانیش لە(تمام المنة: ٦٠)دا، وە جگە لەوانیش.

**٧- میزکردن بەرەو رووی با:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکان چونکە ئەو بایە لەوانەیە ببێتە هۆی ئەوەی پرژەی میزەکە بگەڕێنێتەوە بۆ خۆی و پیسی بکات بەوەش نوێژەکەی بەتاڵ ببێتەوە.

---

146- تحفة الأحوذي: (٥٩/١) نقلا عن أخطاء المصلين.

### ٨- میزکردنە ناو کونی زەویەوە:

ئەمەش لای ئەهلی زانست و زانیاری کارێکی ناپەسەندە چونکە لەوانەیە لەو کاتەدا مارێك یان دووپشكێك بێتەدەرەوە پێوەی بدات و ببێتە هۆی ئازار و ژان بۆی... یەکێك لە مەبەستەکانی شەریعەتیش بۆ پاراستنی نەفسە، بۆیە ناکرێت مرۆڤ نەفسی خۆی بخاتە مەترسیەوە نەوەکا دەعبایەك پێوەی بدات، یا ئازاری گیانلەبەرەکان بدات.

قەتادە لە عبداللهی کوڕی سەرجسەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى أَنْ يُبَالَ فِي الْجُحْرِ. قَالَ قَالُوا لِقَتَادَةَ مَا يُكْرَهُ مِنَ الْبَوْلِ فِي الْجُحْرِ قَالَ كَانَ يُقَالُ إِنَّهَا مَسَاكِنُ الْجِنِّ)[١٤٧]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی کردووە میز بکرێتە ناو کونی زەویەوە. وتی: وتیان بە قەتادە: لەبەر چی خراپە میز بکرێتە ناو کونی زەویەوە؟ فەرمووی: دەڵێن: واتە: جێگای جنۆکەیە[١٤٨].

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی میزکردنە ناو ئەو چاڵانەی کە شوێنی دڕندەو دەعبایە کەراهەتی هەیە[١٤٩].

### ٩- کەمتەرخەمی لە نەگرتنەوەی بەلوعەی ئاوەکان:

ئەمەش بە گوناه دێتە هەژمار، چونکە فەرامۆشکردنی دەبێتە هۆی بەفیڕۆدانی سامانی ئاو ئەمەو جگە لەوەش کە سوودی لێ نابینرێت، خوڕە و دەنگی ئاوەکەش تەشویش و ژاوەژاو دروست دەکات بۆ نوێژخوێنان، ئەم دیاردەیە زیاتر لە مزگەوتە حکومیەکان و باخچە گشتیەکاندا ڕوودەدات، شتێکی شاراوەنیە ئاوی زیادەی ئاوەڕۆکان بەناو شەقام و کۆڵانەکاندا بڵاودەبێتەوە و دەبێتە هۆی ئازار بۆ ئەو کەسانەی تێدەپەڕن، ئەمەو جگە لەبۆنی ناخۆش و، زۆربوونی مێش و مێشولە کە دەبنە هۆی تەنینەوەی نەخۆشی، ئیسلام بانگەواز دەکات بۆ پاك و خاوێنی و نەهێشتنی ئیسراف و کەمتەرخەمی لە هەموو شتێکدا[١٥٠].

---

147– رواه أحمد: ٨٢/٥، وابو داود: ٢٩/١، والنسائي: ٣٣/١.

148– ئەم فەرمودە هەندێ لە فەرمودەناسان بە (صحيح)یان داناوە و هەندێکیشیان بە (ضعيف) لاواز، لای کەمی ئەوەیە (حسن)ە چونکە زانایان وەریان گرتووەو کردویانە بە بەڵگە. (الشرح الممتع للعثيمين: ١/ ٧٨-٧٩). وەرگێڕ.

149– نيل الأوطار للشوكاني: (١/ ١١٢).

150– السنة والبدعة/ د. فؤاد مخيمر(١/١١٨).

**١٠- دەست بەئاو گەیاندن لە ڕێگەوبان و سێبەری خەڵکدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە بەڵاکان، کە شتێکی باوە و بڵاوبۆتەوە -بەتایبەتی لە دێهاتەکاندا-، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (اتَّقُوا اللَّعَّانَيْنِ). واتە: خۆتان بپارێزن لەو دوو شتەی کە دەبنە هۆی نەفرەت لێ کردنتان لەلایەن خەڵکەوە. وتیان: ئەو دوو شتە چییە ئەی نێردراوی خوا؟ فەرمووی: (الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ فِي ظِلِّهِمْ)[١٥١]. واتە: ئەوەی لەسەر ڕێگەوبان و سێبەری خەڵکدا پیسی دەکات.

پێشەوا (الخطابي) دەڵێ: مەبەست و موارد لە (لاعنین) ئەوەیە ئەو دوو کارە دزێوە بانگەواز دەکەن بۆ نەفرەت لێ کردن لەلایەن خەڵکەوە لەو کەسانەی ئەو کارە خراپە دەکەن، لەبەرئەوە عادەتی خەڵك وایە نەفرەت دەکەن لەو کەسانەو جنێویان پێ دەدەن، وە لەبەرئەوەی هۆیەکن بۆ ئەوەی نەفرەتیان لێ بکرێت لە ڕێی مەجازی عەقلیەوە، دەشبێت (لاعن) نەفرەتکەر مانای (ملعون) نەفرەت لێ کراو بگەیەنێت بە هەمان شێوە لە ڕێی مەجازی عەقلیەوە.

دەست بەئاو گەیاندن لە هەموو سێبەرێکدا حەرام نیە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە ژێر پەلکە خورمادا دەستی بەئاو گەیاندووە بێگومان سێبەریشی بووە، فەرمودەکە بەڵگەیە بۆ حەرامی دەست بەئاو گەیاندن لە ڕێگەوبان و سێبەری خەڵکدا کە دەبنە هۆی بۆنی ناخۆش و ئازاردانی موسڵمانان و پیس کردنیان کاتێك تێدەپەڕن یان بیانەوێ لەو سێبەرانەدا بحەوێنەوە[١٥٢].

لە (أَبَا سَعِيدٍ الْحِمْيَرِيِّ)ەوە ئەویش لە مەعازەوە دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (اتَّقُوا الْمَلَاعِنَ الثَّلَاثَ: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ وَالظِّلِّ)[١٥٣]. واتە: خۆتان بپارێزن لەو سێ شتەی کە دەبنە هۆی نەفرەت لێ کردنتان لەلایەن خەڵکەوە: پیسی کردنە ناو سەرچاوە و جۆگەی ئاوەکان و ڕێگەوبان و سێبەری خەڵك.

---

151– أخرجه مسلم: ١/٦٨ (٢٦٩) الطهارة ، وأحمد: ٢/٣٧٢.

152– نيل الأوطار للشوكاني: (١/ ١١٢-١١٣).

153– رواه ابي داود: ١/٦٢، وابن ماجة: ١/ ٣٢٨ وحسنه الألباني في الإرواء الغليل.

مەبەست لە (موارد) کە کۆی (مورد)ە سەرچاوە و جۆگەی ئاوەکانە، مەبەست لە (قارعة الطريق) ڕێگەوبانە بۆیە وەها ناوی لێ نراوە چونکە خەڵك هاتوچۆی پێدا دەکەن و قاچ و پێڵاوەکانی پێدا دەدەن ئەمەش وتەی (إبن رسلان)ە، وە مەبەست لە (الظل) ئەو سێبەرانەیە کە خەڵك تێیاندا دەحەوێنەوە نەوەك هەموو سێبەرێك[١٥٤].

١١- خۆ پاککردنەوە بە کەمتر لە سێ بەرد:

ئەمەش یەکێکە لەو سەرپێچیانەی کە زۆربەی موسڵمانان لێی پارێزراو نین.

دەربارەی قەدەغەکردنی فەرموده هاتووه.

لە (عبدالرحمن)ی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: بە سەلمانی فارسیان وت: پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون، هەتا شێوەی دەست بەئاو گەیاندنیش، ئەویش فەرمووی: (أَجَلْ لَقَدْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ)[١٥٥]. واتە: بەڵێ لێی قەدەغەکردبووین کە بەرەو قیبلە میز و پیسایی بکەین، بە دەستی ڕاست خۆمان پاك بکەینەوە، یان خۆمان پاك بکەینەوە بە کەمتر لە سێ بەرد، بەپیسی ئاژەڵ و بە ئێسقان خۆمان پاك بکەینەوە.

١٢- خۆ پاککردنەوە بە دەستی ڕاست:

ئەمەش یەکێکە لەو سەرپێچیانەی کە زۆربەی زۆری موسڵمانان لێی پارێزراو نین -مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات-.

لە (عبدالرحمن)ی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: بە سەلمانی فارسیان وت: بە سەلمانی فارسیان وت: ئێوە پێغەمبەرەکەتان هەموو شتێکی فێرکردوون، تەنانەت پیسی کردنیش؟ ئەویش وتی: (أَجَلْ لَقَدْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ...)[١٥٦]. واتە: بەڵێ لێی قەدەغەکردووین کە بەرەو قیبلە میز و پیسایی بکەین و، بە دەستی ڕاستیش خۆمان پاك بکەینەوە، یان بە سێ بەرد کەمتر خۆ پاك بکەینەوە، یان بەپاشەڕۆ و ئێسك خۆ پاك بکەینەوە.

---

154- نيل الأوطار للشوكاني: (١/ ١١٢-١١٣).

155- أخرجه مسلم: (٥٧/١) طهارة، والترمذي: (١٦/١).

156- أخرجه مسلم: ٥٧/١ (٢٦٢)، والترمذي: ١٦/١.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: زانایان کۆن لەسەر ئەوەی خۆ پاککردنەوە بە دەستی راست کەراهەتی هەیە، پاشان جەماوەری زانایان رایان وایە بۆ ئەدەب و کەراهەتی تەنزیهیە

نەك بۆ حەرامیەتی، هەندێ لە ئەهلی زاهیر رایان وایە حەرامە، کۆمەڵێ لە هاوەڵانمان بڕیاریان لەسەر حەرامیەتی داوە، دەڵێ: هاوەڵانمان دەڵێن: رەوایە پشت بە دەستی راست نەبەسرێت لە خۆ پاککردنەوەدا مەگەر لەبەر بەهانەیەکی شەرعی، ئەگەر بەئاو خۆی پاککردەوە بە دەستی راست ئاوەکەی پێدا بکات و بە دەستی چەپ پاکی بکاتەوە، ئەگەر بە بەرد بوو پاشەوەی بە دەستی چەپ پاك بکاتەوە، بەڵام بۆ پاککردنەوەی پێشەوە بەردەکە لەسەر زەوی دابنێ و زەکەری بە دەستی چەپ بگرێ و بیهێنێ بە بەردەکەدا، ئەگەر ئەمەی بۆ نەگونجا با بە دەستی راستی بەردەکەبگرێ و بەدەستی چەپی بیهێنێ بە بەردەکەدا، بەبێ ئەوەی دەستی راستی بجولێنێ... ئەمەش راستیەکەیەتی[157].

**١٣- دەستهێنان بە زەکەردا بە مەبەستی پاککردنەوەی لە میز و، ئهم ئهم کردن:**

ئەمەش یەکێکە لە سەرپێچیەکانی نوێژخوێنان - بەتایبەتی ئەوانەی وەسوەسەیان هەیە و لەسەر خۆیانیان قورس کردووە- .

پێشەوا ئیبن قەیم دەربارەی سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەم بارەوە دەڵێ: کاتێك دەردەچوو لە سەرئاو، خۆی پاك دەکردەوە، بەدەستی چەپ بەبەرد خۆی پاك دەکردەوە، قورئانی دەخوێند، هیچ کارێکی لەو جۆرە کارانە نەدەکرد کە ئەهلی وەسواس تێوەی گلاوون لە دەستهێنان بە زەکەرداو، ئهم ئهم کردن و، بازدان و، دەست گرتن بە پەتەوە و، سەرکەوتن بە پیلکانەدا و، لۆکە خستنە ناو بۆری میز و، شتنی ناوەوەی زەکەر و، گەڕان بە دوایدا ناو بەناو، هەروەها چەند بیدعەیەکی تر کە ئەهلی وەسواس دەیکەن[158].

---

157– نيل الأوطار: (١/ ١٢٣).

158– زاد المعاد للإمام ابن قيم الجوزية: (١/ ١٧٣).

**١٤- خۆ پاك نەكردنەوە لەپاش میز:**

ئەم سەرپێچیە دەبێتە هۆی نوێژ بەتاڵ بوونەوە بەبێ ئەوەی پیاو بەخۆی بزانێت کە سەرپێچی کردووە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە هۆشیاری داوە دەفەرموێت: (تَنَزَّهُوا مِنَ الْبَوْلِ فَإِنَّ عَامَّةَ عَذَابِ الْقَبْرِ مِنْهُ)[159]. واتە: خۆتان لەمیز پاك بکەنەوە، چونکە زۆربەی سزای گۆڕ لەسەر خۆ پاك نەکردنەوەیە لەپاش میز.

لە ئیبن عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دای بەلای دوو گۆڕداو فەرمووی:

(إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ...)[160]. واتە: ئەم دوانە ئێستا سزا دەدرێن، سزادانەکەشیان لەبەر تاوانی گەورە نیە - واتە: تاوانەکەیان وا قورس و گران نەبوە کە نەیانتوانیبێ خۆیانی لێ بپارێزن - یەکێکیان لەکاتی دەست بە ئاو گەیاندندا لە میز خۆی باش نەدەپاراست و خۆی حەشار نەدەدا.

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَنْزِهُ مِنْ بَوْلِهِ). واتە: یەکێکیان لە پاش میزکردن خۆی پاك نەدەکردەوە.

**١٥- بیروباوەڕی خۆ پاککردنەوە بە بەرد دروست نیە لە کاتێکدا کە ئاو هەبێت:**

ئەم بیروباوەڕەش تێگەیشتنێکی هەڵەیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: ڕاستیەکەی ئەوەیە خۆ پاککردنەوە بە بەرد کەراهەتی نیەو پەسەندە[161].

---

159 – رواه الدار قطني في سننه : (٤٧) صحيح جامع: ٣٠٠٢ .

160– أخرجه البخاري: (٢٥٣/١)، ومسلم: (٤/ ٢٠٠).

161- الاختيارات الفقهية: (٣٠١/٥).

له عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا ذَهَبَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْغَائِطِ فَلْيَذْهَبْ مَعَهُ بِثَلَاثَةِ أَحْجَارٍ فَلْيَسْتَطِبْ بِهَا فَإِنَّهَا تَجْزِي عَنْهُ)[١٦٢]. واتە: ئەگەر کەسێکتان چووە سەر پێشاو با خۆی بە سێ بەرد پاك بکاتەوە، چونکە بەو شێوەیە بری پاك کردنەوە دەکەوێت.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: خاوەنی (البحر) دەڵێ: خۆ پاککردنەوە بە بەرد بەکۆی دەنگ شەرعیە. وتەی: (فإنها تجزي عنه) . واتە: ئەودی بەسەو بری پاککردنەوە دەکەوێت، ئەمەش بەڵگەیە بۆ ئەوانەی دەڵێن خۆ پاککردنەوە بە بەردەکان بەسە و خۆ پاککردنەوە بە ئاو واجب نیە، شافیعیەکان وحەنەفیەکانیش هەمان رایان هەیە ئیبن زوبێر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و ئیبن موسەییەبیش هەروا دەڵێن[١٦٣].

(شقیری) دەڵێ: هەرکەس دەڵێ: خۆ پاککردنەوە بە بەرد دروست نیە ئیللا لەکاتی نەبوونی ئاودا نەبێت دەبێت پەشیمان ببێتەوە و تەوبە بکات، مەگەر عوزرێکی هەبێت، چونکە سابت نەبووە کە کامیان چاکترە[١٦٤].

### ١٦- خۆ پاککردنەوە بە پشقل و ئێسقان:

یەکێکی تر لە سەرپێچیەکان ئەوەیە هەندێ کەس لەکاتی خۆ پاککردنەوەدا پشقل و ئێسقان بەکاردەهێنن، یان هەندێکیان بە پەڕەی نوسراو خۆیان پاك دەکەنەوە -هیچ گومانی تێدا نیە بەکارهێنانی پەڕەی نوسراو حەرامە چونکە لەوانەیە ئایەتی قورئان یان فەرمودەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم لەسەر نوسرا بێت.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی: (أَنْ يَسْتَنْجِيَ أَحَدٌ بِعَظْمٍ أَوْ رَوْثَةٍ أَوْ حُمَمَةٍ)[١٦٥]. واتە: کەسێك بە ئێسقان یان بە پیسی یا بە خەڵوز خۆی پاك بکاتەوە.

---

162- رواه أحمد: (٦/ ١٠٨) والنسائي: (١/ ٤١) وصححه الألباني.

163- نيل الأوطار: (١/١١٩) .

164- السنن والمبتدعات: (ص: ١٦).

165- رواه أبو داود ودار القطني والبيهقي عن ابن مسعود - صحيح الجامع: (٦٨٢٦).

له فەرمودەکەی سەلمان کە (مسلم) ریوایەتی کردووە هاتووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی (..أَنْ يَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ)[١٦٦]. واتە: خۆ پاك بکرێتەوە بە پشقل یان بە ئێسقان.

دەڵێن: عیللەتی قەدەغەکردنی خۆ پاککردنەوە بە ئێسقان ئەوەیە چونکە لینجی پێوەیە و زۆربەی جاریش خاڵی نیە لە چەوری. وە دەڵێن: لەبەرئەوەیە خۆراکی جنۆکەیە، ئەمە بە دەق دیاریکراوە هەموو خواردنەکانی تریش دەگرێتەوە، بەڵام خۆ پاککردنەوە بە پشقل لەبەرئەوەیە کە پیسە، پیسیش بە پیسی لاناچێت[١٦٧]، [١٦٨].

**١٧- دەست پاك نەکردنەوە لە دوای هاتنەدەر:**

دەبێت موسڵمان پاکوخاوێن بێت چونکە ئیسلام دینی پاکوخاوێنیە، بەڵام دەبینین هەندێ کەس دەستیان پاك ناکەنەوە لەدوای هاتنەدەر لە سەرئاو ئیتر بە سابون بێت یان بە هەر پاك کەرەوەیەکی تر، ئەمەش دەبێتە هۆی ئازاردانی نوێژخوێنان.

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا أَتَى الْخَلَاءَ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فِي تَوْرٍ أَوْ رَكْوَةٍ فَاسْتَنْجَى ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ عَلَى الْأَرْضِ)[١٦٩]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ دەچووە سەر پێشاو لە جامێکدا یان لە جەوەنەیەکدا ئاوم بۆ دەبرد خۆی پێ پاك دەکردەوە لەپاشاندا دەستی لە زەوی ئەخشاند.

---

[166]- أخرجه مسلم: ١/٥٧ (٢٦٢)، والترمذي: ١٦/١.

[167]- نيل الأوطار: (١/ ١٢٦).

[168]- ئەمە لەکاتێکدایە کە پشقلی حەیوانێك لبێت گۆشتەکەی ناخورێت واتە: تەرس، بەڵام بۆ پشقلی ئەو ئاژەڵانەی کە گۆشتیان دەخورێت لەبەر ئەوەیە کە پشقل و کێویلەکەیان خواردنی ئاژەڵی جنۆکەکانە بە بەڵگەی: (كل بعرة علف لدوابكم). رواه مسلم. کە بە جنۆکە باوەڕدارەکانی فەرموو. والله أعلم. عبدالرحمان حسین پور.

[169]- رواه أبو داود: (٤٥) والنسائي: (١/٤٥) بسند حسن.

## ١٨- میزکردنە شوێنی خۆشتن:

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی زۆربەی خەڵك تێی کەوتوون لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەی کردووە: (نَهَى أَنْ يَبُولَ الرَّجُلُ فِي مُسْتَحَمِّهِ)[١٧٠].
واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە کەسێك میز بکاتە ئەو شوێنەی خۆی تێدا دەشوات.

فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر قەدەغەکردنی میزکردنە شوێنی خۆشتن، چونکە ئاسەواری لەو شوێنەدا دەمێنێتەوە ئەگەر کەمێك ئاوی بەرکەوت دەبێتە هۆی پیس بوونی شوێنەکە، رێگەیەکە بۆ دروست بوونی وەسوەسە لەبەر ئەم (علل)ە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی لێ کردووە. بێگومان دەڵێن: ئەگەر شوێنی خۆشتن گونجی هەبوو ئەوا کەراهەتی نیە، چونکە قەدەغەکە پەیوەستە بە (علە) عیللەتی بڵاوبوونەوەی پیسیەکەوە و پاشان وەسوەسە لەبەر ئەوە لە نەهی تەحریمەوە دەگۆڕێت بۆ کەراهەت[١٧١].

لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّهُ نَهَى أَنْ يُبَالَ فِي الْمَاءِ الرَّاكِدِ)[١٧٢].
واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردووە میز بکرێتە ناو ئاوی وەستاوەوە.

---

170– رواه الترمذي عن عبدالله بن مغفل – صحيح الجامع: (٦٨١٥).

171– نيل الأوطار: (١/ ١١٤).

172– أخرجه مسلم والنسائي وابن ماجة عن جابر – صحيح الجامع: (٦٨١٤).

## ئەو هەڵانەی پەیوەندیان بە دەستنوێژەوە هەیە

**١- گاڵتەو گەپ و قسەکردنی زۆر لەبارەی دنیاوە:**

ئەمەش زۆر باوە لەناو نوێژخوێنانداا کەسێك لەوانە کاتێك بەو شێوەیە دەچێتە ناو نوێژەوە و خشوع لە دڵیا نامێنێت.

پیاو چاکانی پێشینمان بە ئامادەیی و ترسان لە خوای گەورەو بەدەسەڵاتەوە دەستنوێژیان دەگرت.

حەسەن رەزای خوای لێ بێ کاتێك دەستنوێژی دەگرت رەنگی زەرد هەڵتەگەڕا، لێیان پرسی لەو بارەوە؟. فەرمووی: ئایا نازانن ئێستا لەبەردەم کێدا رادەوەستم؟!.

**٢- نیەت هێنان بە زمان:**

ئەمەش یەکێکە لە بیدعە تازە داهێنراوەکان چونکە جێگای نیەت دڵە، نیەت هێنان فەرزێکە لەو فەرزانەی کە بەبێ ئەو هیچ پەرستشێك دروست نیە.

**٣- وازهێنان لە زیکری سەرەتاو دوای دەستنوێژ:**

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا وُضُوءَ لَهُ وَلَا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرْ اسْمَ اللَّهِ تَعَالَى عَلَيْهِ)**[١٧٣].
واتە: نوێژ بۆ کەسێك نیە دەستنوێژی نەبێت، کەسێکیش لەسەرەتاوە (بسم الله)ی نەکردبێت دەستنوێژی نیە.

ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر واجبێتی (بسم الله) لە دەستنوێژدا، ئەمەش مەزهەبی (العترە)و زاهیریەکان و ئیسحاق و ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە لە وتەیەکیدا.

لەلای شافیعیەکان و حەنەفیەکان و مالیك و رەبیعە وتنی (بسم الله) سوننەتە لە سەرەتای دەستنوێژەوە، لە وتەیەکی پێشەوا(هادی) [١٧٤] دا هاتووە کە سوننەتە.

---

173– رواه أحمد وأبو داود وابن ماجة، صحيح الجامع: (٧٥١٤).

174–يحيى بن حسين الزيدى المعروف بالإمام الهادي.

لەبارەی چۆنیەتی و فەزڵی زیکری دوای دەستنوێژەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَا مِنْكُمْ مِنْ أحَدٍ يَتَوَضَّأُ أَوْ فَيُسْبِغُ الوُضُوءَ، ثُمَّ يقول: أشهَدُ أنْ لا إلــهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ؛ إلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ). وزاد الترمذي: (اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ المُتَطَهِّرِينَ). واتە: هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بگرێت پاشان بڵێ: (أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی. پێشەوا (ترمذي)ش ئەمەی بۆ زیادکردووە: (اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ المُتَطَهِّرِينَ). خودایە بمانخەیتە ریزی ئەو کەسانەی تەوبەکارن و ئەو کەسانەش کە خۆیان خاوێن رادەگرن.

### ٤- زیکرەکانی کاتی دەستنوێژ (لەنێوان بیدعە و سوننەتدا):

دەبینین زۆربەی خەڵك لەکاتی دەستنوێژدا شتێك دەخوێنن لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانیشیەوە رەزای خوایان لێ بێ سابت نەبووەو نەهاتووە، دەبینین هەندێکیان دەڵێن: «اللهم أعطني كتابي بيميني». یان هەر شتێکی تری لەو جۆرە.

وازدەهێنن لەم زیکرە صەحیحەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە لەکاتی دەستنوێژدا بخوێنرێت:

لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: ئاوی دەستنوێژم برد بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی پێ گرت گوێم لێ بوو دەپاڕایەوە دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي وَوَسِّعْ لِي فِي دَارِي وَبَارِكْ لِي فِي رِزْقِي)[١٧٥]. واتە: خودایە لە تاوانەکانم ببورە و خانەم فراوان بکە و بەرەکەت بخەرە رۆزیم.

### ٥- کەراهەتی قسەکردن لەکاتی دەستنوێژدا:

شێخ سید سابق دەڵێ: قسەکردن (موباح) ڕەوایە لەکاتی دەستنوێژدا، چونکە لە سوننەتدا شتێکی وەها نەهاتووە بەڵگە بێت لەسەر قەدەغەکردنی[١٧٦].

### ٦- زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی ئاودا:

---

175- أخرجه النسائي في (عمل اليوم والليلة) والترمذي وحسنه الألباني في صحيح الجامع: (١٢٦٥).

176- فق السنة: ١/٤٤.

ئیمام بوخاری لە بەشی یەکەمی (باسی دەستنوێژ)دا دەڵێ: زانایان راو بۆچونیان وایە کە زیادەڕەوی لە بەکارهێنانی ئاودا کەراهەتیی هەیە، هەروەها لەوەش تێپەڕن کە کردەوەی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە بەکارهێنانی ئاودا دەستی پێوە دەگرت: (يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ، وَيَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ)[177]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە (صاع)ێك خۆی دەشت و بە موددێك دەستنوێژی دەگرت. (صاع)یش چوار موددە.

بەڵام ئەگەر (علة) عیللەت هەبوو وەك بوونی چڵك و پیسی بە جەستەوە ئەوە دروستە لە سێ جار زیاتر بیشوات.

**٧- گوێنەدان بە روکنێ لە روکنەکانی دەستنوێژ:**

دەستنوێژ چەند روکن و فەرزێکی هەیە، یەکەم نیەتە کە جێگای دڵە، شتنی روخسارو دەستەکان هەتا ئانیشکەکان، دەستی تەڕ هێنان بەسەردا، شتنی پێکان هەتا هەردوو قولەپێ.

ئەگەر روکنێ لە روکنەکانی پێچەوانەی ئەمە بوو کە باسکرا ئەوە دەستنوێژ نایەتەدی و بە دەستنوێژێکی شەرعی ناژمێرێ.. هەندێ کەس کەمتەرخەمی دەکەن لە یەکێك لە روکنەکاندا لە ترسی ئەوەی نەوەکا شێوەی روخساری یان جوانی پرچ و قژی تێك بچێت یا هەر شتێکی تری لەو جۆرە. هەردەبێ ئەوە بزانن کە نوێژکردن بەبێ دەستنوێژ تەواو و دروست نیە، دەستنوێژیش تەواو نابێت ئیللا بە جێبەجێ کردنی ئەو روکنانە نەبێت.

**ئەوەی لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ماوەتەوە دەربارەی مەسحی سەری سێ شتە:**

**أ- مەسحی هەموو سەری:**

لە عبداللهی کوڕی زەیدەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ)[178].

---

177- أخرجه البخاري: ١/٤٩، ومسلم: ٤/٨.

178- أخرجه البخاري: ١/٢٣٢ ومسلم: ٣/١٢١.

واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مەسحی سەری کرد بەهەردوو دەستی دەی بردن بۆ دواوەو دەیهێنانەوە، لەپێش سەریەوە هەردوو دەستی دەهێنا هەتا پاشی سەری، لەپاشاندا دەستی دەگێڕایەوە هەتا دەگەیشتە ئەو شوێنەی مەسحەکەی لێوە دەست پێکردبوو.

**ب- مەسح کردنی صلی الله علیه وسلم تەنها بەسەر مێزەرەکەیەوە:**

لە عەمری کوڕی ئومەییەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (رَأَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ وَخُفَّيْهِ)[١٧٩]. واتە: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینیوە مەسحی کردووە بەسەر مێزەر و هەردوو خوفەکەیدا.

**ج- مەسحکردنی صلی الله علیه وسلم ناوچاوانی و مێزەرەکەی:**

لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَعَلَى الْعِمَامَةِ وَعَلَى الْخُفَّيْنِ)[١٨٠]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستنوێژی گرتووە مەسحی ناوچاوان و مێزەر و خوفی کردووە.

کەواتە هەر کەسێك مەسحی یەك تاڵ لە قژی یا دوو تاڵ یا بەشێك لەسەری بکات پێچەوانەی سوننەتی خۆشەویستە صلی الله علیه وسلم، بەڵکو دەبێت مەسحی هەموو سەری بەتەواوی بکات، یان مەسحی مێزەرەکەی بەتەواوی بکات، یا مەسحی ناوچاوانی بکات پاشان بە مەسحی مێزەرەکەی تەواوی بکات.

**٨- بێ ئاگایی لە شتنی پاژنە پێکان:**

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ – مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا)[١٨١]. واتە: ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان، دووجار یان سێ جار ئەمەی فەرموو.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: (وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّار). بەڵێنی ئاگری دۆزەخ بۆ پاژنە پێکان لەبەر ئەوەیە کە خاوێن ناکرێنەوە، ئەگەر مەسح بەس بوایە بەڵێنی سزای ئاگری دۆزەخ نەدەدرا بەو کەسانەی پاژنە پێکانیان ناشۆن.

---

179- أخرجه البخاري: ١/٢٤٦ وأحمد: ٤/١٣٩.

180- أخرجه مسلم: ١/١٧٤، والترمذي: (١٠٠).

181- أخرجه البخاري: ١/١١٧، ومسلم: ٣/١٣١.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شتنی پاژنە پێکان بەتەواوی واجبە.

بەداخەوە زۆربەی نوێژخوێنان گوێ نادەن بەم کارە لەکاتێکدا کە دەستنوێژ دروست نیە ئیللا بەمە نەبێت.

**٩- خوێندنی سورەتی (القدر) لەدوای دەستنوێژ:**

ئەمەش بیدعەیەکی تازە داهێنراوە هەندێ کەس لەدوای دەستنوێژەوە سێ جار دەیخوێنن.

پێشەوا سەخاوی دەڵێ: فەرمودەی خوێندنی سورەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١﴾ القدر: ١ . لەدوای دەستنوێژ هیچ بنەمایەکی نیە.

پێشەوا (السیوطی) دەڵێ: لە سەنەدەکەیدا ئەبو عوبەیدە هەیە..نەناسراوە[١٨٢].

**١٠- پەنجە نەخستنە نێوان پەنجەکانی دەست و پێ:**

ئەمەش زۆربەی نوێژخوێنان لێی بێ ئاگان کە یەکێکە لە تەواوی دەستنوێژ.

جمهوری زانایان رایان وایە پەنجە خستنە نێوان پەنجەکانی دەست و پێ لەکاتی دەستنوێژ گرتندا سوننەتە، بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: (أَسْبِغِ الوُضُوءَ، وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ)[١٨٣]. واتە: دەستنوێژێکی تەواو بگرەو پەنجە بخەرە نێوان پەنجەکانی دەست و پێتەوە.

مالیکیەکان دەڵێن: پەنجە خستنە نێوان پەنجەکانی دەست واجبە، بەڵام پەنجە خستنە نێوان پەنجەکانی سوننەتە.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەپەنجە توتەی نێوان پەنجەکانی دەشت.. لە مستەوورەدی کوڕی شەدادەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا تَوَضَّأَ خَلَّلَ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصَرِهِ)[١٨٤]. واتە: پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بینیوە بە پەنجە توتەی نێوان پەنجەکانی پێی دەشت[١٨٥].

---

182– الدين الخالص: (٢٧٧/١).

183– رواه أحمد والترمذي وابن ماجة عن لقيط بن صبرة – صحيح الجامع: (٧٢٩).

184– رواه أبو داود: (١٤٨)، والترمذي: (٤٠)، وأحمد وإبن ماجة بسند صحيح.

185– الدين الخالص: (٢٦٠/١).

**١١- بوونی هەر شتێك كە ببێتە ڕێگر لەبەردەم گەیشتنی ئاو:**

هەندێ لە ئافرەتان نینۆكیان بۆیە دەكەن و مادەی جوانكاری بەكاردەهێنن، بەڵكو هەندێ لەپیاوانیش لەكاتی دەستنوێژ گرتندا دەستیان ڕۆناویە.. ئەمەش دەبێتە ڕێگر لەبەردەم گەیشتنی ئاوی دەستنوێژەكە، پاشان بەتاڵ كردنەوەی.

بۆیە واجبە لەسەریان پێش ئەوەی دەستنوێژ بگرن هەموو ئەو شتانە لاببەن پاشان دەستنوێژەكەیان بگرن.

بەڵام ئەگەر پێویست بوو تەڕنەبێت وەك شوێنی برین و لەفاف و هەر شتێكی تری لەو جۆرەو بوونی هەر عوزرێكی شەرعی، ئەوە هیچ گوناهی ناگات ئەگەر تەنها مەسحی ئەو شوێنە بكات، ئەگەر ئاویش زیانی هەبوو ئەوە با تەیەممووم بكات.

بەڵام ڕەنگ كردن وەك بەكارهێنانی خەنە هیچ كاریگەریەكی نیە بۆ ڕاست و دروستی دەستنوێژ.

**١٢- مەسحی مل و گەردن:**

هەندێ كەس لەكاتی دەستنوێژدا مەسحی گەردن و ملیان دەكەن و باوەڕیان وایە كە سوننەتە .. لەگەڵ ئەوەشدا سوننەت نیە.

ئیبن قیم لە كتێبی(الهدی)دا دەڵێ: هەرگیز لەبارەی مەسحی گەردنەوە فەرمودەی صەحیح نەهاتووە.

بەڵام فەرمودەی: (مسح العنق أمان من الغل) واتە: مەسحی مل خۆپاراستنە لە خیانەت و ناپاكی. پێشەوا نەوەوی لە كتێبی (شرح المهذب)دا دەڵێ: ئەم فەرمودە(موضوع)ە واتە دروستكراوە، وتەی پێغەمبەری خوا نیە صلی الله علیه وسلم، لە شوێنێكی تردا دەڵێ: لەلایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هیچ شتێكی صەحیحی لەبارەوە نەهاتووە، دەڵێ: ئەمەش سوننەت نیە بەڵكو بیدعەیە[١٨٦].

[186]– نيل الأوطار: (١/ ٢٠٦)طبعة دار الحديث.

### ١٣- سوننەت لە وشك كردنەوەدا:

هەندێ لە نوێژخوێنان پێیان وایە وشك نەكردنەوەی ئەندامەكانی دەستنوێژ سوننەتە، لەگەڵ ئەوەشدا كە شتێكی ڕەوایە ئەوەی دەیەوێت با خۆی وشك بكاتەوە، ئەوەشی وازی لێ دەهێنێت هیچی تێدا نیە.

حەنەفیەكان و ثوری و مالیك و ئەحمەد رایان وایە خۆی وشك كردنەوە بە خاولی و هەر شتێكی تری لەو جۆرە لەدوای دەستنوێژەوە هیچی تێدا نیە، بەڵكو لە (در المختار)دا هاتووە كە لە ئادابەكانە.

بەڵام وتەی مەشهور لای شافیعیەكان ئەوەیە موستەحەبە وشك نەكردنەوەی ئەندامەكان، دەڵێن: موباحە، وە دەڵێن: موستەحەبە[١٨٧]... پوختەی قسە ئەوەیە وشك كردنەوەی یان وشك نەكردنەوە وەك یەكن.

### ١٤- دەستنوێژگرتن پێش شتنی دەستەكان:

ئەمەش یەكێكی ترە لە سەرپێچیە باوەكان لەناو نوێژخوێناندا بۆیە دەبینین یەكێ لەوان كاتێ لەخەو هەستا یەكسەر دەستنوێژ دەگرێت پێش ئەوەی دەستەكانی بشوات، یان دەستی دەخاتە ناو ئەو دەفرەوە كە ئاوی تێدایە و بەكاری دەهێنێ بۆ دەستنوێژەكەی.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی كردووە بە شتنی دەستەكان پێش ئەوەی بخرێنە ناو ئاوی دەستنوێژەوە دەفەرموێت: (إذا اسْتَيقَظَ أَحَدُكُم مِن نَومِهِ فلا يُدخِلُ يَدَهُ في الإناءِ حَتّى يَغسِلها ثلاثاً، فَإنَّ احدَكُم لايَدْري أيْنَ باتَت يَدُهُ)[١٨٨]. واتە: ئەگەر یەكێكتان لە خەو هەستا بادەستی نەخاتە ناو ئەو دەفرەوە كە ئاوی تێدایە و بەكاری دەهێنێ، تا سێ جار دەستی نەشوات، چونكە نازانێ دەستی بەركوێ كەوتووە كاتێك لە خەودا بووە.

### ١٥- شتنی پاش و پێش لەگەڵ هەموو دەستنوێژێكدا:

ئەمەش یەكێكی ترە لەو هەڵە باوانەی كە ڕوودەدات لەنێوان موسڵماناندا: دەبینین كەسێك لەوان بیروباوەڕی وایە هەردەبێت پاش و پێش بشۆردرێت لەگەڵ هەموو دەستنوێژێكدا، ئەگەرچی دەستنوێژیشی نەشكابێت.

---

[187]- الدين الخالص: (١/٢٧٨).

[188]- متفق عليه عن أبي هريرة – صحيح الجامع: (٣٣٢).

راستیەکەی ئەوەیە ئەگەر کاتی نوێژ هات پێش ئەوە ئەو کەسە خەوتبوو یان بای لێ بەر بوو بوویەوە ئەوە لەسەریەتی دەستنوێژ بگرێتەوەو پێویست بە شتنی شەرمگا ناکات، هەر کەسێك باوەڕی بە پێچەوانەی ئەمە هەبێ ئەوە بیدعەیەکی داهێناوە لە دینی خوادا، لەگەڵ ئەوەشدا بەشێکە لە وەسوەسە.

بەڵام ئەگەر موسڵمانێك ویستی لەپێش دەستنوێژ گرتن دەست بەئاو بگەیەنێت ئەوە لەو حاڵەتەدا واجبە لەسەری شوێنی میز و پیسیەکەی پاك بکاتەوە پاشان دەستنوێژەکەی بگرێت[189].

**١٦- وازهێنان لە دەستنوێژ دوای خواردنی گۆشتی وشتر:**

لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم أَأَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: إِنْ شِئْتَ فَتَوَضَّأْ وَإِنْ شِئْتَ فَلاَ تَوَضَّأْ. قَالَ: أَتَوَضَّأُ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ؟ قَالَ: نَعَمْ فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ. قَالَ أُصَلِّى فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أُصَلِّى فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ؟ قَالَ: لاَ)[190]. واتە: پیاوێك پرسی لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئایا دەستنوێژ بگرمەوە لە خواردنی گۆشتی مەڕ؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە ئەگەر ویستت دەستنوێژ بگرە، ئەگەر ویستیشت مەیگرە. وتی: ئەی دەستنوێژ بگرم لە گۆشتی وشتر؟ فەرمووی: بەڵێ، لە گۆشتی وشتر دەستنوێژ بگرەوە. وتی: نوێژ بکەم لە مۆڵگە یان پەچەی مەڕدا؟ فەرمووی: بەڵێ. وتی: نوێژ بکەم لە مۆڵگەی وشتردا؟ فەرمووی: نەخێر.

زانایان رایان جیاوازە لەسەر ئەحکامەکانی خواردنی گۆشتی وشتر، زۆربەیان رایان وایە دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە... لەوانە چوار خەلیفە راشیدەکان ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی رەزای خوایان لێ بێ، وە ئیبن مەسعود و ئوبەی کوڕی کەعب و ئیبن عەباس و (أبو درداء) و (أبو طلحة) و عامری کوڕی رەبیعە و ئەبو ئومامە، وە جەماوەری شوێنکەوتووان و مالیك و ئەبو حەنیفە و شافیعی و هەوەڵانیان.

---

[189]- مختصر مخالفات الطهارة والصلاة/ للشيخ عبدالعزيز السدحان: (ص: ١١).

[190]-أخرجه مسلم عن جابر بن سمرة: (٦٤/٤) (ح٩٧) حيض.

ئەوانەی رایان وایە کە دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی راهویە و یەحیای کوڕی یەحیا و ئەبو بەکری کوڕی منذر و ئیبن خوزەیە ئەمەش هەڵبژاردەی ئەبو بەکری بەیهەقی یە، لە فەرمودەناسانەوە گێراویانەتەوە بە گشتی، وە لە کۆمەڵێك لە هەوەڵانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم گێراویانەتەوە رەزای خوا لە هەموویان بێ فەرمودەی باسەکەیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان کە دەفەرموێت: (نَعَمْ فَتَوَضَّأْ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ). واتە: بەڵێ، دەستنوێژ بگرە لە گۆشتی وشتر.

لە بەرائی کوڕی عازبەوە هاتووە دەفەرموێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەربارەی دەستنوێژ گرتنەوە لە گۆشتی وشتر؟ فەرمانی کرد بە دەستنوێژ گرتنەوە، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیسحاقی کوڕی راهویە وتویانە: لەو بارەوە دەوو فەرمودەی صەحیح لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتوون، فەرمودەکەی جابری کوڕی سەمورە و بەرائی کوڕی عازب، ئەم مەزهەبە بەهێزترە لە رووی بەڵگەوە هەرچەندە جمهور پێچەوانەی ئەوەن.

جمهور وەڵامی ئەم فەرمودەیان بە فەرمودەکەی جابر داوەتەوە، کە ئەمە دواهەمینی ئەو دوو فەرمانەیە کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، وازهێنان لە دەستنوێژگرتن لەو شتانەی ئاگریان بەردەکەوێت، بەڵام ئەم فەرمودە گشتییە، فەرمودەی دەستنوێژ گرتنەوە لە گۆشتی وشتر تایبەتە، تایبەتیش لە پێشی گشتییەوەیە[191].

### ١٧- نوێژکردن دوای لەخەو هەستان بەبێ دەستنوێژ:

هەندێ لە نوێژخوێنان خەوێکی قوڵی لێ دەکەن، کاتێك هەستان لەخەو یەکسەر دەست دەکەن بە نوێژکردن بەبێ ئەوەی دەستنوێژ بگرنەوە چونکە باوەڕیان وایە خەوتن دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، وێنەی ئەم کەسە نوێژەکەی دروست نیە.

بەڵام وەنەوزدان و خەوبردنەوە نابێتە هۆی پوچەڵ بوونەوەی دەستنوێژ چونکە هەست و شعوری دەمێنێت.

---

[191]- مسلم بشرح النووي: (٦٥-٦٦).

**١٨- دەستنوێژ لەدوای دەستنوێژ بێ ئەوەی نوێژێ بکەوێتە نێوانیان:**

هەندێ لە نوێژخوێنان دەستنوێژ دەگرن پاشان دەستنوێژێکی تر دەگرنەوە بەبێ ئەوەی دەستنوێژی یەکەمیان پوچەڵ بووبێتەوە، یان نوێژێك کەوتبێتە نێوانیان... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: شەرع زانان رایان وایە ئەگەر کەسێك بە دەستنوێژی یەکەمەوە نوێژ بکات ئەوە رەوایە دەستنوێژ بگرێتەوە؟ بەڵام ئەگەر نوێژی نەکرد رەوا نیە دەستنوێژ تازە بکاتەوە، بەڵکو تازە کردنەوەی دەستنوێژ لە حاڵەتی وەهادا بیدعەیە و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم کە موسڵمانان لەسەری بوون لە ژیانی خۆیدا و لەدوای خۆشیەوە هەتا ئێستا.. وتەکەی تەواو بوو-رەحمەتی خوای لێ بێ- (مجموعه الفتاوی: ١٢/ ٦٧٣)[192].

**١٩- دەستنوێژ نەگرتن بەئاوی زەمزەم ( لە جیاتیدا تەیەمموم کردن):**

هەندێك لە نوێژخوێنان لەلایان قورسە بەئاوی زەمزەم دەستنوێژ بگرن لەجیاتیدا تەیەمموم دەکەن .. ئەم کارەش پێویستی بە روونکردنەوەیە.

خوای گەورە تەیەمومی بۆ کاتێك بڕیار داوە کە ئاو نەبێت یان عوزرێکی شەرعی هەبێت بۆ بەکارنەهێنانی، بەڵام لەکاتێکدا ئاو هەبێت -با ئاوی زەمزەمیش بێت- هەر دەبێت دەستنوێژی پێ بگرێت، لەو حاڵەتەدا ئەگەر تەیەمموم بکات نوێژەکەی دروست نیە.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەئاوی زەمزەم دەستنوێژی گرتووە.. بەڵکو دەستنوێژ گرتن و خۆپاك کردنەوە و خۆشتنیش بەئاوی زەمزەم هەر دروستە.

ئەو ئاوەی هەڵدەقوڵا لەنێوان پەنجەکانی دەستی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاوەڵان لێیان دەخواردەوەو دەستنوێژیان پێدەگرت و پۆشاکەکانیشیان پێدەشت و خۆشیان پێ پاك دەکردەوە... ئەمەش رویداوە، شتێکی ئاشکرایە ئەو ئاوە ئەگەر لە ئاوی زەمزەم بەرێز تر نەبێت بە هەرحاڵ لەویش کەمتر نیە.

---

192- مجموعة الفتاوی: (١٢/ ٦٧٣).

**٢٠- نەزانین بەچۆنیەتی شتنی ئەندامەکان:**

زۆر لە نوێژخوێنان پێیان وایە دەستنوێژ گرتن دروست نیە هەتا هەموو ئەندامێك سێ جار نەشۆردرێت.. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە!!!

لە ئیبن عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (تَوَضَّأَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَرَّةً مَرَّةً)[193]. واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەندامەکانی دەستنوێژی یەکجار یەکجار دەشت.

لە عبداللە کوڕی زەیدەوە رەزای خوایِ لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ)[194].

واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەندامەکانی دەستنوێژی دووجار دووجار دەشت.

عوسمانی کوڕی عەففان رەزای خوای لێ بێ داوای ئاوی دەستنوێژی کرد دەستەکانی سێ جار شت ئاوی لە دەم و لوتی وەردا، سێ جار دەم وچاوی شت، پاشان دەستی راستی هەتا ئانیشکی سێ جار شت، دەستی چەپیشی بە هەمان شێوە، ئینجا مەسحی سەری کرد، پاشان پێی راستی تا قولەپێی سێ جار شت، پێی چەپیشی بە هەمان شێوە، ئینجا فەرمووی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[195]. واتە: هەرکەس دەستنوێژ دەق وەك ئەم دەستنوێژەی من بگرێت، ئینجا هەستێ دوو رکات نوێژ بکات دالْغە لێ نەدات لە نوێژەکەدا، خوا لە هەموو گوناهەکانی رابردوو داهاتووی دەبورێت.

لەم فەرمودانەوە دەردەکەوێت کە شتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ یەکجار یەکجار یان دووجار دووجار یا سێ جار سێ جار سوننەتەو پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەو شێوانە دەستنوێژی گرتووە.

---

[193]– أخرجه البخاري: (٣١١/١) (ح ١٥٧).

[194]– أخرجه البخاري: (٣١١/١) (ح ١٥٨).

[195]– أخرجه البخاري: (٣١١/١) (ح ١٥٩).

**٢١- نەجوڵاندنی ئەنگوستیلە لەکاتی دەستنوێژدا:**

هەندێ جار دەبینین یەکێك لە نوێژخوێنان کاتژمێر یان ئەنگوستیلەی لە دەستدایە، کاتێك دەستنوێژی پێوە دەگرێت ئەنگوستیلەکەی ناجوڵێنێ کە رێگرە لەبەردەم گەیشتنی ئاو.

پێشەوا بوخاری دەڵێ: ئیبن سیرین لەکاتی دەستنوێژ گرتندا شوێنی ئەنگوستیلەی دەشت.

**٢٢- وتەی بە یەکتر دەڵێن: (زەمزەم) لەدوای دەستنوێژگرتن:**

خەڵکانێکی زۆر دەبینین لەدوای دەستنوێژگرتن بە یەکتر دەڵێن (زەمزەم) وەك پاڕانەوەیەك بۆ ئەوەی لە ئاوی زەمزەم بخۆنەوە.. ئەمەش لە سوننەتی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم هیچ بنەمایەکی نیە.

برای بەڕێز ئەگەر دوو کەس لە ماڵی خوا کۆبوونەوە لە ئاوی زەمزەم دەستنوێژیان گرت و لێیان خواردەوە ئایا بە یەکتر دەڵێن: (زەمزەم)؟! بێگومان نەخێر.. چونکە ئاوی زەمزەم لەبەر دەستیاندایە.

بەڵکو سوننەتە ئەوەیە ئەم دوعایە بخوێنرێت کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت بووەو هاتووە دەفەرموێت: هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بگرێت پاشان بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ). هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لەهەر کامیانەوە بیەوێت بچێتە ژوورەوە ئارەزووی خۆیەتی. پێشەوا (ترمذي) ئەمەشی بۆ زیادکردووە: (اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ)[١٩٦]. واتە: خودایە بمانخەیتە ریزی ئەو کەسانەی تەوبەکارن و ئەو کەسانەش کە خۆیان خاوێن رادەگرن.

**٢٣- بیروباوەڕ بەوەی کە سەرتاشین و نینۆك کردن دەستنوێژ دەشکێنن:**

ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە .. راستیەکەی ئەوەیە سەرتاشین و نینـۆك کـردن دەستنوێژ ناشکێنن.

---

[196]– أخرجه مسلم: (٢٣٤) الطهارة – والترمذي (٥٥).

**٢٤- بیرەوباوەڕ بەوەی کە مەسحی خوف تایبەتە بە وەرزی زستانەوە:**

ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە.. چونکە فەرمودەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هیچ وەرزێکیان دیاری نەکردووە، بەڵکو گشتین بۆ هەموو کاتێك.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ وَلَيَالِيهِنَّ وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ)[197]. واتە: مەسحی خوف بۆ موسافیر سێ رۆژ و سێ شەوە، بۆ نیشتەجێش شەو و رۆژێکە.

**٢٥- بیرەوباوەڕ بەزەرورەتی دەستنوێژ تازەکردنەوە کاتێ جەستە یان پۆشاك پیسی بەردەکەوێت:**

ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە ئەمە و ئەوە هیچ پەیوەندیەکیان پێکەوە نیە، ئەگەر دەسنوێژت هەبوو پیسەك بەر پۆشاکت یان جەستەت کەوت تەنها ئەوەندەت لەسەرە کە پیسیەکە لابەریت، بەوەش پاك دەبێتەوەو، چونکە شتێك رووی نەداوە ببێتە هۆی پوچەڵ بوونەوەی دەستنوێژەکە.

---

197- اخرجه مسلم واحمد والنسائي عن علي- صحيح الجامع: (٥١٨٩).

## ئەو سەرپێچیانەی دەستنوێژ پوچەڵ دەکەنەوە

لەناو زۆربەی نوێژخوێناندا وا باوە ئەم شتانەی باسیان دەکەین دەستنوێژ پوچەڵ دەکەنەوە، ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە بەویستی خوای گەورە روونی دەکەینەوە بۆتان:

**١ - ئێڵنجدان و رشانەوە:**

زۆر لە نوێژخوێنان وادەزانن ئێڵنجدان و رشانەوە دەستنوێژ پوچەڵ دەکەنەوە، ئیتر پڕ بەدەم بێت یان نا، بەڵگەشیان ئەم فەرمودەیە:

لە عائشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: **(مَنْ أَصَابَهُ قَيْءٌ أَوْ رُعَافٌ أَوْ قَلَسٌ أَوْ مَذْيٌ فَلْيَنْصَرِفْ فَلْيَتَوَضَّأْ ، ثُمَّ لِيَبْنِ عَلَى صَلاتِهِ وَهُوَ فِي ذَلِكَ لا يَتَكَلَّمُ)**[198]. واتە: هەرکەسێك رشایەوە یا خوێنی لوتی پژا یا (مذي) دەرچوو لە زەکەری با دەستنوێژ بگرێتەوە و نوێژەکەی هەر لەو شوێنەوە دەست پێ بکاتەوە کە پچڕاندویەتی بەڵام قسە نەکات.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرمودە زیاتر لە کەسێك عللەتیان داوەتە پاڵی چونکە لە ریوایەتی (إسماعیل کوڕی عیاش)ە ئەویش لە (ابن جریج)ەوە ریوایەتی کردووە کە حیجازیە، ریوایەتی ئیسماعیلیش لە حیجازیەکانەوە لاوازە.

ئیبن تەیمیە دەڵێ: ئێڵنجدان و رشانەوە نابنە هۆی پوچەڵ بوونەوەی دەستنوێژ.

**٢- دەستدان لە زەکەر:**

وتەیەك لەناو خەڵکدا بڵاوبۆتەوە ئەویش ئەوەیە گوایە دەستدان لە زەکەر دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، ئیتر بە شەهوەتەوە بێت یان نا.. ئەم فەرمودە (صەحیح)ەیان کردووە بە بەڵگە: **(مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ فَلْيَتَوَضَّأْ)**[199]. واتە: هەر کەسێك دەست بدات لە زەکەری با دەستنوێژ بگرێتەوە.

---

[198]- رواه ابن ماجة : (١/١٢٢١) والدار القطني: (١/ ١٥٣) بسند ضعيف.

[199]- رواه أحمد ومالك وأبو داود: ١٨١، والترمذي عن بسرة بنت الصفوان - صحيح الجامع: ٦٥٥٤.

حەنەفیەکان رایان وایە دەستدان لە زەکەر دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە، لەبەر فەرمودەکەی (طَلْقِ کوڕی علي) کە دەفەرموێت: پیاوێك لە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم پرسی ئەگەر کەسێك دەست بدات لە زەکەری خۆی دەستنوێژ بگرێتەوە؟ فەرمووی: (لا، إِنَّمَا هُوَ بَضْعَةٌ مِنْكَ)[200]. واتە: نەخێر، چونکە ئەویش پارچەیەکە لە خۆت.

شێخ ئەلبانی بەم شێوەیە تەعلیقی لەسەر داوەو دەڵێ: (إِنَّمَا هُوَ بَضْعَةٌ مِنْكَ). ئاماژەیەکی جوانی تێدایە، ئەویش ئەوەیە ئەو دەست لێدانەی دەستنوێژ ناشکێنێ ئەوەیە بە شەهوەتەوە نەبێت، چونکە لەم حاڵەتەدا بە بەشەکانی تری جەستە دەچوێنرێت کاتێ کە دەستیان لێ ئەدەی دەستنوێژ ناشکێنێت، بە پێچەوانەوەی ئەوەوە ئەگەر دەست لێدانەکە بەشەهوەتەوە بێت ئەوە بە ئەندامەکانی تری جەستە ناچوێنرێت، ئەمەش شتێکی ئاشکرایە وەك دەبینی، بەم پێیە فەرمودەکە نابێتە بەڵگە بۆ حەنەفیەکان کە دەڵێن: دەستدان لە زەکەر بەگشتی دەستنوێژ ناشکێنێت، بەڵکو دەبێتە بەڵگە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن: دەستدان لە زەکەر بەبێ شەهوەت دەستنوێژ ناشکێنێ، بەڵام ئەگەر بەشەهوەتەوە بوو ئەوە دەستنوێژ دەشکێنێ، بەپێی فەرمودەکەی (بسرة) بەو شێوەیە ئەو دووو فەرمودە کۆدەکرێنەوە، ئەمەش هەڵبژاردەی ئیبن تەیمیەیە لە هەندێ لە پەڕاوەکانیدا. خوای پەروەردگاریش زاناترە[201].

**٣- دەستدان لە پێستی ئافرەت بە رووتی:**

لە سەرەتاوە ئەم فەرمودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەکەمە دیاری بۆ براکانم: (إِنِّي لَا أُصَافِحُ النِّسَاءَ)[202]. واتە: من تەوقە لەگەڵ ئافرەتاندا ناکەم.

هەروەها لەوبارەوە دەفەرموێت: (لأَنْ يُطْعَنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُمْ بِمِخْيَطٍ مِنْ حَدِيدٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَّ امْرَأَةً لا تَحِلُّ لَهُ)[203]. واتە: ئەگەر بێت و یەکێکتان دەرزی یان سوژنێکی ئاسنین بە سەریدا بکرێت باشترە لەوەی کە دەستی بکەوێت لە شوێنی ئافرەتێك کە بۆی حەڵاڵ نەبێت.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تەوقەکردنی لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەمدا قەدەغەکردووە، تەنانەت بەرکەوتنی دەستیش.

---

[200]- رواه خمسة وصححه إبن حبان، وأبو داود: ١٨٢، والترمذي: ٨٢، والنسائي: ١٦٥.

[201]- تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ١٠٣).

[202]- رواه الترمذي والنسائي وابن ماجة عن أميمة بنت رقيقة - صحيح الجامع برقم: ٢٥١٣.

[203]- رواه الطبراني في الكبير عن معقل بن يسار، صحيح الجامع: ٥٠٤٠.

بەڵام باسەکە لێرەدا ئەوەیە ئایا دەستدان لە پێستی ئافرەت بەبێ پەردە دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە یان نا؟

لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ ثُمَّ يُصَلِّي وَلَا يَتَوَضَّأُ)[٢٠٤]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەندێك لە ژنەکانی خۆی ماچی دەکرد پاشان نوێژی دەکرد، بەبێ ئەوەی دەستنوێژ بگرێتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيُصَلِّي وَإِنِّي لَمُعْتَرِضَةٌ بَيْنَ يَدَيْهِ اعْتِرَاضَ الْجِنَازَةِ حَتَّى إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوتِرَ مَسَّنِي بِرِجْلِهِ). واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد منیش لەنێوان ئەو و قیبلەدا وەك جەنازە راکشابووم کاتێك نوێژی وتری دەکرد بە پێی خەبەری دەکرمەوە واتە پێی بەر پێستم دەکەوت. ئەم فەرموودە ئیمام (النسائي) ریوایەتی کردووە بە ژمارە: (١٠١/١). پێشەوا(الحافظ) لە (التلخيص)دا دەڵێ سەنەدەکەی صەحیحە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەستدان لە پێستی ئافرەت دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە.

هەر لە عائیشەوە هاتووە دەفەرموێت: (فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيْلَةً مِنْ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ فَوَقَعَتْ يَدِي عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ)[٢٠٥]. واتە: شەوێك لەسەر جێگای خەوتن پێغەمبەرم لێ وون بوو، منیش بۆی گەڕام لە مزگەوت بوو دەستم کەوت لە بەری هەردو پێی کە هەڵی چەقاندبووی لە سەجدەدا دەیفەرموو: خودایە ! من پەنا بە رازیبوونت دەگرم لە خەشم و قینت، پەنا بە لێبوردنەکانت دەگرم لە سزاکانت، پەنا دەگرم بەخۆت لە خۆت، من نازانم سوپاس و ستایشی تۆ بکەم، تۆ ئاوای کە ستایشی خۆتت کردووە.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: مەزهەبی ناوەند لێرەدا ئەو مەزهەبەیە بەپێی گشتی فەرموودەکان رای وایە دەستدان لە پێستی ئافرەت دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە ئیللا بەشەهوەت و ئارەزووەوە نەبێت[٢٠٦].

---

204– رواه أبو داود: ١٧٨/١ والنسائي: ١٠٤/١ بإسناد صحيح.

205– أخرجه مسلم: ٢٢٢/١ الصلاة ، والترمذي: ٣٤٩٣/٥.

206– نيل الأوطار: ٢٤٨/١ .

### ٤- دەرچوونی خوێن:

لەناو موسڵماناندا وا باوە دەرچوونی خوێن -لە غەیری ئەو شوێنەی کە عادەتە خوێنی لێ دێتە دەرەوە- دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، بەڵکو هەشیانە جیاوازی دەکات لە نێوان زۆرو کەمی خوێنەکەدا... ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە، چونکە (ئاثار)ی صەحیح لەو بارەوە بە سابتی هاتووە کە دەرچوونی خوێن لە غەیری ئەو شوێنەی کە عادەتە خوێنی لێ دێتە دەرەوە - با زۆریش بێت - دەستنوێژ پوچەڵ ناکاتەوە.

پێشەوا شەوکانی لە کتێبی (سیل الجرار)دا دەڵێ: بە هیچ شێوەیەك نەهاتووە کەسێك وتبێتی دەرچوونی خوێن دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە تاکو پێوەی پابەند بین بێگومان فەرمودەکەی سەلمان کاتێك لوتی پژا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: **(أحدث لك وضوءا؟)**. ئایا دەستنوێژت نەگرتەوە؟. هەرچەندە (الطبراني) لە**(معجم الكبير)**دا تەخریجی کردووە بەڵام لە سەندەکەیدا کەسانێکی درۆزن و فەرمودە دانەر هەن، وە فەرمودەکەی **(تميم الداري)**یش: **(الوضوء من كل دم سائل)**. واتە: دەستنوێژ گرتن لە هەموو خوێنێکی تەڕ. هەرچەندە **(السيوطي)** لە **(الجامع الصغير)دا لە (الدارقطني)**یەوە بەهێزی کردووە بەڵام لە سەندەکەیدا کەسانێك هەن نابنە**(الحجة)** بەڵگە.

بە ریوایاتی صەحیح سابت بووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە شیوێکدا دابەزی فەرمووی: **(من يحرسنا الليلة؟)**. واتە: ئەم شەو کێ پاسەوانیمان دەکات. پیاوێك هەستا لە **(المهاجرين)** کۆچەران و پیاوێکیش لە **(الأنصار)** یاریدەدەران هەستا، لە دەم کەلی شیوەکەوە شەویان دابەشکرد بۆ پاسەوانی یاریدەدەرەکە هەستا دەستی کرد بە نوێژکردن، پیاوێکی جولەکە تیرێکی تێ گرت و بریندارى کرد ئەویش تیرەکەی دەرهێناو هەر لەسەر نوێژکردن بەردەوام بوو، ئینجا تیری دووەمی تێ گرت و پێکای بەڵام ئەو نوێژەکەی نەبڕی و هەر بەردەوام بوو، پاشان تیری سێهەمی تێ گرت و پێکای ئەویش کڕنوش و سوژدەی بردو نوێژەکەی بەو شێوەیە تەواو کرد ئینجا هاوڕێکەی هەستان لەخەو کاتێ بە خوێنەوە بینی وتی: بۆ هەر یەکەم تیر خەبەرت نەکردمەوە؟ وتی: سورەتێکم دەخوێند پێم خۆش بوو تەواوی بکەم!!.

شتێکی ئاشکرایە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاگاداری ئەو حاڵەتە بوو بەڵام ئینکاری بەردەوام بوونەکەی نەکرد لەسەر نوێژکردن دوای ئەوەی بریندار کرا، ئەگەر خوێن دەستنوێژی پوچەڵ بکردایەتەوە ئەوا روونی دەکردەوە بۆ ئەویش و ئەو کەسانەش کە لەو غەزایەدا بەشداربوون... روونکردنەوەی هەر شتێك کە پێویست بێت روون بکرێتەوە دروست نیە دواخستنی.

بێگومان هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەناو جەرگەی جەنگدا جەستەو پۆشاکیان پیس دەبوو بەخوێن، بەڵام لە هیچ کامیانەوە ریوایەت نەکراوە کە دەستنوێژیان گرتبێتەوە، لێشیان نەبیستراوە کە دەستنوێژ پوچەڵ دەکاتەوە[٢٠٧].

لە حەسەنی بەصریەوە هاتووە دەفەرموێت: (مَا زَالَ الْمُسْلِمُونَ يُصَلُّونَ فِي جِرَاحَاتِهِمْ)[٢٠٨].
واتە: بەردەوام موسڵمانان بە برینەکانیانەوە نوێژیان دەکرد.

عومەری کوڕی خەتاب رەزای خوای لێ بێ کاتێ بریندار کرا نوێژی دەکرد و برینەکەشی خوێنی لەبەر دەڕۆیی[٢٠٩].

ئیبن تەیمیە دەڵێ: خوێن و رشانەوە و جگە لەوانەش لە پیسیەکان ئەگەر لە غەیری ئەو شوێنەوە بێت کە عادەتە لێی دەردەچێت دەستنوێژ پوچەڵ ناکەنەوە با زۆریش بن، ئەمەش مەزهەبی پێشەوایان شافیعی و مالیکە[٢١٠].

---

207– سبل الجرار للشوكاني: (١/٩٨–٩٩).

208– ذكره البخاري تعليقا: (١/٢٨١).

209– أخرجه مالك: (١/٩٣/٥١) والدار القطني: (ص: ٨١) بإسناد صحيح .

210– فتاوى الكبرى: ٥/٣٠٦ .

## هەڵەکانی خۆشتن بۆ لەشگرانی

**١- ژن و پیاو خۆیان ناشۆن هەتا ئاویان نەیەتەوە:**

ئەم هەڵەیەش باوە لەناو نوێژخوێناندا: هەیانە ئەگەر لەگەڵ هاوسەری کاری جووت بوونی ئەنجامدا هەتا ئاویان نەیەتەوە خۆی ناشوات و فەرمان بە خێزانیشی ناکات کە خۆی بشوات.

ئەم کارە لەسەرەتای ئیسلامدا شتێکی دروست بووە، بە بەڵگەی ئەم فەرمودە: (إِنَّمَا الْمَاءُ مِنْ الْمَاءِ)[211]. واتە: خۆشتن بە ناو پێویست دەبێت بە هاتنەوەی ئاوی مەنی. بەڵام بەم فەرمودە نەسخ بۆتەوە: (إذا الْتَقى الخِتانانِ وَغَابَتِ الحَشَفَةُ فقد وَجَبَ الغُسْلُ أنْزَلَ أوْ لَمْ يُنْزِلْ)[212]. واتە: ئەگەر هەردوو شوێنی خەتەنە بەیەك گەیشتن، سەری ئەندامی نێرینە چووە ژوورەوە بۆ ناو ئەندامی مێینە ئەوە خۆشتن واجب دەبێت، ئیتر ئاو بێتەوە یان نا.

هەر لەبەر ئەمەیە هەر کەسێك لەگەڵ هاوسەری کاری جووت بوونی ئەنجامدا و ئاوی نەهاتەوە ئەگەر خۆی نەشوات نوێژ بکات ئەوە نوێژەکەی بەتاڵە، چونکە لەشگرانە.

**٢- خۆشتن بە بەرچاوی خەڵکەوە:**

بێگومان شەرم و شکۆ لە ئیمانەوەیە.. بەڵام هەندێ جار دەبینین هەندێك لە موسڵمانان پۆشاکی حەیا لەبەر دادەکەنن و بەڕووتی لە شوێنە گشتیەکان و گوێی رووبار و دەریاچە و کانی و ئاوەکاندا بۆ نوێژی جومعە و لەشگرانی بە بەرچاوی خەڵکەوە خۆیان دەشۆن بەبێ ئەوەی هەست بە شەرم و حەیا بکەن.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەواڵی ئەوەی داوە کە خۆ حەشارنەدان لەکاتی میزکردندا لە هۆکارەکانی سزای گۆڕە، ئەی دەبێ بۆ خۆشتن بە بەرچاوی خەڵکەوە چۆن بێت؟!!.

---

211– أخرجه مسلم وأبو داود عن أبي سعيد – صحيح الجامع: (٢٣٢٩).

212– رواه الطبراني في الأوسط وأبو داود عن ابن عمرو– صحيح الجامع: (٣٨٦).

### ٣- بیروباوەڕ بەوەی کە دوو خۆشتن کۆنابنەوە:

زۆربەی موسڵمانان بێ ئاگان لەوەی لەکاتێکدا کە جومعە و جەژن کۆدەبنەوە بۆ هەردووکیان یەك خۆشتن بەسە دوو نیەت کۆدەبنەوە، بە هەمان شێوە یەکجار خۆشتن بەسە بۆ لەشگرانی و نوێژی جومعە، لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت: (وَإِنَّمَا لِكُلِّ امرِىءٍ مَا نَوَى)[٢١٣]. واتە: بێگومان هەموو کەسێك بە گوێرەی نیەت و مەبەستی خۆی پاداشت و تۆڵەی بۆ دەنوسرێت.

### ٤- بیروباوەڕ بەوەی کە خۆشتن بری دەستنوێژ ناگەوێت:

عائیشە رەزای خوای لێ بێ دەفەرموێت: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الْغُسْلِ)[٢١٤]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دوای خۆشتن دەستنوێژی نەدەگرتەوە.

(أبو بكر کوڕی العربي) دەڵێ: زانایان لەوەدا ناکۆکیان نیە کە دەستنوێژ دەچێتە ناو خۆشتنەوە، نیەتی خۆپاککردنەوە لە لەشگرانی دێ بەسەر خۆپاککردنەوە لە بێ دەستنوێژیداو بێ دەستنوێژیەکەی ناهێڵێ، چونکە رێگرەکانی لەشگرانی زۆرترن لە رێگرەکانی بێ دەستنوێژی، کەواتە کەم دەچێتە ناو زۆرەوە، نیەتی گەورەکە بچوکەکەش دەگرێتەوە[٢١٥].

### ٥- خۆشتن بە ناتەواوی:

ئەمەش بە تایبەتی ئەوانە دەگرێتەوە کە قەڵەون چونکە هەندێك لە بەشەکانی جەستەیان وەك سنگ و سکیان لە کاتی خۆشتندا ئاوەکە دێتە خوارەوە بە سەریاندا بەبێ ئەوەی لای خوارەوەیان تەڕ بکات، بێگومان لەم حاڵەتەدا خۆشتن ناتەواوە.

---

[213]- مُتَفَقٌ عَلَيْهِ عن عمر بن خطاب رضي الله عنه.

[214]- صحيح سنن النسائي: (٤٣٠).

[215]- نقلا من فق السنة- السيد سابق: (ص: ٥٧).

**٦- دواخستنی خۆشتن لەشەودا هەتا کاتی خۆر هەڵهاتن:**

هەندێ ئافرەت ئەگەر لە شەودا مێردەکەی لەگەڵی جووت بوو یان لە (حیض) سوڕی مانگانە پاك بوویەوە خۆشتن دوا دەخات هەتا کاتی خۆر هەڵهاتن ئینجا خۆی دەشوات و نوێژی بەیانی دەگێڕێتەوە، ئەمەش بە یەکدەنگی زانایان حەرامە... چونکە واجبە لەسەری پەلە بکات لە خۆشتندا، وە نوێژەکەی لەکاتی خۆیدا بکات:

﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ ﴾ النساء: ١٠٣. واتە: ئینجا کاتێك نوێژەکانتان بەجێهێنا ئەوسا یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو وە لەسەر تەنیشتتان، جا هەر کاتێك دڵ ئارام بوون ئەو کاتە نوێژەکانتان بە رێکوپێکی بکەن، بەراستی نوێژ هەمیشە لەسەر ئیمانداران فەرزێکی کات بۆ دیاریکراوە.

نوێژ دواخستن لە کاتی دیاریکراوی خۆی بە قەستی لە تاوانە گەورەکانە... ئەگەر مێردەکەی بەوەی زانی ئەوە ئەویش بەشدارە لەو گوناهەدا ئەگەر شارەزای حوکمەکەی بێت، بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە شارەزای حوکمەکەی نەبوو ئەوە عوزری هەیە لەبەر نەزانین هەتا شارەزا دەبێت.

**٧- سەر داپۆشین لەکاتی خۆشتندا:**

هەندێ کەس ئەگەر یەکێ لەوان بیەوێت خۆی بشوات شتێك دەدات بەسەریدا بۆ ئەوەی قژی تەڕ نەبێت. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە شوێنێکی داپۆشیوە واجبە بشۆرێت، وە خۆ شتنەکەشی ناتەواوە.

## سەرپێچییەکان لەکاتی تەیەمموم کردندا

**١- بیروباوەڕ بەوەی کە لەشگران نابێ نوێژ بکات هەتا خۆی نەشوات:**

هەندێ کەس وادەزانن لەشگران هەرگیز بۆی نیە نوێژ بکات هەتا خۆی نەشوات ئەگەر ئاو نەبوو خۆی پێ بشوات ئەوا پێویستە لەسەری چاوەڕێ بکات هەتا ئاوی دەست دەکەوێت، بەوەش چەند نوێژێکی دەکەوێت بەسەردا کە نەیکردوون، بەڵکو چەند رۆژێك بەو شێوەیە چاوەڕێ دەکات بەبێ ئەوەی نوێژەکانی بکات، ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە.. چونکە لەشگران ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت دەبێت تەیەمموم بکات پاشان نوێژەکەی بکات، ئەگەر لەدوایدا ئاوی دەستکەوت ئەو کاتە خۆی بشوات و نوێژ بکات ئەو نوێژانەش نەگێڕێتەوە کە بە تەیەمموم کردوونی.

لە (عمران کوڕی حصین)وە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم لە سەفەرێکدا بووین پیاوێکی بینی دووری گرتبوو نوێژی لەگەڵ خەڵکدا نەکرد، جا پێی فەرموو: (يَا فُلَانُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ فِي الْقَوْمِ). واتە: ئەی فلان کەس چی وای لێ کردیت لەگەڵ خەڵکدا نوێژ نەکەیت؟. وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تووشی لەشگرانی بووم و ئاو نیە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: (عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ)[٢١٦]. واتە: تەیەمموم بەسەر زەوی بکە، چونکە ئەوەت بەسە. واتە: جێگەی ئاوت بۆ دەگرێتەوە.

**٢- هەڵە لە چۆنیەتی تەیەمموم کردندا:**

هەندێ کەس ئەگەر ئاویان دەست نەکەوت چۆن دەستنوێژ دەگرن بەو شێوەیەش تەیەمموم دەکەن بەگڵ مەسحی سەر و پێکان و دەستەکان و دەم و چاویان دەکەن، ئەمەش هەڵەیەو پێچەوانەی سوننەتە.. هەندێکیان وادەزانن تەیەمموم کردن کەمتر لە دوو پیاکێشان دروست نیە و بە یەك پیاکێشان وەرناگیرێ، هەندێکی تریان وادەزانن مەسح کردنی دەستەکان دەبێت هەتا ئانیشکەکان بێت.. ئەمەش هەمووی هەڵەیە.

---

[216]- أخرجه البخاري: ٣٤٨/١ ومسلم: (٣١٢/١) مساجد .

پێشەوا ئیبن قەیم لە (کتێبی زاد المعاد)دا دەڵێ: هیچ فەرمودەیەکی (صەحیح) نەهاتووە کە بیسەلمێنێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی تەیەمموم کردندا دوو جار دەستی کێشابێ بە زەویداو هەتا ئانیشکەکانی مەسح کردبێت، بەڵکو تەنها یەکجار هەردوو دەستی دەکێشا بەزەویدا[217].

**لەم فەرمودەوە چۆنیەتی تەیەمموم کردنمان بۆ روون دەبێتەوە:**

لە عەمارەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، دەفەرموێت: لەشگران بووم ئاوم دەست نەکەوت، خۆم لە خۆڵ وەرداو نوێژەکەم کرد، پاشان ئەوەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، فەرمووی: (إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا: فَضَرَبَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِكَفَّيْهِ الْأَرْضَ، وَنَفَخَ فِيهِمَا ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ)[218]. واتە: تەنها ئەمەت بەس بوو، دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەردوو لەپی دەستی کێشا بەزەویداو فوی لێکردن و مەسحی دەم و چاو و هەردوو دەستی پێکرد.

**٣- تەیەمموم کردن لەکاتێکدا کە ئاو هەبێت:**

دەبینین هەندێ کەس ئەگەر دەستنوێژەکەیان شکا یەکسەر لە جێگا نوێژەکەدا دەست دەکێشێ بەزەویدا یان بە فەرشەکەدا پاشان تەیەمموم دەکات و نوێژەکەی بە جەماعەت دەکات.

ئەمەش بە زۆری لە شوێنە قەرەباڵغەکاندا ڕوودەدات وەك لە ماڵی خوا.. ئەو کەسە وادەزانێت ئەگەر تەیەمموم بکات و بگات بە نوێژی جەماعەتدا چاکتر و گەورەترە لەوەی بڕوات دەستنوێژەکەی بگرێتەوە و دوا بکەوێت.

ئەم کارە دروست نیە، بەڵکو نوێژەکەشی بەتاڵە، چونکە لەکاتێکدا تەیەمموی کردووە کە ئاو هەبووە.... خوای گەورە ڕوخسەتی نەداوە بە تەیەمموم کردن ئیللا لە لەکاتێکدا نەبێت کە ئاو نەبێت یان عوزرێکی شەرعی هەبێت بۆ بەکارنەهێنانی.

---

217– زاد المعاد لابن قيم الجوزية: ١/ ١٩٢.

218– اخرجه البخاري: (١/٩٨) ومسلم: (١/١٩٢– ١٩٣).

# ئەو سەرپێچیانەی پەیوەندیان بە بانگدانەوە هەیە

**١- بیروباوەڕ بەوەی کە بانگدان واجب نیە:**

هەندێ کەس وادەزانن بانگدان سوننەتە یان موستەحەبە، لەگەڵ ئەوەدا کە فەرزی کیفایەیە.

لە ئەبو دەردائەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (مَا مِنْ ثَلَاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ لَا يُؤَذَّنُ وَلَا تُقَامُ فِيهِمْ الصَّلَاةُ إِلَّا اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ)[٢١٩]. واتە: ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون لە گوندێکدا بانگیان نەداو بەکۆمەڵ نوێژیان نەکرد، ئەوە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بانگ و قامەت واجبە، چونکە وازهێنان لێی دەبێتە هۆی زاڵ بوونی شەیتان بۆیە پێویستە لێی دوور بکەونەوە.. ئەوانەی دەڵێن واجبە زۆربەی (العترة)کان و (عطاء) و (أستطخري) و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، لە (البحر)دا هاتووە موجاهید و ئەوزاعیش راو بۆچونیان لەسەر ئەمەیە.

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: ئەو کەسەی لای وابێت کە بانگدان سوننەتە بە مانای ئەوەی ئەوانەی وازی لێ دەهێنن پێی گوناهبار نابن و سزای لەسەر نیە ئەوە هەڵەیە، چونکە دروشمی (دار الإسلام)ە واتە ئەو شوێنەی کە ئیسلام حوکمی تێدا دەکات... بە فەرمودەی صەحیح سابت بووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خوێن حەڵاڵ کردنی قەومێکی دەبەستەوە بە بانگدانەوە کاتێك بیوستایە بدات بەسەر ناوچەیەکی کافراندا نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان چاوەڕێی دەکرد بزانێت بانگ دەدرێ، ئەگەر بانگ بدرایە نەیدەدا بەسەریاندا، بەڵام ئەگەر بانگ نەدرایە ئەوا دەیدا بەسەریانداو غەزای دەکردن[٢٢٠].

پێشەوا شەوکانی رەئی لەسەر ئەوەیە کەبانگدان واجبە. (سیل الجرار: ١/ ١٩٦).

---

[219]- حسن. أخرجه أحمد ( ٥ / ١٩٦ و ٦ / ٤٤٦ )، الثمر المستطاب: ١/ ١١٧.

[220]- الفتاوى الكبرى: (٢/ ٤١).

٢- بیروباوەڕ بەوەی کەسی تەنیا نابێت بانگ بدات:

هەندێ لە نوێژخوێنان بیروباوەڕیان وایە ئەگەر کەسێك تەنیا بوو نابێت بانگ بدات، ئیللا لەگەڵ کۆمەڵدا نەبێت، ئەمەش هەڵەیە.

لە ئەبو سەعیدی خودریەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرمووم: (إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلَاةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ فَإِنَّهُ لَا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ وَلَا إِنْسٌ وَلَا شَيْءٌ إِلَّا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[٢٢١]. واتە: من دەتبینم حەزت لە ئاژەڵداری و دەرو دەشتە، جا هەرکاتێك لەناو مەڕەکانتا یان لەناو دەشتەکەتدا بوویت کاتی نوێژ هاتە پێشەوە بەدەنگی بەرز بانگ بدە، چونکە جنۆکە و ئادەمیزاد و هەرچی شت هەیە کە دەنگی بانگبێژیان بیست، رۆژی دوایی شایەتی بۆ دەدەن.

هەروەها دەفەرموێت: (يَعْجَبُ رَبُّكَ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ رَاعِي غَنَمٍ فِي شَظِيَّةٍ بِجَبَلٍ يُؤَذِّنُ لِلصَّلَاةِ وَيُصَلِّي، فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: انْظُرُوا إِلَى عَبْدِي هَذَا يُؤَذِّنُ وَيُقِيمُ لِلصَّلَاةِ يَخَافُ مِنِّي فَقَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَأَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ)[٢٢٢]. واتە: پەروەردگاری بەدەسەڵات و بەتوانات (معجب)ە بەو شوانەی بە بناری شاخێکەوە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ، کاتێ کە کاتی نوێژ هات بۆخۆی بانگ دەدات و نوێژ دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن بانگ دەدات و نوێژ دەکات، ئەو لە من دەترسێت، ئەوا منیش لێی خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە.

پێشەوا شەوکانی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر شەرعیەتی بانگدان بۆ کەسێك کە تەنیا بێت بەڵگەیە بۆ رەدی ئەو کەسانەی کە دەڵێن: شەرعیەتی بانگدان تایبەتە بە کۆمەڵەوە، ئەوەشی لێ وەردەگیرێت کە بانگدان هۆکارێکە بۆ لێی خۆش بوونی تاوان[٢٢٣].

---

221- أخرجه البخاري عن أبي سعيد الخدري: ١٠٤/٢ (ح٦٠٩).

222- رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٥٧/٤) وَأَبُو دَاوُد: (١٢٠٣/٢) ورجال إسناده ثقات.

223- نيل الأوطار: (٤٢/٢)ط. دار الحديث.

٣- وتەی بانگدان بۆ نوێژە فەوتاوەکان سوننەت نیە:

هەندێ کەس نازانن و بێ ئاگان لەوەی کە بانگدان بۆ نوێژە فەوتاوەکان سوننەتە، سابت بووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خەبەری بویەوە خۆر دەرکەوت بوو بە بیلالی فەرموو: (يَا بِلَالُ قُمْ فَأَذِّنْ بِالنَّاسِ بِالصَّلَاةِ فَتَوَضَّأَ فَلَمَّا ارْتَفَعَتْ الشَّمْسُ وَابْيَاضَّتْ قَامَ فَصَلَّى)[٢٢٤]. واتە: ئەی بیلال هەستە بانگ بدە بۆ خەڵك با نوێژەکەیان بکەن، هەتا لێ بوونەوە لە دەستنوێژ گرتن خۆر بەرز بوویەوە ئەوکاتە هەستان نوێژیان کرد بە جەماعەت.

ئەم فەرموده بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە بانگدان بۆ نوێژە فەوتاوەکان سوننەتە، پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا باسێکی بەم ناوەوە داناوە (باب: الأذان بعد الذهاب الوقت). واتە: باسی: بانگدان دوای رۆشتنی کاتی نوێژ.

٤- وتەی بانگ و قامەت بۆ ئافرەتان سوننەت نیە:

عیللەتی ئەم وتەیان ئەوەیە گوایە دەنگی ئافرەت عەورەتە، ئەم بیروباوەڕەش بەتایبەتی لەناو خەڵکی عەوامدا باوە، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە(آثار)ی سابت هەواڵی ئەوەی داوە و لەبارەوە هاتووە کە عائیشە رەزای خوای لێ بێ بانگی داوەو قامەتی کردووەو بەرنوێژیشی بۆ ئافرەتان کردووەو لە ناوەڕاستیاندا وەستاوە[٢٢٥].

پێشەوا شەوکانی لە کتێبی (سیل الجرار : ١/ ١٩٧)دا رەئی لەسەر ئەوەیە کە واجبە لەسەریان بانگ بدەن و قامەت بکەن چونکە ئافرەتان هاوشانی پیاوانن.

پێشەوا نەوەوی لە کتێبی (المجموع : ٣/ ١٠٠)دا دەڵێ: ئەگەر بانگ بدەن دەنگیان بەرز نەکەنەوە کەراهەتی نیە چونکە زیکری خوای گەورەیە[٢٢٦].

---

224- أخرجه البخاري: ٢/ ٧٩ ومسلم:١٨٣.

225- حسن: أخرجه البيهقي: ٤٠٨/١ والحاكم : ٢٠٣/١- ٢٠٤.

226- نقلا من أخطاء المصلين: (محمد صديق المنشاوي) (ص: ٥٨).

## سەرپێچیەکانی بانگ بێژان

بانگبێژان و نوێژخوێنان لەکاتی بانگدان و قامەت کردندا چەند سەرپێچیەك دەکەن... خوشك و برا بەڕێزەکانم ئەوەش ئێوە و هەندێ لە سەرپێچیەکانی بانگبێژان:

**١- داهێنانی هەندێ وشە و پاڕانەوە:**

هەندێ لە بانگبێژان لە خۆیانەوە هەندێ وشە و پاڕانەوەیان داهێناوە لە پێش بانگ و دوای بانگەوە دەیلێن بەهیچ شێوەیەك لە سوننەتدا نەهاتوون.

ئیبن تەیمیە دەڵێ: بێجگە لە وشەکانی بانگ.. لاواندنەوە و تەسبیح و پاڕانەوە بە دەنگی بەرز و جگە لە مانەش کە لە شوێنی بانگداندا دەکرێن، سوننەت نین بەلای ئیمامە شەرع زانەکانەوە، بەڵکو هەندێك لە هاوەڵانی پێشەوایان مالیك و شافیعی ئەحمەد ئەمانەیان خستۆتە ڕیزی ئەو بیدعانەوە کە ناپەسەندن و کەراهەتیان هەیە[٢٢٧].

**٢- قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز لەدوای بانگ:**

یەکێ لە بیدعە خراپەکان ئەوەیە هەندێك لەدوای بانگ بەدەنگی بەرز قورئان دەخوێنن ئەمەش تەشویشە بۆ نوێژخوێنان و قەدەغەکراوە... ئەبو سەعیدی خودری ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: (اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَسْجِدِ فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ فَكَشَفَ السِّتْرَ وَقَالَ أَلَا إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ فَلَا يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضًا وَلَا يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ أَوْ قَالَ فِي الصَّلَاةِ)[٢٢٨]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەمزگەوتدا ئیعتیکافی کردبوو، گوێی لێ بوو بەدەنگی بەرز قورئانیان دەخوێند پەردەکەی لاداو فەرمووی: ئاگادار بن ئێوە هەمووتان لە پەروەردگاری خۆتان دەپاڕێنەوە، با هەندێکتان ئازاری هەندێکتان نەدات، کاتێك قورئان دەخوێنن یان نوێژ دەکەن دەنگ بەرز مەکەنەوە بەسەر یەکتردا.

---

[227]- الاختيارات الفقهية: (٣٢٣/٥).

[228]- أخرجه أبو داود عن أبي سعيد: (١٣٣٢) - صحيح الجامع: (٢٦٣٩).

**٣- بانگدان بە لاواندنەوە و ئاوازەوە:**

یەکێك لە بیدعە خراپ و سەرزەنشت کراوەکان بانگدانە بە گۆرانی و ئاوازەوە کە دەبێتە هۆی گۆڕینی وشە و جوڵەو وەستانەکان و زیادو کەم کردنیان بۆ پاراستنی ئیقاعی گۆرانیەکان، ئەمەش حەڵاڵ نیە هەروەك بۆ قورئان خوێندن حەڵاڵ نیە، گوێی لێ گرتنیشی حەرامە، چونکە خۆچواندنە بە کرداری لەڕێ دەرچووان لە حاڵەتی لەڕێ دەرچوونیاندا، دەرچوونە لە چاکە و سوننەتی بانگدان.

**٤- بانگدانی شاهانە:**

بریتیە لە بانگدان بە یەك دەنگ لەلایەن چەند بانگ بێژێکەوە.

شێخ عەلی (محفوظ) دەڵێ: یەکێکی تر لە بیدعەکان بانگدانە بە کۆمەڵ کە ناسراوە بە (الأذان السلطاني) بانگی شاهانە یان (أذان الجوق)، هیچ ناکۆکیەك نیە لەسەری کە شتێکی خراپ و ناشایستەیە، چونکە لاواندنەوە و گۆرانی تێدایە و دەرچوونە لە وتەکانی بانگی شەرعی و شێوازی زمانی عەرەبی بە شێوەیەکی ناشیرین کە جەستەی زیندوو دێنێتە لەرزین و، ئازاری رۆحی پاك دەدات (هیشام کوڕی عبدالملك) یەکەم کەس بوو دایهێنا[٢٢٩].

**٥- زیادکردنی وشەی (سیدنا):**

هەندێ لە بانگبێژان لەکاتی بانگدان و قامەت کردندا وشەی (سیدنا) بۆ شایەتومان زیاد دەکەن، دەڵێن: (أشهد أن سيدنا محمداً رسول الله)..ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کە لە پیاوچاکانی پێشینەوە هاتووە.

شێخ (محمود خطاب السبكي) دەڵێ: لە هیچ کەسێکەوە سابت نەبووە کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و خەلیفە راشدینەکاندا وشەی (سیدنا)یان بۆ شایەتومان زیادکردبێ لەکاتی بانگ و قامەتدا: (أشهد أن سيدنا محمداً رسول الله)، ئەگەر وشەی (سیدنا) شەرعی و سوننەت بوایە بێگومان کەسیان وازیان لێ نەدەهێنا، وە رازی بوون بە واز لێ هێنانی، کەواتە وتنی بیدعەیەو واز لێ هێنانی سوننەتە[٢٣٠].

---

[229]- الإبداع في مضار الابتداع للشيخ علي محفوظ: (ص: ١٧٦).

[230]- الدين الخالص: (٢/ ٩٣).

٦- سڵاواتدان لە دوای بانگ بەدەنگی بەرز:

سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە دوای بانگ بەدەنگی بەرز وەك عادەتی زۆر لە بانگبێژانی ئەم سەردەمە بیدعەیەو پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

پێویستە ئەم بیدعەیە وازی لێ بهێنرێت و دەست بەوەوە بگیرێت کە سوونەتە، چونکە هەموو داهێنراوێك لە دینی خوادا دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیداو هیچ خێرو پاداشتێکیشی نیە، بەڵکو ئەگەر ئەو کارەی کرد بە نیەتی ئەوەی کە لە خوا نزیك بێتەوە ئەوە گوناهبارە[231].

پێشەوا (الشعراني) دەڵێ: مامۆستاکەمان دەڵێ: ئەم سڵاواتدانە کە بانگبێژان بەدەنگی بەرز لە دوای بانگ دەیڵێن نە لە سەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم و نە لە سەردەمی خەلیفە راشدینەکاندا نەکراوە، بەڵکو بیدعەی سەردەمی (الروافض) شیعەکانە لەکاتێکدا کە حوکمی میصریان دەکرد[232].

٧- بانگدانی بە پەلە:

ئەمەش هەڵەیەکە زۆر لە بانگبێژان دەیکەن بە شێوەیەك کە گوێگران فریای ئەوە ناکەون وشەکانی بانگ بەدوایاندا بڵێنەوە.

شێخ (محمود خطاب السبكي) دەڵێ: سوننەتە بانگبێژ بە شێنەیی بانگ بدات و نێوانی دوو وشە جیاکاتەوە بە وەستانێکی کەم، لەکاتی قامەت کردندا پەلە بکات[233].

٨- وتنی: (حي على الخير العمل):

یەکێکی تر لەو سەرپێچیانەی کە هەندێك لە بانگبێژان دەیکەن وتنی: (حي على الخير العمل)، (حي على الخير العمل)ە لەدوای (حي على الصلاة) و (حي على الفلاح)ەوە.

---

[231]- الدين الخالص: (٢/ ٨٨).

[232]- كشف الغمة: (١/ ٨٠).

[233]- الدين الخالص: (٢/ ٦٣).

ئەم زیادەیە یەکێکە لە بیدعە تازە داهێنراوەکان کە سابت نەبووە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کەسی فێرکردبێ ئەمە بڵێ.

پێشەوا بەیهەقی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەم وتەیە -(حي على الخير العمل)- سابت نەبووە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم کە بیلال و (أبا محذورة)ی فێرکردبێ ئەمە بڵێن، بۆیە ئێمەش ئەم زیادەمان پێ ناخۆشە، خوای گەورە پشتیوان بێت[٢٣٤].

٩- وازهێنان لە سەر و مل وەرگێڕان بەلای راست و چەپدا:

زۆربەی بانگبێژان وازیان هێناوە لە سەر و مل وەرگێڕان بەلای راست و چەپدا لەکاتی وتنی: (حی على الصلاة)و (حی على الفلاح)دا، چونکە وادەزانن کە سوننەت نیە.

ئەوەی هاتووەو پشتگیری ئەوە دەکات کە سوننەتە ئەم فەرمودەیە:

لە (أبی جحیفه)ەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (أَتَيْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ فِي قُبَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ أَدَمٍ فخرجَ بلالٌ فأذنَ، فكنتُ أَتَتَبَّعُ فَمَهُ هاهنا وهاهنا). واتە: لە مەککە چوومە خزمەت پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەناو چادرێکی سوری چەرمیندا بوو، بیلال بانگی فەرموو لەو کاتەدا سەرنجی دەمیم دا کاتێ گەیشتە (حي على الصلاة ، حي على الفلاح) لێرەو لەوێ بەلای راست و بەلای چەپدا ئەم لاو لای دەکرد. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (رأيتُ بلالاً خرجَ إلى الأبطحِ فأذنَ، فلما بلغَ حَيَّ على الصلاة، حَيَّ على الفلاحِ لَوَى عُنُقَهُ يمِيناً وشِمالاً ولم يَستدِر)[٢٣٥]. واتە: بیلالم بینی لە (الأبطح) بانگی دەفەرموو، کاتێ گەیشتە (حي على الصلاة ، حي على الفلاح) ملی وەردەگێڕا بەلای راست و چەپدا، بەڵام خۆی وەرنەدەگێڕا.

پێشەوایان شافیعی و (ثوري) و ئەوزاعی فەرمویانە: موستەحەبە وەرگێڕانی سەر و مل بەم لاو لادا، بەڵام نەسوڕێتەوە بەدەوری خۆیدا و سنگ و قاچی لە قیبلە وەرنەگێڕێ جا ئیتر لەسەر زەوی بێت یان لەسەر هەر شتێکی تر.

---

234– سنن الكبرى للبيهقي: (٤٢٥/١).

235– أخرجه البخاري مع الفتح: ١٣٥/٢ (٦٣٤).

سەر و مل وەرگێڕان بەلای ڕاست و چەپدا چەند شێوازێکی هەیە.. ڕاسترینیان ئەوەیە سەر و مل وەرگێڕێ بەلای ڕاستداو بڵێ: (حي على الصلاة، حي على الصلاة)، سەر و مل وەرگێڕێ بەلای چەپداو بڵێ: (حي على الفلاح، حي على الفلاح)[٢٣٦].

**١٠- ڕوو نەکردنە قیبلە:**

هەندێ لە بانگبێژان لەکاتی بانگ و قامەتدا ڕووناکەنە قیبلە، ئەمەش هەڵەیەکی تریانە، چونکە لەکاتی بانگ و قامەتدا ڕوو کردنە قیبلە سوننەتە.

**١١- بڕینی پیتی(هاء)ی (الصلاه) ، پیتی(حاء)ی (الفلاح):**

هەندێ لە بانگبێژان دەڵێن: (حی علی الصلا) بە بێ (هاء)، هەروەها (حي على الفلا) بەبێ (حاء).

ئەمەش لە ئەنجامی نەزانینە بە زدرورەتی پابەندبوون بە وشەکانی بانگەوە بە تەواوی.

**١٢- ئینکاری کەسێ پێش بەیانی بانگ بدات:**

هەندێ لەبانگبێژان بێ ئاگان لەوەی کە سوننەتە دوو بانگ بدرێت (کە تایبەتە بە نوێژی بەیانی) ، ئەو دوو بانگەش سوننەتن ئەگەر جیاوازی بکرێ لە نێوان بانگی یەکەم و دووەمدا هەتا خەڵك لێیان تێك نەچێت ... لە فەرمودەی (متفق علیه)دا لە ئیبن عومەرەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ)[٢٣٧]. واتە: بیلال شەوی دەمێنێت بانگ دەدات، جا ئێوە بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبن ئومی مەکتوم بانگ دەدات.

ئەم بانگەیان لە کاتی خۆیدا بووە و بانگەکەی پێشەوە تەنها تایبەتە بە نوێژی بەیانیەوە نەك نوێژەکانی تر.

---

236- الدين الخالص: (٢/ ٦٢).

237- صحيح سنن أبو داود: ٥٠٠، صحيح الجامع: ٤٢٠ .

**١٣- پەنجە نەخستنە ناو گوێ:**

سوننەتە بانگبێژ کاتێ کە بانگ دەدات سەری پەنجەی بخاتە گوێچکەیەوە لەبەر فەرمودەکەی ئەبو جوحەیفە رەزای خوای لێ بێ کە دەڵێت: (رَأَيْت بِلَالًا يُؤَذِّن وَيَدُورُ وَيُتْبِعُ فَاهُ هَاهُنَا وَهَاهُنَا وَإِصْبَعَاهُ فِي أُذُنَيْهِ)[٢٣٨]. واتە: بیلالم بینی بانگی دەفەرموو بەدەم بانگدانەوە سەری بەم لاو لای خۆیدا دەچەرخاند و دوو پەنجەی نابووە ناو هەردوو کونە گوێی خۆی.

پێشەوا (ترمذي) دەڵێ: ئەم فەرمودە (حسن صحيح)ە لەلایەن ئەهلی زانست و زانیاریەوە کاری پێ دەکرێت، شتێکی رەوایە لایان ئەگەر بانگبێژ پەنجە بخاتە ناو هەردوو کونی گوێیەوە. پێشەوا ئەوزاعی دەڵێ: هەروەها لەکاتی قامەت کردنیشدا[٢٣٩].

پێشەوا (حافظ) لە کتێبی (فتح)دا دەڵێ: زانایان فەرمویانە: ئەمە دوو سوودی تێدایە:

یەکەم: بۆ ئەوەی دەنگی بەهێز بێ.. کە ئەمە فەرمودەی لاوازی لەسەرە.

دووهەم: نیشانەیەکە بۆ ناسینەوەی بانگبێژ بۆ ئەو کەسانەی لە دوورەوە دەیبینن یان کەڕن و نابیستن.

پێشەوا (الترمذي) دەڵێ: زانایان فەرمویانە: پەسەند و موستەحەبە بانگبێژ لەکاتی بانگداندا دوو پەنجەی بخاتە هەردوو کونە گوێیەوە[٢٤٠].

**١٤- زیادکردنی پیتی(و) لەکاتی وتنی (الله اكبر)دا:**

هەندێ لە بانگبێژان لەکاتی وتنی: (الله اكبر)دا (واو)ێکی بۆ زیاد دەکەن و لە جیاتی(اللهُ اكبر) دەڵێن: (الله و اكبر) ئەمەش یەکێکە لە سەرپێچیە خراپەکان.

**١٥- سوربوون لەسەر بانگدان لەلایەن کەسێکەوە دەنگی ناخۆش بێت:**

ئەمەش هەرگیز ناگونجێ، چونکە بانگدان دروشمی ئیسلامە، یەکەم شتێکە کە ئەهلی نامە ئاسمانیەکان دەیبیستن لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، بۆیە چاکتر وایە کەسێکی دەنگ خۆش دیاریی بکرێت بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی بێزارکردنی ئەوانەی گوێیان لێیەتی.

---

[238]- أخرجه أحمد والترمذي وقال: (حسن صحيح).صحيح جامع الترمذي: (١/ ٣٧٥) (١٩٧).

[239]- الفتح الرباني: (٣/ ٤٢)صفة الأذان – تحفة الأحوذي: (١/١٧٦).

[240]- فتح الباري: (٢/ ١٣٧).

# سەرپێچیەکانی ئەوانەی گوێیان لە بانگە

**١- لەدوای بانگبێژەوە وشەکانی بانگ ناڵێنەوە:**

یەکێك لە هەڵە باوەکان سەرقاڵ بوونی نوێژخوێنانە بە قسەکردنی دنیاییەوەو لەدوای بانگبێژەوە وشەکانی بانگ ناڵێنەوە لەکاتێکدا پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هانی ئوممەتەکەی داوە لەسەر وتنەوەی دەفەرموێت: (إِذَا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ)[241]. واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی گوت ئێوەش ئەوە بڵێن.

**٢- زیادکردنی (سیدنا) لەکاتی پاڕانەوەدا:**

هەندێ کەس لەدوای بانگ دەڵێن: «آتِ سَيدَنَا مُحَمَّدًا..». ئەمەش هەڵەیە.. چونکە سوننەت وایە بڵێن: (آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ..). ئەلبانی دەربارەی زیادکردنی «سیدنا» دەڵێ: **(شاذ)**ەو هەندێ لە نوسەرەکان زیادیان کردووە سەیری (إرواء الغليل: ١/ ٢٦١) بکە.

**٣- وتەی ئەوانەی دەڵێن: « اللهم إني أسألك بحق هذه الدعوة »:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی پاڕانەوەی دوای بانگدا دەڵێن: **«اللهم إني أسألك بحق هذه الدعوة»...** سوننەت وایە بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ...).

**٤- وازهێنان لە سڵاواتدانی دوای بانگ:**

زۆر لە نوێژخوێنان ساناترین مافی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم بەسەر ئوممەتەکەیەوە لەبیرکردووە ئەویش: سڵاواتدانی دوای بانگە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا سَمِعْتُمْ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا ثُمَّ سَلُوا اللَّهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَأَلَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ)[242]. واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی فەرموو ئێوەش ئەوە بڵێن، پاشان سڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە هەر کەسێ سڵاواتێ لەسەر من بدات خوای گەورە دە جار ڕەحمەت دەڕێژێت بە سەریا، داوای (الوسیلە)م بۆ بکەن کە مەنزڵگایەکە لە بەهەشتدا دانراوە بۆ یەکێك لە بەندە هەڵبژێردراوەکانی خوا، هیوادارم کە من بم، هەرکەسێ داوای (الوسیلە)م بۆ بکات شەفاعەتی من بۆ ئەو حەڵاڵ دەبێ.

---

[241]– أخرجه البخاري: (٢/١٠٨) ومسلم: (١٠) الصلاة.

[242]– أخرجه مسلم: (١/ ٤) والترمذي: (٢/ ٢٨٢).

لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[٢٤٣]. واتە: هەر کەسێك گوێی لە بانگ بوو ئەم دوعایە بخوێنێت: (اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ). شەفاعەتی من بۆ ئەو حەلاڵ دەبێت.

**٥- زیادکردنی«والدرجة العالیة الرفیعة» کاتی پاڕانەوەی دوای بانگ:**

سوننەتە وەهایە تەرکی زیادکردنی ئەم پاڕانەوەیە بکرێت لەدوای بانگ، چونکە لە سوونەتدا نەهاتووە، بەڵکو سوننەتە ئەو دوعا (صەحیح)ە بەتەواوی بخوێنرێت کە پێشتر باسکرا.

**٦- زیادکردنی«إنك لا تخلف المیعاد» لەکاتی پاڕانەوەی دوای بانگ:**

سوننەتە وەهایە تەرك بکرێت چونکە لە هیچ فەرمودەیەکی (صەحیح)دا نەهاتووە.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: خوێندنی «شاذة» چونکە لە کۆی رێگاکانی فەرمودەکەدا لە (علی کوڕی عیاش)وە نەهاتووە.

**٧- وتەکەیان:** «اللهم صل أفضل الصلاة علی أسعد مخلوقاتك»:

ئەم پاڕانەوەیە لە دێهاتەکاندا باوە لە دوای بانگ بەدەنگی بەرز لە مزگەوتەکاندا دەیڵێن.. ئەمەش بیدعەیەکی خراپەو تەشویش دروست دەکات لەسەر نوێژخوێنان لە مزگەوتدا.

**٨- وتنەوەی بانگ لە سەرئاو:**

پێویستە لەسەر موسڵمان لەسەرئاو بە هیچ شێوەیەك قسە نەکات لە فەرمودەدا هاتووە: (مَرَّ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ)[٢٤٤]. واتە: جارێك پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی بەئاو دەگەیاند پیاوێك بەلایدا تێپەڕی سڵاوی لێ کرد ئەویش وەڵامی نەدایەوە.

---

243– أخرجه البخاري: (١/١٦٢) والترمذي: (١/ ٤١٣–٤١٤).

244– أخرجه مسلم: (١/١٩٤) والترمذي: (١/ ٩٠) وأبو داود: (١/٦١).

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: زیکر و یادی خوا پێش دەرچوون  لە سەرئاو کەراهەتی هەیە، هەروەها قسەکردنیش مەگەر لەبەر حاڵەتی زۆر پێویست، تەنانەت ئەگەر پژمی لە دڵی خۆیدا بڵێ: (الحمد لله). با زمانی نەجولێنێ[245].

**٩- وتەکەیان: «الله اكبر والعزة لله»:**

زۆر لە نوێژخوێنان هەرکە گوێیان لە یەکەم «الله اكبر »ی بانگ بوو دەڵێن: «الله اكبر والعزة لله» یان دەڵێن: «الله اكبر على أولاد الحرام»،.

(شقيرى) دەڵێ: وتەکەیان: «الله أعظم، والعزة لله، أو الله اكبر على كل من ظلمنا، الله اكبر على أولاد الحرام». لەکاتی«الله اكبر »ی بانگدا ئەمانە هەموویان نەزانین و بیدعەیە، سوننەت ئەوەیە بانگبێژ چی فەرموو ئەوە بڵێن، پاشان سڵاوات بدەن لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم[246].

**١٠- پەخشی بانگ بە رادیۆ یان تەسجیل:**

زۆر لە نوێژخوێنان لە دێهاتەکان و مزگەوتە بچوکەکاندا- لە ئەنجامی نەشارەزاییان لە دین- دەبینین لەکاتی بانگدا رادیۆکانیان دەکەنەوە بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵك بە کاتی نوێژ، ئەمەش پێچەوانەی ئەم فەرمودەیە: (إِذَا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ لَكُمْ أَحَدُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْبَرُكُمْ)[247]. واتە: هەرکاتێ کاتی نوێژ بوو با کەسێ لە خۆتان بانگتان بۆ بدات و کامتان بەتەمەن لەهەمووتان گەورەتر بوو ئەوە بەرنوێژیەکەتان بۆ بکا.

لە باسی مەرجەکانی پێشنوێژدا قسەی لەسەر دەکەین.

---

245– روضة الطالبين: (٦٦/١) .

246– سنن والمبتدعات:(ص: ٥١) ط. مكتبة السنة.

247– أخرجه البخاري: ( ٦٢٨-٦٣٠) ومسلم: ( ٦٧٤ ).

**١١- پێش بانگبێژ کەوتن:**

یەکێکی تر لە هەڵەکانی نوێژخوێنان ئەوەیە کاتێ گوێیان لە بانگ دەبێت لە پێش بانگبێژەوە دەیڵێن بەتایبەتی لەکاتی(الله اکبر، الله اکبر)ی کۆتاییدا، زۆربەی خەڵك مەگەر کەسانێ خوا رەحمیان پێ بکات دەڵێن: (لا اله الا الله). پێش بانگبێژ دەکەون، سەرپێچی لەم فەرموده دەکەن: (إِذَا سَمِعْتُمْ النِّدَاءَ فَقُولُوا....)[٢٤٨]. واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی وت ئێوەش ئەوە بەدوایا بڵێنەوە.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وەڵامدانەوەی پەیوەست کردووە بە دوای بیستنی بانگەوە.

**١٢- ماچکردنی سەری هەردوو پەنجە گەورەو هێنانی بە چاواندا:**

یەکێکی تر لەو بیدعانەی کە هەندێ خەڵك تێی کەوتوون ئەوەیە کاتێك بانگبێژ وتی: (أشهد أن محمداً رسول الله). سەری هەردوو پەنجە گەورەیان ماچ دەکەن و دەیهێنن بە چاویاندا، بیروباوەڕیان وایە ئەوەی ئەو کارە بکات چاوی ژان ناکات و کوێر نابێت... ئەم (أثر)ەیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان کە لە (خضر)ەوە ریوایەت کراوە، دەفەرموێت: **(من قال حين يسمع المؤذن يقول: أشهد أن محمدا رسول الله، مرحبا بحبيبي وقرة عيني محمد بن عبد الله صلى الله عليه وسلم، ثم يقبل إبهاميه ويجعلهما على عينيه لم يعم، ولم يرمد أبدا)**[٢٤٩].

پێشەوایان شەوکانی و سەخاوی دەربارەی ئەم (أثر)ە دەڵێن: صحیح نیە.

---

[248]– أخطاء المصلين: (ص: ٥٣).

[249]– المقاصد : (٣٨٤) وكشف الخفاء: (٢/٢٠٦).

(صحيح سنن أبو داود: ٥٠٠، صحيح الجامع: ٤٢٠ .

## سەرپێچیەکان لەکاتی قامەت کردندا

**١- وازهێنان لە پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت:**

نزا و پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت سونەتە، چونکە کاتی گیرابوونی پاڕانەوەیە، لەهەمان کاتدا زۆر لە نوێژخوێنان بێ ئاگان لەو پاڕانەوەیە لەو کاتەدا، بەڵکو هەندێ جاریش سەرقاڵی قسەی دنیایین.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (**الدُّعَاءُ لا يُرَدُّ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ**)[٢٥٠]. واتە: نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت نادرێتە دواوە.

لە ریوایەتی (حاکم)دا دەفەرموێت: (**الدُّعاءُ مُسْتَجابٌ بيْنَ النِّدَاءِ وَالإِقَامَةِ**)[٢٥١]. واتە: نزاو پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت وەرگیراوە.

**٢- نەوتنەوەی وشەکانی قامەت:**

نوێژخوێن لەسەریەتی وشەکانی قامەت بڵێتەوە وەك چۆن وشەکانی بانگی لەگەڵ بانگبێژ دەوتەوە بە گشتی ئەم فەرمودەیە: (**إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ...**). واتە: کاتێ گوێتان لە بانگ بوو بانگبێژ چی فەرموو ئێوەش ئەوە بڵێن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قامەتی بە بانگ ناو بردووە دەفەرموێت: (**بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ لِمَنْ شَاءَ**)[٢٥٢]. واتە: **لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژی سونەت هەیە، هەرکەس ئارەزووی لێ بێت.**

**٣- وتەکەیان لەکاتی قامەتدا: « قائمين لله طائعين »:**

ئەمەش هەڵەیە چونکە شتێکی لەو جۆرە لە سونەتدا نەهاتووە.

**٤- وتەکەیان: « اللهم أحسن وقوفنا بين يديك »:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی قامەتدا«اللهم أحسن وقوفنا بين يديك»، ئەم کارە لە سونەتدا نەهاتووە.

---

[250]– رواه أحمد والترمذي وأبو داود ، عن أنس – صحيح الجامع: (٣٤٠٨) .

[251]– رواه الحاكم عن أنس – وحسنه الألباني في صحيح الجامع برقم: (٣٤٠٦).

[252]– متفقٌ عَلَيْهِ عن عبدالله بن مغفل – صحيح الجامع: (٢٨٥٠).

بەڵکو سوننەت وایە نوێژخوێن شوێنی ئەو کەسە بکەوێت کە قامەت دەکات، ئەو چی وت بیڵێتەوە، دوای ئەوەی وتی: (لا اله الا الله). ئینجا سڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم، پاشان بڵێ: (اللّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ...)[253].

**٥- قامەتکردن بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە پێشنوێژ:**

پێشنوێژ یەکەم خاوەن هەقە بۆ قامەت، بۆیە شتێکی باش نیە بەبێ مۆڵەتی ئەو قامەت بکرێت.

**٦- قامەتکردن لەکاتی رۆشتنداو پشت لە قیبلە:**

هەندێ لە بانگبێژان لەکاتی رۆشتندا قامەت دەکەن، یان هەندێ جار پشتیان لە قیبلەیە ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەتە.

**٧- زیادکردنی وشەی سیدنا ، لەکاتی قامەت کردندا:**

هەروەها ئەمەش هەمان حوکمی زیادکردنی وشەی((**سيدنا**))ی بۆ کاتی بانگدان هەیە.

زیادەیەکە نە سوننەتە و نە شەرعیە، ئەگەر سابت بوایە یەك صەحابە وازی لێ نەدەهێنا رەزای خوایان لێ بێ.

**٨- وتەکەیان: (أقامها الله وأدامها):**

هەندێ کەس لەکاتی قامەتدا دەڵێن: (أقامها الله وأدامها). بەڵگەیان فەرمودەیەکی لاوازە، ئەویش ئەوەیە گوایە کاتێ بیلال فەرمویەتی: (قد قامت الصلاة). پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمویەتی: (أقامها الله وأدامها). لە ریوایەتێکی تردا فەرمویەتی: (وجعلني من صالحي أعمالها – أو– أهلها). ئەمەش فەرمودەیەکی لاوازە و نابێتە (الحُجة)بەڵگە.

**٩- بیروباوەڕ بەوەی کە قامەت کردن تەنها مافی بانگبێژە:**

ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە.. کەسێ لەوان ئەم فەرمودە دەکات بە بەڵگە: (من أذّن فهو يقيم). واتە: ئەوەی بانگ دەدات دەبێ ئەوەش قامەت بکات. کە فەرمودەش لاوازەو نابێتە (الحُجة)بەڵگە.

---

[253]– وهذه فتوى من فتاوى اللجنة الدائمة، نقلا من مجلة البحوث الأسلامية: (٦/ ٢٤٨–٢٤٩).

زانایان یەك دەنگن لەسەر ئەوەی دروستە بێجگە لە بانگبێژ قامەت بکات، بەڵام لەوەدا رایان جیاوازە کە ئایا بانگبێژ لەپێش ترە یان نا، پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد رایان وایە کە بانگبێژ لەپێش ترە بەڵگەیان ئەو فەرمودەیە کە پێشتر باسکرا.

حەنەفیەکان و زۆربەی خەڵکی کوفە و حیجاز و مالیك و ئەبو (ثور) رایان وایە جیاوازی نیە لە نێوان بانگبێژ و کەسێکی تردا[254]، ئەمەش رای هەڵبژاردەیە.

**١٠- داهێنانی هەندێك قسەو پاڕانەوە:**

هەندێك لە نوێژخوێنان دوای قامەتکردن لە خۆیانەوە هەندێ پاڕانەوە و قسەیان داهێناوەو دەیڵێنەوە لە سوننەتدا نەهاتوون.. بەڵکو زۆربەشیان هەتا دوای هاتنە ژوورەوەی پێشنوێژ بە دەنگی بەرز دەپاڕێنەوە و قسەدەکەن، دەبنە هۆی بێزارکردنی ئەوانەی لە دەوریاندان، بەڵکو لە بازنەی خشوع دەیانباتە دەرەوە، ئەم جۆرە کارانەش هەموویان پێچەوانەی سوننەتی خۆشەویستن صلی الله علیه وسلم.

**١١- وتەکەیان: «حقاً لا إله إلا الله»:**

زۆر لە نوێژخوێنان کاتێك بانگبێژ گەیشتە: (لا اله الا الله). دەڵێن: «**حقاً لا إله إلا الله**». ئەمەش هەڵەیە... سوننەت وایە بانگبێژ چی دەڵێ لەکاتی بانگ و قامەتدا ئەوانیش ئەوە بڵێنەوە.

**١٢- هەستانەوەی خەڵك لەکاتی وتنی: (قد قامت الصلاة)دا:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان هەڵناسنەوە بۆ نوێژ تاکو ئەو کەسەی قامەت دەکات نەگاتە: **(قد قامت الصلاة)**... وادەزانن ئەم کردەوەیە لە سوننەتدا هاتووە.. ئەمەش هەڵەیە.

پێشەوا مالیك رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: لەوبارەوە هیچ شتێکم نەبیستووە بەڵکو وای دەبینم بە پێی توانای خەڵکەکە بێت هەیانە قەڵەوەو هەشیانە سوك و سۆڵە بۆیە ناتوانن وەك یەك هەستن بۆ نوێژ. (الموطأ ص : ٦٧).

---

254–الدين الخالص: ٨١/٢.

**١٣- دووباره كردنەوەی قامەت:**

هەندێ لە نوێژخوێنان كاتێ قامەت كرا بۆ نوێژ، ئەگەر كارێك هاتە پێشەوە چەند ساتێك سەرقاڵی كردن قامەتەكە دووبارە دەكەنەوە.. ئەمەش هەڵەیە. راستیەكەی ئەوەیە تەنها قامەتی یەكەم بەسە.

پێشەوا بوخاری باسێكی داناوە بەم ناونیشانە: (پێشنوێژ ئیشێكی بۆ هاتە پێش دوای قامەت كردن) لە ئەنەسەوە هاتووە دەڵێت: (أُقِيمَتْ الصَّلَاةُ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُنَاجِي رَجُلًا فِي جَانِبِ الْمَسْجِدِ فَمَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ حَتَّى نَامَ الْقَوْمُ)[255]. واتە: جارێك قامەت كرا بۆ نوێژ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو كاتەدا قسەی لەگەڵ پیاوێك دەكرد لەلایەكی مزگەوتەكەوە، نەهات بۆ نوێژ هەتا خەڵكەكە خەویان لێ كەوت.

كەواتە بە پێی ئەم فەرموودە گفتوگۆی كەسێك لەگەڵ یەكێكی تر بە ئامادەبوونی نوێژی جەماعەت دروستە، نووسەر لەباسی مۆڵەت وەرگرتندا بەناوی: (درێژەی پێكەوە چپەكردن) باسێكی داناوە، هەروەها فەرموودەكە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە دروستە ماوە بكەوێتە نێوان قامەت كردن و نوێژەوە ئەگەر پێویست بێت، بەڵام ئەگەر پێویست نە بێت ئەوە كەراهەتی هەیە.

پێشەوا (حافظ) ئیبن حەجەر لە (فتح)دا دەڵێ: ئەوەی بۆم دەركەوتووە ئەوەیە ئەم حوكمە پەیوەندی بە پێشنوێژەوە هەیە، چونكە ئەو كەسەی لەدوای پێشنوێژەوە نوێژ بكات ئەگەر كارێكی پێویستی هەبوو ئەو كەسانەی تر كە لەدوای پێشنوێژەوە نوێژدەكەن پابەند نین پێیەوە بە پێچەوانەی ئیمامەوە، بەڵام لەبەرئەوەی كە قسەكردنی نێوان قامەت و نوێژدابەستن گشتیسەو پێشنوێژ و نوێژخوێنانیش دەگرێتەوە، دانەر بابەتەكەی بە گشتی هێناوەو پەیوەستی نەكردووە بە پێشنوێژەوە[256].

255- أخرجه البخاري عن أنس: ٦٤٢.

256- البخاري مع الفتح: (٢/١٤٦- ١٤٧).

## سەرپێچیە گشتیەکان لە نوێژدا

**١- تەرکی نوێژ لەلایەن یەکێك لە ژن و مێردەوە:**

ئەمەش بەڵایەکە زۆر لە موسڵمانان لێی تێ نەگەیشتوون.

ئەو کەسەی بە ئارەزووی خۆی تەرکی نوێژ بکات ئەوە لە راسترین وتەی زانایاندا پێی کافر دەبێت و کوفری گەورەیە ئەگەر باوەڕی بەوە هەبێت کە واجبە، بەڵام ئەگەر باوەڕی بە واجبی نەبێت ئەوە لەلای هەموو زانایان کافرە، لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: (بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصَّلاةِ)[٢٥٧]. واتە: جیاوازیی نێوان پیاوی موسڵمان و هاوەڵ و شەریك بۆ خوا دانەر نوێژ نەکردنە.

هەروەها فەرمودەی: (العَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ)[٢٥٨]. واتە: ئەو بەڵێنەی لە نێوان ئێمەی موسڵمان و ئەواندا هەیە نوێژە، ئەوەی تەرکی بکات کافرە.

پێویستە لەسەر کاربەدەستی موسڵمانانان داوا بکات لەو کەسەی نوێژ ناکات تەوبە بکات، ئەگەر تەوبەی نەکرد دەبێ بکوژرێت.. بە پێی ئەو بەڵگانەی هاتوون لەوبارەوە.

هەروەها واجبە: دەنگی لێ وەربگیرێ و پەیوەندی لەگەڵدا ببچرێنرێت، ئەگەر خێزانی نەبوو کەس کچی خۆی نەداتێ، ئەگەر ژنی هەبوو نوێژی دەکرد پاشان تەرکی کرد ژنەکەی لێ بسەنرێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئامۆژگاری بکرێ و بانگ بکرێتەوە بۆ لای خوا بەڵکو تەوبە بکات و بگەڕێتەوە.

**٢- ئافرەت ئەو نوێژە ناکات لەکاتەکەیدا پاك بووەتەوە:**

هەروەها ئەمەش سەرپێچیە.. چونکە واجبە لەسەر ئافرەت هەرکە پاك بوویەوە -بۆ نمونە ئەگەر کاتی عەسر بوو- یەکسەر خۆی بشوات و نوێژی عەسر بکات... هەروەها -ئەگەر کاتی بەیانی بوو- نوێژی بەیانی بکات، بە بەڵگەی ئەم فەرمودە:

---

[257]- أخرجه مسلم وأبو داود الترمذي عن جابر- صحيح الجامع: (٢٨٤٨).

[258]- رواه أحمد والترمذي والنسائي عن بريدة - صحيح الجامع: (٤١٤٣).

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنْ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ)[259]. واتە: هەر کەسێ بگات بە رکاتێکی نوێژی بەیانیدا پێش ئەوەی خۆر هەڵبێ ئەوە نوێژی بەیانی بۆ حساب کراوە، هەر کەسێ بگات بە رکاتێکی نوێژی عەسردا پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت ئەوە نوێژی عەسری بۆ حسابە.

**٣- کاتی نوێژێك دێتە پێشەوە ئافرەت دەکەوێتە حەیزەوە:**

ئەمەش پەیوەندی بە سەرپێچیی پێشووەوە هەیە.. ئاگاداربن ئەویش ئەوەیە کاتی نوێژێك دێتە پێشەوە ئافرەت نوێژەکەی نەکات -لەپڕ دەکەوێتە حەیزەوە- کاتێك پاك بوویەوە ئەو نوێژە ناگێڕێتەوە، وادەزانێت ئەو نوێژەش حوکمی ئەو نوێژانەی هەیە کە نەیکردوون لەکاتی حەیزدا.

**٤- خستنە سەریەکی لێوەکان و نەجولاندنی زمان لە نوێژدا:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان یەکێ لەوان لەکاتی قورئان خوێندن یان لەکاتی زیکردا لێوەکانی دەخاتە سەریەك و هەرگیز زمانی ناجولێنێ.. هەندێ جاریش کاتێ دەخوێنێ دەمی داخراوە.. بەلام ئەمە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

پێشەوا بوخاری لە (أبی معمر)ەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: وتمان بە خەبابی کوڕی ئەرەت: (أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ قَالَ نَعَمْ قُلْنَا بِمَ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ ذَاكَ قَالَ بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ)[260]. واتە: ئایا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا قورئانی دەخوێند؟ وتی: بەڵێ، وتمان: ئێوە بەچیدا دەتانزانی؟ وتی: ریشی دەجولا. بێگومان ئەمەش بەڵگەیە بۆ جولاندنی زمانی چونکە هەتا دەم و زمان نەجولێنرێت ریشیش ناجولێت.

---

[259]- متفقٌ عَلَيْه عن أبي هريرة – صحيح الجامع: (٥٩٩٢).

[260]- البخاري مع الفتح: (٢/٢٤٤-٢٤٥).

**٥- پەنجە خستنەناو پەنجە:**

ئەم سەرپێچییەش لەزۆر نوێژخوێنان روویداوە: ئاگاداربن ئەویش پەنجە خستنەناو پەنجەیە جا ئیتر لە رێگای مزگەوتەکاندا بێت یان لەکاتی چاوەڕوانیدا بێت بۆ نوێژ لە مزگەوت، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەم کارەی قەدەغەکردووە دەفەرموێت: (إذا توضّأ أحدكم في بيته ثمّ أتى المسجد كان في صلاة حتّى يرجع فلا يقل هكذا، وشبّك بين أصابعه)[٢٦١]. واتە: کاتێ کەسێکتان لە ماڵەوە بەچاکی دەستنوێژ دەگرێ و دەچێ بەرەو مزگەوت ئەو کەسە لە نوێژدایە هەتا دەگەڕێتەوە ماڵەوە، با ئاوا نەکات: پەنجەکانی خستەناو پەنجەی.

لە ریوایەتێکی تردا هاتووە دەفەرموێت: (إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَلَا يُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ فَإِنَّهُ فِي صَلَاةٍ)[٢٦٢]. واتە: کاتێ کەسێکتان بەچاکی دەستنوێژ دەگرێ و دەچێ بەرەو مزگەوت، با پەنجە نەخاتە ناو پەنجەی، چونکە ئەو کەسە لە نوێژدایە.

**٦- چاونوقاندن بەبێ هۆیەکی پێویست:**

ئیبن قەیم رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: لە سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەبووە لە نوێژدا چاوەکانی نوقاندبێ بەڵام لە پاڕانەوە لەتەحیاتدا چاوی دەبڕیە ئەو پەنجەی کە ئاماژەی پێدەکرد رووەو قیبلە، لەوە زیاتری تێ نەدەپەڕاند.

شەرع زانان رایان جیاوازە لەسەر ئەوەی کە ئایا کەراهەتی هەیە یان نا؟ پێشەوا ئەحمەد و جگە لەویش دەڵێن: کەراهەتی هەیە، چونکە لە کردەوەی جوەکانە، بەڵام کۆمەڵێکی تریان بە موستەحەبیان داناوە دەڵێن: کەراهەتی نیە، چونکە نزیکترە بۆ بەدەستهێنانی خشوع کە مەبەست و نهێنی و رۆحی نوێژە.

راستیەکەی ئەوەیە بوترێت: ئەگەر چاوکردنەوە خشوعی ناو نوێژ تێك نەدات ئەوە چاوکردنەوە چاکترە، بەڵام ئەگەر چاوکردنەوە بووە هۆی تێکدانی خشوع بەوەی وێنەو زەخرەفە لەبەردەم نوێژخوێندا هەبێت سەیریان بکات و دڵی سەرقاڵ بکات، ئەوە چاونوقاندن کەراهەتی نیە لەم شێوەیەدا، دانانن بە پەسەندێتی نزیکترە لە بنەماکانی شەرعی ئیسلام و مەبەستەکانی لەوەی بوترێت: کەراهەتی هەیە. خوای پەروەردگاریش زاناترە[٢٦٣].

---

261– رواه حاكم عن أبي هريرة – صحيح الجامع: (٤٤٥).

262– رواه أحمد وأبو داود والترمذي عن كعب بن عوجرة – صحيح الجامع: (٤٤٢).

263– زاد المعاد لابن قيم الجوزية: (١/ ٢٩٣–٢٩٤) بتصرف.

**٧- دوور کەوتنەوە لە نوێژو ڕۆژوو هەتا چل ڕۆژ دوای زەیسانی با پاکیش بوبێتەوە:**

ئەمە سەرپێچیەش لەلایەن زۆربەی ئافرەتانەوە ڕوودەدات... لەکاتێکدا پێویستە لەسەری هەر کاتێ پاك بوویەوە یەکسەر خۆی بشوات و نوێژەکانی بکات و ڕۆژوو بگرێت، بۆ مێردەکەی حەڵاڵ دەبێت، ئەگەر لەدوای بیست ڕۆژیشەوە بێت، ئەگەر جارێکی تر خوێن دەرچوو ئەوە بە (نفاس) زەیسانی بۆی حسابە هەتا چل ڕۆژ، بەڵام عیبادەت و پەرستشەکانی ئەو کاتەی دروستە کە خوێنی نەبووە.

**٨- نوێژی نەخۆش بە ئاماژەی پەنجەی:**

نەخۆش ئەگەر توانای نەبوو بە پێوە یان بەدانیشتەوە نوێژەکانی بکات بە ئاماژەی پەنجەی نوێژەکانی بەجێدەهێنێ، ئەمەش هەڵەیە چونکە هیچ بنەمایەکی نیە لە قورئان و سوننەتدا تەنانەت ئیجتیهادی زانایانیشی لەسەر نیە.

**٩- ماچکردنی قورئان:**

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی لەناو نوێژخوێناندا باوە، دەبینین یەکێ لەوان کاتێ بەشێك لە قورئانی خوێندو تەواو بوو، قورئانەکە بەدەستی دەگرێت و ماچی دەکات.

بێگومان ئەو موسڵمانەی ئەم کارە دەکات لەبەر خۆشەویستی خواو قورئان دەیکات، بەڵام دەڵێم: ئەوەندە بەسە کە شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و هاوەڵانی بین و ئەوان بکەینە پێشەنگی خۆمان.

پرسیاریان کرد لە پێشەوا ئیبن تەیمیە دەربارەی هەستان لەبەر قورئان و ماچکردنی، ئەویش وتی: سوپاس بۆ خوا هەستان لەبەر قورئان و ماچکردنی پێ نازانم لەلایەن سەلەفەوە هیچ شتێکی (مأپور)ی لەبارەوە هاتبێ، وە دەربارەی ماچکردنی قورئان لە پێشەوا ئەحمەدیان پرسی ئەویش وتی: هیچم لەبارەیەوە نەبیستووە.

**١٠- ئافرەت قورئان بەنهێنی دەخوێنێت لە نوێژە ئاشکراکاندا:**

هەروەها ئەمەش سەرپێچیە، چونکە سوننەت وایە ئافرەت لە نوێژە ئاشکراکاندا - بە شێوەیەك قورئان بخوێنێت خۆی گوێی لە دەنگی خۆی بێت- بەڵام ئەگەر کەسانێکی نامەحرەم لە پیاوان گوێیان لە دەنگی بوو، لەو کاتەدا با بەنهێنی بیخوێنێ بۆ ئەوەی بۆیان نەبێتە فیتنە بەهۆی دەنگیەوە.

لەسەریەتی بەنهێنی قورئان بخوێنیٚ لە نوێژە نهێنیەکاندا.

**١١- نوێژکردن بە دانیشتنەوە لەگەڵ ئەوەدا توانای راوەستان هەبیٚ:**

هەندیٚ نەخۆش -خوای گەورە شیفایان بدات- کاتیٚ تووشی نەخۆشیەکی سووك بـوون، لـە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بەدانیشنەوە نوێژ دەکەن.

ئەم کارەش چەند (چوابگ)ێکی شەرعی هەیە: ئەو کەسەی کە توانای بەپێوە وەستانی هەبێت بەڵام توانای ئەوەی نەبێت رکوع و سەجدە بەرێت ئەوە بەپێوە وەستانەکەی لەسەر ناکەوێت.. واجبە لەسەری بەپێوە بوەستێت پاشان بە ئیشارەت رکوع بەرێت، جا دانیشێت بە ئیشارەت سەجدە بەرێت، چونکە راوەستان روکنێکە لە روکنەکانی نوێژ.

بەو شێوەیە پێویستە لەسەری تا چەند دەتوانیٚ نوێژ بکات بەجاریٚ لە هەموو روکنەکاندا تەمەڵی نەکات.

(عمران کوڕی حصین) رەزای خوای لیٚ بیٚ وتی: مایەسیریم هەبوو دەربارەی نوێژکردن پرسیارم کرد لە پێغبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی:

(صَلِّ قائِماً، فَإن لَم يَستَطيع فَقاعِداً، فَإن لَم يستَطِع فَعلَى الجنب)[٢٦٤]. واتە: نوێژ بکە بەپێوە، ئەگەر توانات نەبوو بە دانیشتنەوە، ئەگەر بەدانیشتنیشەوە توانات نەبوو، لەسەر تەنیشت نوێژکەت بکە.

**١٢- تەختکردنی بەردەم و دەستهێنان بە بەردو چەودا:**

لە (معیقیب)ەوە هاتووە دەفەرموێت: دەربارەی مەسحی بەرد و چەو لە نوێژدا پرسیم لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەویش فەرمووی: (إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً)[٢٦٥]. واتە: ئەگەر هەر پێویست بوو یەکجار دەستی پێدابهێنە بۆ تەختکردنی.

---

[264]- أخرجه البخاري وأحمد عن عمران بن حصين- صحيح الجامع: (٣٧٧٨).

[265]- أخرجه مسلم عن معيقيب : (٥/٥١) (ح المساجد ٤٧).

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: (إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَوَاحِدَةً). مانای ئەوەیە ئەو کارە مەکە، ئەگەر هەر پێویست بوو با لە یەکجار زیاتر نەبێت.. ئەم نەهیەش کەراهەتی تەنزیهیە. زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی دەستهێنان بە بەرد و چەودا کەراهەتی هەیە، چونکە نوێژخوێن سەرقاڵ دەکات و لەگەڵ بیّ فیزیدا ناگونجێت.

(قاضي عياض) دەڵێ: پێشینە چاکەکان دەڵێن: سڕینی ناوچاوان لە خۆڵ و هەر شتێکی تر کەراهەتی هەیە پێش سڵاودانەوەو دەرچوون لە مزگەوت.

**١٣- نوێژکردن بۆ مردووەکان:**

هەندێ کەس ئەگەر کەسێکی خۆشەویست یان نزیکیان مرد، حەج و عەمرەی بۆ دەکەن یان بۆی دەپاڕێنەوە.. ئەمانەش هەموویان دروستن بە بەڵگەی شەرعی.

بەڵام هەندێکیان لە جیاتی ئەو مردووە نوێژ دەکەن، ئەمەش کارێکی نادروستە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەبارەیەوە نەهاتووە.

**١٤- تەرکی نوێژ لەلایەن نەخۆشەوە:**

شێخ (ابن عثیمین) دەڵێ: زۆر لە نوێژخوێنان کاتێ نەخۆش بوون توانای دەستنوێژ گرتنیان نەبوو یان گڵیان دەست نەکەوت و توانای تەیەمموم کردنیان نەبوو، یا هەندێ جار پۆشاکەکانیان پیس بوو، دەبینین یەکێك لەوانە تەرکی نوێژ دەکات دەڵێ: ئارام دەگرم هەتا خوای گەورە شیفام دەدات و چاك دەبمەوە ئەو کاتە دەستنوێژ دەگرم و پۆشاکەکانم دەشۆم ... وێنەی ئەوانە.

بەو کەسە دەڵێین: دواخستنی نوێژەکەت حەرامە، چونکە تۆ نازانیت لەوانەیە لەو نەخۆشیە ڕزگارت نەبێ و بمریت پێش ئەوەی نوێژەکەت بکەیت؟

بۆیە واجبە لەسەرت بەو حاڵەوە نوێژەکانت بکەیت، با پیسیشت پێوە بێت و توانات نەبێ پاکی بکەیتەوە، یان ئاوت دەست نەکەوێت دەستنوێژی پێ بگریت و پێت نەکرێ تەیەمموم بکەیت[٢٦٦].

[266]– دروس وفتاوي في حرم مكي للشيخ ابن عثيمين: (ص: ٤١).

### ١٥- قرقێنەدان لە نوێژدا:

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ دەچنە ناو نوێژەوە دەست دەکەن بە قرقێنەدان بۆنێکی ناخۆش لە گەدەیانەوە دەردەچێت دەبێتە هۆی ئازاردانی ئەوانەی لە دەوری نوێژ دەکەن هەتا لەوانەیە کەسی وایان هەبێ هەڵبێ و نوێژەکەی نەکات لەبەر ئەو بۆنە ناخۆشە.

بەڵکو دەبینین هەندێکیان ئەو کارە تەنها لە نوێژدا دەکەن بە قەستی ... (ولا حول ولا قوه الا بالله).

ئەمەش پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی لێ کردووە بە یەکێك لە هاوەڵانی فەرمووی: (کفّ عنا جُشاءك)[٢٦٧]. واتە: بەسە ئیتر ئەو بۆنە ناخۆشەمان لێ لادە (جُشاء) ئەو بۆنە ناخۆشەیە لە گەدەوە دەردەچێت لە ئەنجامی زۆر خۆریەوە.

سوێند بە خوا ئەی براکانم ئەم کارە روونادات لە کەسێکەوە نەبێت کە رووت کراوەتەوە لە هەرچی هەست و شعور و زەوقی بەرزە کە ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە خۆمان بەو سیفات و رەوشتە جوانانە برازێنینەوە.. داواکارم لە خوای گەورە هەست و شعور زەوقی بەرزمان پێ ببەخشێت.

### ١٦- نەگێڕانەوەی باوێشك:

هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی نوێژدا کە باوێشك زۆری بۆ هێنان دەمیان بە تەواوی دەکەنەوە و لە مزگەوتدا دەنگیان بەرزدەکەنەوە و باوێشك دەدەن ... ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە.

لە سوننەتدا هاتووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کاتێ باوێشك زۆری هێنا بۆ ئینسان: ئەوەندەی دەتوانێت بیگێڕێتەوە یان دەست بگرێت بە دەمیەوەو نەهێڵێت دەنگی دەرچێت.

---

267- أخرجه الترمذي وابن ماجه عن ابن عمر- صحيح الجامع: (٤٤٩١).

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاة فَلْيَكْظِمْ مَا اِسْتَطَاعَ فَإِنَّ الشَّيْطَان يَدْخُل)[268]. واتە: کاتێ یەکێك لە ئێوە لە نوێژدا باوێشکی دا هەتا دەتوانێ بیگێڕێتەوە، چونکە شەیتان لەناو دەمیەوە دەچێتە ژوورەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (إِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَلْيَضَعْ يَدَهُ عَلَى فِيهِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَدْخُلُ مَعَ التَّثَاؤُبِ)[269]. واتە: کاتێ یەکێك لە ئێوە لە نوێژدا باوێشکی دا با دەست بگرێ بە دەمیەوە، چونکە شەیتان لەناو دەمیەوە دەچێتە ژوورەوە لەگەڵ باوێشکەکەدا.

لە ریوایەتی پێشەوا بوخاری دا هاتووە، کە فەرموویەتی: (فَإِنَّ أَحَدُكُمْ إِذَا قَالَ هَا ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ). واتە: کاتێ یەکێك لە ئێوە وتی: ها، شەیتان پێی پێدەکەنێ.

**١٧- داپۆشینی دەم و چاو لە نوێژدا:**

ئەم کارەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکان... چونکە دەم هەڵبەستن و داپۆشینی دەم چاو لە نوێژدا بەبێ عیللەت و عوزرێکی شەرعی کەراهەتی هەیە.

**١٨- رۆژووگرتنی مانگی رەمەزان بەبێ نوێژکردن:**

شێخ (ابن عثيمين) دەربارەی ئەم باسە وتەیەکی هەیە دەڵێ: زۆر سەیرە هەندێ کەس سوورن لەسەر رۆژووگرتن، بەڵام سوورنین لەسەر نوێژکردن هەتا پێیان وتووم هەندێ کەس رۆژوو دەگرن بەبێ ئەوەی نوێژ بکەن.

من شایەتی دەدەم نوێژی ئەو کەسە بەتاڵە و لێی وەرناگیرێت بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و وتەی هاوەڵان و تێ ڕوانینی دروست ئەو کەسەی تەرکی نوێژ بکات کافرەو لە ئومەتی ئیسلام دەچێتە دەرەوە ئیتر رۆژووگرتن و خێرو خێرات کردن و حەجکردن و کردەوەی چاکە هیچ سودی پێ ناگەیەنێت... خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الفرقان: ٢٣. واتە: هاتین هەر کردەوەیەکیان کردبوو هەمووێان وەکو تۆزی پرش و بڵاو لێ کرد.

---

[268]- أخرجه مسلم وأبو داود عن ابي سعيد – صحيح الجامع: (٤٢٧).

[269]- متفقٌ عَلَيْهِ. عن ابي سعيد – صحيح الجامع: (٤٢٦).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ ﴿٥٤﴾ ﴾ التوبة: ٥٤. واتە: هیچ شتێك بەرگری ئەوانەی نەكردووە كە گیرا بكرێت لێیان بەخشراوەكانیان، بێجگە لەوەی كە بێگومان كافربوون بە خواو پێغەمبەرەكەی.

خێرو بەخشین كە سوود بە خەڵكیش دەگەیەنێت وەرناگیرێت ئەگەر لەلایەن كافرەوە بوو، ئەی چۆن بۆ پەرستشێكی وەك ڕۆژوو وەردەگیرێت؟ بەڵێ بێگومان لێ وەرنەگرتنی لەپێش ترە[270].

**١٩- نوێژكردن لەكاتی ئامادەبوونی خواردن و تەنگاوبووندا:**

هەندێ كەس هەڵە دەكەن ئەویش بەوەی ئەگەر كەسێ لەوان برسێتی زۆری بۆ هێناو خواردن ئامادەكرا بۆی نایخوات هەتا نوێژەكەی نەكات وادەزانێت ئەوە كارێكی چاكە و ڕاستە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا وُضِعَ عَشَاءُ أَحَدِكُمْ وَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ، وَلاَ يَعْجَلَنَّ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهُ)[271]. واتە: ئەگەر كاتی نوێژكردن هات و نان دانرابوو بۆ خواردن، ئەوا نانەكە بخۆن، پەلە مەكەن هەتا تەواو دەبن، ئەو كاتە هەستن بەدەم نوێژەكەتانەوە، بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵی خواردنەكە نەبێ و خەیاڵ نەڕوات بۆلای.

لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: لە پێغەمبەرم بیستووە صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (لَا صَلَاةَ بِحَضْرَةِ طَعَامٍ، وَلا وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ)[272]. واتە: لەكاتی ئامادەبوونی خواردندا نابێت نوێژ ئەنجام بدرێت، وە لە كاتێكیشدا پیسی و میز زۆری پێهێنان واتە: لەكاتی تەنگاوبووندا.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی نوێژكردن كەراهەتی هەیە بۆ كەسێك نانی بۆ ئامادەكرابێت ئەویش برسی بێت و بیەوێت نان بخوات، بۆ ئەوەی دڵ سەرقاڵی خواردنەكە نەبێ و خەیاڵ نەڕوات بۆلای و خشوع بە تەواوی لەدەست نەدرێت، هەروەها كەراهەتی هەیە لەكاتێكدا كە پیسی و میز زۆری پێهێنان نوێژ ئەنجام بدەن، ئەمەش لەمانادا پەیوەندی هەیە بەوەی پێشوودەوە لەبەر ئەوەی دڵ سەرقاڵ ئەبێ و خەیاڵ ئەڕوات و خشوع بە تەواوی لەدەست ئەدرێت.

---

270- دروس وفتاوي في حرم مكي للشيخ ابن عثيمين: (ص: ٣٥).

271- أخرجه مسلم عن ابن عمر: (٦٣/٥) (ح ٦٦ المساجد).

272- أخرجه مسلم عَنْ عَائِشَةَ: (٦٥/٥) (ح ٦٧ المساجد).

فەرمودەی: (وَلاَ يَعْجَلَنَّ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهُ). واتە: پەلە مەکەن تاتەواو دەبن، ئەو کاتە هەستن بەدەم نوێژەکەتانەوە. بەڵگەیە لەسەر ئەوەی تێر بخۆن، ئەمەش راستیەکەیەتی. بەڵام ئەوەی هەندێ لە هاوەڵانمان لێکیان داوەتەوەو دەیڵێن پاروویەك بخورێت بۆ ئەوەی تینی برسێتیەکە کەمکاتەوە راست نیە، چونکە ئەم فەمودە بە ئاشکرا ئەو نوێژە بەتاڵ دەکاتەوە[٢٧٣].

پرسیار کرا لە ئیبن تەیمیە دەربارەی کەسێك کە تەنگەتاوی میز بێت: ئایا بەو دەسنوێژەوە نوێژ بکات بەو تەنگەتاویە چاکترە یان خۆی رزگار بکات و دەست نوێژەکەی پووچەڵ بکاتەوەو تەیەمموم بکات لەبەر بێ ئاوی؟

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: نوێژەکەی بە تەیەمموم چاکترە بەبێ راگرتنی میزەکە، لەوەی بە دەسنوێژەوە نوێژ بکات و میزی راگرتبێت چونکە نوێژەکەی بەو حاڵەوە کەراهەتی هەیەو نەهی لێ کراوە. بۆ دروستیەکەی دوو ریوایەت هەیە: بەڵام نوێژەکەی بە تەیەمموم دروستە و کەراهەتی نیە بە یەکدەنگی زانایان. خوای پەروەردگاریش زاناترە[٢٧٤].

---

[273]- مسلم بشرح النووي: (٥/٦٣- ٦٤).

[274]- فتاوى الكبرى لإبن تيمية.

**٢٠- قورئان خوێندن و یادی خوا لەناو نوێژخوێناندا لە غەیری شوێنی خۆیاندا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیە باوەکان... بۆ نمونە یەکێك لە نوێژی جەماعەت دوادەکەوێت کاتێك دێتە مزگەوت پێشنوێژ لەگەڵ نوێژخوێناندا لە رکوعدان، ئەویش دەچێت بە رکوعدا کەچی سورەتی فاتیحە دەخوێنێت.. هەروەها هەندێکیان کاتێ پێشنوێژ لە سەجدە هەستایەوە پێش ئەوەی هەستێتە سەرپێ دەست دەکات بە خوێندنی سورەتی فاتیحە... ئەمانەش هەر هەموویان پێچەوانەی سونەتی پێغەمبەرن صلی الله علیه وسلم.

**٢١- راگەیاندن لەدوای پێشنوێژەوە:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ یەکێ لەوان گوێی لە پێشنوێژ بوو وتی (الله اکبر) ئەویش لەدوایەوە بەدەنگی بەرز دەڵێ: (الله اکبر) وادەزانێت کە سونەتە...ئەمە هەڵەیە، چونکە راگەیاندن لەدوای پێشنوێژەوە ئەگەر پێویست نەبێ بیدعەیە.

پرسیار کرا لە ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ دەربارەی راگەیاندن لەدوای پێشنوێژەوە کە ئایا موستەحەبە یان بیدعەیە؟

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: راگەیاندن لەدوای پێشنوێژەوە ئەگەر پێویست نەبێ ئەوە بیدعەیە و پەسەند نیە بە یەکدەنگی شەرع زانان، بەڵکو دەبێت پێشنوێژ بەدەنگی بەرز بڵێ: (الله اکبر) وەك چۆن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی کردوویانە، هیچ کەسێك لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم دەنگی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم رانەگەیاندووە، بەڵام کاتێك نەخۆش بوو دەنگی کزبوو ئەو کاتە ئەبو بەکر (الله اکبر)ی دەکرد[٢٧٥].

---

[275]- فتاوی الکبری لإبن تیمیة.

## سەرپێچیەکانی نوێژدابەستن (گوفتاری و کرداری)

**١- ئاشکراکردنی نیەت:**

ئەمەش هەڵەیە، چونکە جێگای نیەتهێنان دڵە.. لە باسی هەڵەکانی دەستنوێژدا لێی دواین.

**٢- دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی نوێژ دابەستندا:**

بۆ نمونە کەسێك کاتێك دەچێتە مزگەوت دەبینێت پێشنوێژ لەگەڵ نوێژگەران لە رکوع یان لە سەجدەدان، ئەویش بەدەنگی بەرز دەڵێ: (الله اکبر). زۆرجار هەندێ نوێژخوێن وادەزانن (الله اکبر)ی پێشنوێژەو نوێژەکەیان لێ تێك دەچێت و لە روکنێك لە روکنەکانی نوێژدا پێچەوانەی پێشنوێژ دەجوڵێنەوە... واجبە وریای ئەم سەرپێچیە بین. کاتێ کەسێك چووە مزگەوت دەبێت بەبێ دەنگی و لەسەرخۆ (الله اکبر) بکات هەتا نەبێتە هۆی ئازاردانی براکانی.

شێخ (علي محفوظ) دەڵێ: یەکێ لەو بیدعانەی لە نوێژدا کەراهەتی هەیە، ئەوەیە شوێنە نهێنیەکان وەك شوێنە ئاشکراکان ئەنجام دەدەن ئەویش بەوەی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) و پاڕانەوەی نوێژدابەستن و تەسبیحات بە دەنگی بەرز دەڵێن... ئەمەش نەکراوە و نەبووە لەسەردەمی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم، هەروەها لەسەردەمی هاوەڵان و شوێن کەوتوانیشیاندا، کە ئەوانەش پێشەنگن بۆ ئێمە، ئەگەر شوێنی ئەوان نەکەوین ئەی شوێنی کێ بکەوین، کێ بکەینە پێشەنگ بۆ خۆمان؟[٢٧٦].

**٣- سەرپێچی لە پاڕانەوەی دەست پێکردنی نوێژدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لەدوای (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنەوە شتانێك دەڵێن هیچ بنەمایەکی لە سوننەتدا نیە.. وەك وتەی هەندێکیان کە دەڵێن: «لا معبود سواك». واتە: جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە... جگە لەمەش.

---

[276]– الإبداع: (٢٨٣).

ئەمە لە فەرموودەدا نەهاتووە، ماناکەشی هەڵەیە، چونکە پەرستراوەکان لە غەیری خوا زۆرن، چونکە خەڵکانێك هەیە ئەمانە دەپەرستن: مانگا، بەرد، پلەوپایە، خێزان، ماڵ و سامان...هتد.

لەبەرئەوە راستر وایە لە جیاتیدا ئەمە بڵێ: «ولا معبود بحقٍ سواك». واتە: جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە. ئەویش بە مەرجێك نابێت لە پاڕانەوەی دەست پێکردنی نوێژدا بیڵێ.. چونکە لە سوننەتدا نەهاتووە.

ئەوەی لە سوننەتدا لەوبارەوە هاتووە بەسەو هەندێکیان لێ باس دەکەین:

ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەدوای نوێژدابەستن و پێش خوێندنی سورەتی فاتیحە ماوەیەکی کەم بێدەنگ دەبوو منیش پێم وت: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دایك و باوکم بە قوربانت بن ئەو ماوەیە دەوەستیت لە نێوان نوێژ دابەستن و خوێندنی سورەتی فاتیحەدا چییە و چی تێدا دەفەرمویت؟ ئەویش فەرمووی: دەڵێم: (اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالثَّلْجِ وَالْمَاءِ وَالْبَرَدِ)[277]. واتە: خوایە نێوان من و تاوانەکانم ئەوەندەی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا دوور بخەرەوە، خوایە لە تاوانەکانم پاکم بکەرەوە وەك چۆن جل و بەرگی سپی لە چڵك و پیسی پاك دەبێتەوە، خوایە تاوانەکانم بشۆرەوە بەئاوو بەفرو باران.

(عبدالله)ی کوڕی عومەر رەزای خوایان لێ بێ دەڵێت: جارێ ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژمان دەکرد یەکێك لە هاوەڵان بەم زیکرە دەستی کرد بە نوێژکردن: (اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً). پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (مَنِ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟). واتە: کێ ئەم وتەو ئەو وتەیەی خوێند؟ پیاوێك وتی: من ئەی پێغەمبەری خوا. ئەویش فەرمووی: (عَجِبْتُ لَهَا فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ). واتە: جێی سەر سوڕمانم بوو! هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ کرایەوە.

---

277 – اخرجه البخاري: (٢/ ١٩٠) الصلاة، ومسلم (٥٩٨)المساجد.

ئیبن عومەر فەرمووی: لەو کاتەوە لە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیخوێنم و وازم لێ نەهێناوە[٢٧٨].

لە عائیشەو ئەبی سەعیدو جگە لەوانیشەوە هاتووە دەفەرموون: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ نوێژی دادەبەست دەیفەرموو: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ وَتَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلَا إِلَهَ غَيْرَكَ)[٢٧٩]. واتە: خوایە تۆ پاك و بێگەردی سوپاس و ستایش شایستەی تۆیە، ناوت پیرۆزەو خاوەنی بەرزی و شکۆی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نیە کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ.

**٤- وازهێنان لە خوێندنی:** (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ) و ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾:

پەنا گرتن بە خوا لە شەیتانی نەفرەتی کارێکی پێویستەو موسلْمان هەمیشە پێویستی پێیەتی، چونکە خۆی دادەماڵێت لە هەموو هێزو دەسەڵاتێك جگە لە هێزو دەسەڵاتی خوای پەروەردگار پەنا هەر بۆ ئەو دەبات کە بیپارێزێ لە خراپە و فڕوفێڵی شەیتان.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دوای پاڕانەوەی دەست پێکردنی نوێژەوە پەنای دەگرت بە خوای گەورە دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ)[٢٨٠]. واتە: پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە شەیتانی نەفرین لێکراوی دوورخراو لە رەحمەتی خوا، لە شێتی و فیز زلی و هاندانی بۆ وتنی شیعری خراپ.

هەندێ جار ئەمەشی بۆ زیاد دەکرد دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ..). واتە: پەنا دەگرم بە خوای پەروەردگار لە شەیتانی نەفرین لێکراوی دوورخراو لە رەحمەتی خوا. پاشان بەدەبێ دەنگی﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ی دەخوێند[٢٨١].

278 – أخرجه مسلم (٦٠١) المساجد – صحيح الترمذي للألباني: (٣٨٤٤).

279– رواه أبو داود: (٧٧٦)، وصححه الألباني في الإرواء: (٣٤١).

280– رواه الترمذي: ٢/ ٩/ ٢٤٢، وأبو داود: ١/ ٤٠٩/ ٧٧٥، وصححه الألباني في الإرواء: ٣٤

281 – أخرجه البخاري: (٢/ ١٨٨– ١٩١)، ومسلم (٥٩٨).

**٥- وتنی (الله اكبر)ی نوێژدابەستن لە ركوعدا:**

هەندێ نوێژخوێن كاتێ دەچنە مزگەوتەوە دەبینن پێشنوێژ لە ركوعدایە بەپەلە دەچنە ركوعەوە پاشان دەڵێن: (الله اكبر)... ئەمەش پێچەوانەی رێبازو سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

راستی لێرەدا ئەوەیە بە پێوە (الله اكبر)ی نوێژدابەستن بڵێ پاشان بچێتە ركوعەوە، ئەگەر فریای (الله اكبر)ی چەمینەوە نەكەوت تەنها (الله اكبر)ی نوێژدابەستنی بەسەو نوێژەكەی دروستە... ئەمەش وتەی (شیخ إبن جبرین)ە.

**٦- زیادكردنی وتەی(عز وجل) لەدوای (الله اكبر)ی نوێژدابەستن:**

هەندێ لە نوێژخوێنان كاتێ پێشنوێژ نوێژ دادەبەستێ دەڵێ: (الله اكبر). دەڵێن: (الله اكبر عز وجل) وتەی(عز وجل)ی بۆ زیاد دەكەن، ئەمەش هەڵەیە، چونكە سوننەت وایە نوێژخوێن شوێن پێشنوێژ بكەوێت بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا...)[٢٨٢]. واتە: پێشنوێژ بۆیە دانراوە چاوی لێ بكرێت، جا پێشی مەكەون، كاتێ وتی: (الله اكبر)، ئێوەش بڵێن: (الله اكبر).

**٧- پێشكەوتنی پێشنوێژ:**

هەندێ لە نوێژخوێنان ئەوندە پەلەیانە گوێ نادەن بە نوێژەكەیان لە پێش پێشنوێژەوە نوێژدادەبەستن -هەرچەندە ئەم حاڵەتە دەگمەنە بەڵام هەر روودەدات-.

ئەم كارە جگە لەوەی نوێژەكەیان پوچەڵ دەكاتەوە پێی گوناهباریش دەبن.

282- متفقٌ عَلَيْهِ عن عائشة- صحيح الجامع: (٢٣٥٧).

شێخ (عثیمین) دەڵێ: ئەو کەسەی لەدوای پێشنوێژەوە نوێژ دەکات ئەگەر پێش ئەوەی پێشنوێژ (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بڵێ ئەو (الله اکبر)ی نوێژدابەستن بڵێ ئەوە دەبێت نوێژەکەی بکاتەوە چونکە پێش پێشنوێژ کەوتووە بە بەڵگەی ئەم فەرمودەیە: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَلَا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا..)[283]. واتە: پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون، جا پێشی مەکەون، کاتێ وتی: (الله اکبر)، ئێوەش بەدوایدا بڵێن: (الله اکبر). لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا..). فەرمان دەکات بەوەی کاتێ پێشنوێژ وتی: (الله اکبر)، ئینجا لە دوای ئەوە بوترێت: (الله اکبر)، هەر کەسێ لە پێش پێشنوێژەوە بیڵێ ئەوە کارێکی کردووە خواو پێغەمبەر فەرمانیان بەوە نەکردووە[284].

**٨- دانانی هەردوو دەست لەسەر دڵ یان سك:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ چوونە ناو نوێژەوە دەستی راست لەسەر دەستی چەپ دادەنێن و دەیخەنە سەر دڵیان وادەزانن ئەوە هۆیەکە بۆ خشوع... ئەمەش هەڵەیە، چونکە باشترین سوننەت سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، هیچ کەسێ ناتوانێت بەتەواوی نوێژ بەجێبێنێ هەتا شوێنی نەکەوێت کە دەفەرموێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[285]. واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (كان يضع اليمنى على ظهر كفه اليسرى والرسغ والساعد)[286]. واتە: دەستی راستی دەخستە سەر پشتی دەست و مەچەك و باسکی دەستی چەپی. و (كان – أحيانا – يقبض باليمنى على اليسرى)[287]. واتە: وە جاری واش هەبوو دەستی چەپی بە دەستی راستی دەگرت. و (كان يضعهما على الصدر)[288]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەردوو دەستی لەسەر سنگی دادەنا.

---

283– متفقٌ عَلَيْهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٢٣٦٠).

284– فتاوي (نور على الدرب): (ص: ١٦).

285– أخرجه البخاري: (٦٣١).

286– رواه أبو داود والنسائي وابن خزيمة: (٢/٥٤/١) بسند صحيح.

287– رواه الدارقطني والنسائي وصححه الآلباني في صفة الصلاة: (ص: ٦١).

288– رواه أبو داود وابن خزيمة في صحيحه، وحسن أحد أسانيده الترمذي.

### ٩- چاو بەرزکردنەوە بۆ ئاسمان لە نوێژدا:

دەبینین زۆر کەس لە نوێژدا سەر بەرزدەکەنەوەو سەیری ئاسمان دەکەن، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم کارەی قەدەغەکردووە دەفەرموێت: (لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ رَفْعِهِمْ أَبْصَارَهُمْ عِنْدَ الدُّعَاءِ فِي الصَّلَاةِ إِلَى السَّمَاءِ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ)[289]. واتە: ئەوانەی لە نوێژدا چاو بەرزدەکەنەوە بۆ ئاسمان دەسبەردار دەبن باشە، ئەگینا رۆشنایی چاویان لێ دەسەنرێت، واتە کوێر دەبن.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە دڵنیاییەوە نەهی لێ کراوە، بەڵێنی توندی بۆ دانراوە، یەکدەنگی زانایان لەبارەی ئەم نەهیەوە نقلّ کراوە.

سوننەت وایە نوێژخوێن سەیری جێگا سەجدەکەی بکات... لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْكَعْبَةَ مَا خَلَّفَ بَصَرُهُ مَوْضِعَ سُجُودِهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْهَا)[290]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کاتێك رۆشتە کەعبەوە لە شوێنی سەجدەکەی زیاتر سەیری هیچ شوێنێکی تری نەدەکرد هەتا لە کەعبە دەرچوو.

لە (عبدالله)ی کوڕی زوبێرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا جَلَسَ فِي التَّشَهُّدِ وَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى وَيَدَهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَلَمْ يُجَاوِزْ بَصَرُهُ إِشَارَتَهُ)[291]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کە دادەنیشت بۆ تەحیات خوێندن دەستی چەپی دەخستە سەر ڕانی چەپی، دەستی راستی دەخستە سەر ڕانی راستی، ئاماژەی بەو پەنجەیە دەکرد کە لەدوای پەنجە گەورەوە دێت چاوی تێ دەبڕی لەوەش زیاتری تێ نەدەپەڕاند[292].

---

289– أخرجه مسلم عن أبي هريرة: ٤/٢٠٠ (ح ١١٨)الصلاة.

290– أخرجه الحاكم: (٤٧٩/١) وقال صحيح على شرط الشيخين ووافقه الذهبي.

291– أخرجه أبو داود: (١٥٦/١) والنسائي: (١٨٧/١) ، والبيهقي (١٣٢/١) ، وأحمد (٣/٤).

292– ئەم دوو فەرموودە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە نوێژخوێن دەبێ سەیری شوێنی سەجدەکەی بکات هەروەها سەیری ئەنجەی شایەتومانی بکات لەناو تەحیاتدا.

**١٠- پاڵدانەوە بە کۆڵەکە یان بە دیوارەوە لەکاتی نوێژدا:**

ئەم کارە لە نوێژە فەرزەکاندا دروست نیە، چونکە واجبە لەسەر ئەو کەسەی توانای راوەستانی هەیە بەپێوە بوەستێت.

بەڵام بۆ نوێژە سوننەتەکان دروستە پاڵ بدرێت بە پایەو کۆڵەکەو دیوارەوە، چونکە نوێژخوێن بۆی هەیە بەپێوە یان بە دانیشتنەوە نوێژ بکات، ئەگەر بەپێوە پاڵ بداتەوە بە کۆڵەکەوە یان بە دیوارەوە چاکترە لەوەی بە دانیشتنەوە نوێژ بکات.

**١١- وتنی: «استعنا بالله».**

لەکاتێکدا کە پێشنوێژ وتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾. دەبینین ئەوانەی لەدوایەوە نوێژدەکەن لەیەك کاتدا پێکەوە دەڵێن: «استعنا بالله»، ئەمەش یەکێکە لە بیدعەو سەرپێچیە باوەکان -بەتایبەتی لە ناو لادێکاندا.

**١٢- سەربەرزکردنەوە لەکاتی وتنی (آمین)دا:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان پابەندن بە سوننەتەوە لە نوێژدا سەیری جێگە سەجدەکەیان دەکەن بەڵام کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ﴾ هەیانە سەربەرزدەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەڵێ: (آمین)... ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم.

**١٣- وتنی (آمین) بە ئاوازەوە:**

ئەم سەرپێچیە مەگەر کەسێك -خوا رەحمی پێ بکات- ئەگینا ئەم کارە لەزۆر نوێژخوێن روودەدات... ئەویش ئەوەیە کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿وَلَا الضَّالِّينَ﴾. دەبینین ئەوانەی لەدوایەوەن شەش حەرەکە درێژی دەکەنەوەو دەڵێن: (آاااامین). ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە چونکە پێویستە دوو حەرەکە زیاتر درێژی نەکەنەوە بڵێن: (آمین).

هەروەها هەندێکی تریان شەددە بۆ (میم)ەکە زیاد دەکەن و دەڵێن: (آمّین)، ئەمەش هەڵەیە چونکە ماناکەی دەگۆڕێت، بۆیە پێویستە میمەکەی بەسوکی و بێ گرتن بخوێننەوە بڵێن: (آمین).

### ١٤- نەوتنی (آمین) پێکەوە لەگەڵ پێشنوێژ:

ئەمەش هەڵەیە، چونکە ئەو کەسەی ئەم کارە ناکات بێبەش دەبێت لە خێرێکی زۆر گەورە کە راستگۆ و بەڕاست زانراو هەواڵی داوە دەفەرموێت: (إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٢٩٣]. واتە: کاتێك پێشنوێژ وتی: (آمین) ئێوەش بیڵێن، چونکە ئامینی هەر کەسێك لەگەڵ ئامینی مەلائیکە رێك بکەوێت، خوای گەورە لە گوناهەکانی رابردووی دەبووری.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (إِذَا قَالَ الْقَارِئُ: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. فَقَالَ مَنْ خَلْفَهُ آمِينَ فَوَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ أَهْلِ السَّمَاءِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٢٩٤]. واتە: کاتێك پێشنوێژ وتی: ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. ئەوانەی لەدوایەوەن وتیان: (آمین)، ئامینی هەرکامیان لەگەڵ ئامینی خەڵکی ئاسمان رێك بکەوێت، واتە پێکەوە بوترێن، خوای گەورە لە تاوانەکانی رابردووی خۆش دەبێت.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی وتنی(آمین) موستەحەبە لەدوای سورەتی فاتیحەوە لەلایەن پێشنوێژو ئەوانەی لەدوایەوەن و ئەوەشی بەتەنها نوێژ دەکات، بۆیە دەبێت پێشنوێژو ئەوانەی لەدوایەوەن پێکەوە بڵێن: (آمین) نەپێشی پێشنوێژ بکەون نەدواشی بکەون لەبەر فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: (إِذَا قَالَ ﴿ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. فَقُولُوا: آمِينَ ). واتە: کاتێك پێشنوێژ وتی: ﴿ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ئێوەش بڵێن: (آمین). بەڵام ریوایەتی: (إِذَا أَمَّنَ فَأَمِّنُوا). مانای ئەوەیە ئەگەر پێشنوێژ ویستی بڵێ: (آمین). ئێوەش بڵێن: (آمین)[٢٩٥].

---

[293]– متفق عليه عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٣٩٥).

[294]– أخرجه مسلم عن أبي هريرة : (٧٢-٧٦).

[295]– مسلم بشرح النووي: (٤/ ١٧١).

**١٥- وتنی: « آمین ولوالدي وللمسلمین». کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾:**

زۆر لە نوێژخوێنان - بەتایبەتی لە ناوچە گوند نشینەکاندا - کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. هەموو یەکێك لەوان دەڵێ: «آمین ولوالدي وللمسلمین». ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم چونکە دەفەرموێت: (إِذَا أَمَّنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٢٩٦]. واتە: کاتێك پێشنوێژ وتی: (آمین) ئێوەش بیڵێن، چونکە ئامینی هەر کەسێك لەگەڵ ئامینی مەلائیکە رێك بکەوێت، خوای گەورە لە گوناهەکانی رابردووی دەبووڕێ.

لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێت: (إِذَا قَالَ الْإِمَام: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. فَقُولُوا: آمِينَ..)[٢٩٧]. واتە: کاتێ پێشنوێژ وتی: ﴿ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾. ئێوەش بڵێن: (آمین)[٢٩٨].

**١٦- بێ دەنگی پەسەندە لەدوای خوێندنی فاتیحەوە:**

زۆرینەی پێشنوێژەکان لەزۆربەی وڵاتاندا ئەوەیان لەلا پەسەندە کە لەدوای سورەتی فاتیحە بێدەنگ بن لەبەرئەوەی نوێژخوێنەکان بتوانن سورەتی فاتیحە بخوێنن، شافیعیەکان لەسەر ئەم بۆچوونەن، هیچ بەڵگەیەك نیە لەسەر موستەحەبی. بەڵام فەرمودەکەی سەمورە کە دوو وەستانی کەمی تێدایە بەبێدەنگی سابت بووە پێویستی بە درێژە پێدانە، چونکە لەگەڵ (حسن)دا لەسەر دیاریکردنی ئەو بێدەنگیە جیاوازیان هەیە، وتەی راست و بەهێز ریوایەتەکەی (أشعث)ە کە (حمید)یش رای لەسەریەتی: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَّهُ كَانَ يَسْكُتُ سَكْتَتَيْنِ إِذَا اسْتَفْتَحَ وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ كُلِّهَا)[٢٩٩]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی دەست پێکردنی نوێژدا بێدەنگ دەبوو، کاتێکیش بە تەواوی لە خوێندن دەبووەوە.

---

[296]– متفقٌ عَلَيْهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٣٩٥).

[297]– رواه البخاري وأبو داود عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٧٠٧).

[298]– نةم دوو فةرموودة بةلَطةن لةسةر نةوةى كة جطة لة (آمين) شتى تر نةوتريَت.

[299]– أخرجه أبو داود عن أشعث: (٧٧٨).

بەڵام ریوایەتەکانی تر کە بێدەنگی دووهەمیان تێدا هاتووە لەدوای فاتیحەوە، ریوایەتی هەڵبژێردراو نین لەبەر ناکۆکی راویەکان تیایانداو لەبەر بەتەنیا ریوایەتکردنی[300].

پێشەوا (ترمذي) دەڵێ: ئەمە وتەی کۆمەڵێك لە ئەهلی زانست و زانیاری: کە رایان وایە لەکاتی دەست پێکردنی نوێژدا دەبێ پێشنوێژ بێدەنگ بێت، وە کاتێکیش کە لە خوێندن دەبێتەوە، پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق و هاوەڵانمان لەسەر ئەم رایەن[301].[302].

**١٧- قورئان خوێندن لەدوای پێشنوێژەوە لە نوێژە ئاشکراکاندا:**

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان لەکاتێکدا کە پێشنوێژ قورئان دەخوێنێ لە نوێژە ئاشکراکاندا ئەوانیش لەگەڵ پێشنوێژ قورئان دەخوێنن بە سورەتی فاتیحە کۆتایی ناهێنن، بەڵکو سورەتی تریشی لەگەڵ دەخوێنن... ئەمەش هیچ گومانی تێدا نیە کە هەڵەیەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

واجبە لەسەر نوێژخوێنان گوێ بگرن بۆ قورئان خوێندنی پێشنوێژ لە نوێژە ئاشکراکاندا، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠٤. واتە: کاتێك قورئان خوێندرا گوێی لێ بگرن و بێ دەنگ بن بۆ ئەوەی خوا میهرەبانیتان لەگەڵ بکات.

ئیبن جەریر لە بەشیری کوڕی جابرەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: ئیبن مەسعود نوێژی دەکرد، گوێی لێ بوو هەندێ کەس لەگەڵ پێشنوێژدا قورئانیان دەخوێند، کاتێ سڵاوی دایەوە فەرمووی: ئەوە نابێ عەقڵ و هۆشتان ببێ کە خوای گەورە فەرمانی پێکردوون کاتێك قورئان خوێندرا گوێی لێ بگرن و بێدەنگ بن: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

---

300- المحلى: (٤/ ٩٧) والإرواء: (٢/ ٢٨٤).

301- سنن الترمذي: (٢/ ٣١).

302- نقلاً من أخطاء المصلين: (ص: ٧١).

له ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە یەکێك لە نوێژە ئاشکراکاندا قورئانی دەخوێند کاتێ تەواو بوو فەرمووی: (هَلْ قَرَأَ أَحَدٌ مِنْكُمْ مَعِي آنِفًا). واتە: ئایا کەس لەگەڵ مندا قورئانی خوێند، پیاوێك وتی: من. فەرمووی: (إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ؟)[303]. واتە: منیش دەڵێم ئەوە بۆچی بەربەرەکانێ و دژایەتیم دەکەن لە قورئان خوێندندا؟ ئیتر دوای ئەوە خەڵك وازیانهێنا لە قورئان خوێندن لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم لە نوێژە ئاشکراکاندا[304].

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَا إِنَّكَ آتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُ زِينَةً وَأَمْوَالًا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا عَن سَبِيلِكَ رَبَّنَا اطْمِسْ عَلَىٰ أَمْوَالِهِمْ وَاشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا حَتَّىٰ يَرَوُا الْعَذَابَ الْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَاسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَانِّ سَبِيلَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾﴾ یونس: ٨٨ - ٨٩. واتە: موسا وتی ئەی پەروەردگارمان بەراستی تۆ بەخشیوتە بە فیرعەون و کۆمەڵەکەی هۆکاری ڕازانەوە و جوانی و ماڵ و سامانی زۆر لە ژیانی دنیادا، ئەی پەروەردگارمان بۆ ئەوەی خەڵك گومڕا بکەن لەڕێگای تۆ، ئەی پەروەردگارمان لەناوی بەرە و مەیهێڵە ماڵ و سامانیان دڵەکانیان ڕەق و ڕەش بکە، چونکە بڕوا ناهێنن، هەتا دەبینن سزای سەختی ئازاردەر، (خوای گەورە) فەرمووی بێگومان دوعای هەردووکتان وەرگیرا جا خۆڕاگر و بەردەوام بن (لەسەر دینی خوا) وە مەکەونە شوێن ڕێگای ئەوانەی کە نازانن.

شێخ (محمد نسيب الرفاعي) لە باسی ئەم ئایەتەدا دەڵێ: موسا بە تەنها پاڕایەوە بەڵام سیاقی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێت کە هارون (آمین)ی کردووە بۆیە هارون گەیشتە پلەوپایەی موسا لە پاڕانەوەکەدا بە بەڵگەی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا﴾ یونس: ٨٩. واتە: (خوای گەورە) فەرمووی بێگومان دوعای هەردووکتان وەرگیرا. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی (آمین) بڵێ وەك ئەو کەسە وایە دوعا دەکات، لەبەر ئەوەیە دەڵێن: ئەو کەسەی لەدوای ئیمامەوەیە سورەتی فاتیحە ناخوێنێت، چونکە (آمین)ی لەسەر فاتیحە وەك ئەوە وایە خوێندبێتی، هەروەها ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بەربەرکانێ کردنی چونکە قورئان خوێندنی لەسەر نیە لە نوێژە ئاشکراکاندا، خواش دەیزانێت.

---

303– رواه أحمد: ١٠٣٢٣ وأهل السنن من حديث الزهري عن ابن أكيمة الليثي عن أبي هريرة، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح.

304– مختصر تفسير ابن كثير/ محمد نسيب الرفاعي (٢/ ٢٦٦-٢٦٧).

منیش دەڵێم: ئەمە هەق و ڕاستیەکەیەتی چونکە هەماهەنگە لەگەڵ ئەم ئایەتەدا: ﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥ وَأَنصِتُوا۟ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف: ٢٠٤.

گوێگرتن و بێدەنگی فەرمانی خوایە هەتا میهرەبانیان لەگەڵ بکات. ئەگەر گوێ بگرین و بێدەنگ بین دڵمان خاڵی دەبێت بۆ تێگەیشتن لە قورئانەکە، کە تێشگەیشتن موڕادی خوا دێتە دی، کاردەکەین بە واتاو مەبەستەکەی، خواش میهرەبانیان لەگەڵ دەکات لە پاداشتی ئەو تێشگەیشتن و کارکردنەدا. بەڵام ئەگەر پێشنوێژ قورئان بخوێنێ و ئێمەش بیخوێنین ئەو کاتە ناتوانین لەیەك کاتدا گوێ بگرین و تێبگەین لەو قورئانەی پێشنوێژ دەیخوێنێ و لەوەی خۆشمان. ئەگەر تێشگەیشتن نەبوو بێگومان کار پێکردن بەدەست نایەت. ئەگەر کار پێکردن بەدەست نەهات. خواش میهرەبانیمان لەگەڵ ناکات. هەروەها هەماهەنگە لەگەڵ ئەم فەرمودەی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا قَرَأَ فَأَنْصِتُوا..)[٣٠٥]. واتە: پێشنوێژ بۆیە دانراوە شوێنی بکەون، کاتێ وتی: (الله اکبر)، ئێوەش بڵێن: (الله اکبر)، هەروەها کاتێ بەدەنگی بەرز قورئانی خوێند ئێوەش بێ دەنگ بن و گوێی لێ بگرن. بێگومان ئەمەش لە نوێژە ئاشکراکاندا، بەڵام لە نوێژە نهێنیەکاندا واجبە لەدوای پێشنوێژەوە سورەتی فاتیحە بخوێنرێت، ئالێرەدا دەوری ئەم فەرمودە دێتە پێشەوە کە دەفەرموێت: (لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[٣٠٦]. واتە: ئەو کەسەی سورەتی فاتیحە نەخوێنێت نوێژەکەی دروست نیە. خوای پەروەردگاریش زاناترە[٣٠٧].

**١٨- بەردانەوەی دەستەکان:**

بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەردانەوەی دەستەکانی قەدەغەکردووە، ئەمەش یەکێکە لەو سەرپێچیانەی بڵاوبۆتەوە لەناو نوێژخوێناندا.

سوننەت لە خۆشەویستەوە صلى الله عليه وسلم سابت بووە کە دەبێت نوێژخوێن بە دەستی ڕاستی دەستی چەپی بگرێت و لەسەر سنگی دابنێت لە نوێژدا.

---

[305]– رواه أبو داود والنسائي – صحيح الجامع: (٦٧٢) .

[306]– متفق عليه عن عبادة بن الصامت البخاري: (٧٥٦)ومسلم: (٣٩٤).

[307]– مختصر تفسير ابن كثير/ محمد نسيب الرفاعي (١/ ١٨-١٩).

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە هاتووە دەفەرموێت: (كَانَ النَّاسُ يُؤْمَرُونَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ الْيَدَ الْيُمْنَى عَلَى ذِرَاعِهِ الْيُسْرَى فِي الصَّلَاةِ)[308]. واتە: جاران لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم لەسەر فەرمانی خۆی فەرمان بە موسڵمانان دەکرا لە نوێژدا دەستی راستیان لەسەر مەچەکی دەستی چەپیان دابنێن.

**١٩- دووبارە کردنەوەی سورەتی فاتیحە:**

هەندێ لەوانەی لە دوای پێشنوێژەوە نوێژ دەکەن کاتێ لە خوێندنی فاتیحە بوونەوە بۆ نمونە لە رکاتی سێهەم و چوارەمدا - لە نوێژی نیوەڕۆ یان عەسر یا شێواندا- ئەگەر پێشنوێژ لە چوونە رکوع دواکەوت سورەتی فاتیحە دووبارە دەکەنەوە، چونکە بیروباوەڕیان وایە دروست نیە لەدوای فاتیحەوە سورەتێکی تر بخوێنن.. ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە.

**٢٠- هەڵە باوەکان لە سورەتی فاتیحەدا:**

بۆ نمونە نوێژخوێن هەیە: (أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ) بە هەڵە دەخوێنێتەوەو دەڵێ: (أَنْعَمْتُ عَلَيْهِمْ).

یان هەیە: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ) بە هەڵە دەخوێنێتەوەو دەڵێ: (إِيَّاكَ نَعْبُدوا) یا (إِيَّاكَ نَعْبُدْ). یا هەیە لەجیاتی: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ) دەڵێ: (اهْدِنَا السْرَاطَ) چونکە زۆر کەس هەیە (صاد) بە (شین) دەخوێنێتەوە، ئەمانەش هەموویان لە هەڵە ئاشکراو باوەکانن.

**٢١- دانانی دەستەکان لەسەر کەلەکە:**

لە ئەبو هورەیرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: (نَهَى النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ يُصَلِّي الرَّجُل مُخْتَصِرًا)[309]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوەی پیاو لەکاتی نوێژکردندا دەستەکانی دابنێ لەسەر یان لە ئاستی کەلەکەی.

هۆی ئەم نەهی کردنەش ئەوەیە: لە کردەوەی جوەکانە، دەڵێن: لە کردەوەی شەیتانە، دەڵێن: چونکە شەیتان بەو شێوەیە لە بەهەشت دابەزیوە، دەڵێن: لە کردەوەی خۆ بەزلزانانە.

---

[308]- أخرجه البخاري: (٢/٢٢٤)وأحمد: (٥/ ٣٣٦).

[309]- أخرجه مسلم: (٥/٥٠) (ح ٤٦) المساجد.

### ٢٢- زۆر جولاَن لە نوێژدا:

ئەگەر دەتەوێت لەو بارەوە بدوێت بە ئارەزووی خۆت بدوێ چونکە نوێژخوێن نابینی نەجولێت لە نوێژدا - مەگەر کەسێك خوا ڕەحمی پێ بکات - دەبینی یەکێ خەریکی روخساریەتی، یەکێ پۆشاکەکانی دەجولێنێ، یەکێکی تر جەستەی دەجولێنێ.

ئەمەیە خۆشەویست صلی الله علیە وسلم هەواڵی داوەو ڕایگەیاندووە لەکاتێکدا دەفەرموێت: (أَوَّلُ مَا يُرْفَعُ مِنَ النَّاسِ الْخُشُوعُ)[310]. واتە: یەکەم شتێك لەناو خەڵکدا نامێنێ خشوعە.

ئەمەو لەگەڵ ئەوەشدا خوای گەورە وەسفی ئەوانە دەکات کە گەردن کەچن و بە خشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن، هەروەها بە کەسانێکی رزگاربویان ناودەبات کە (جنة الفردوس) بۆ ئەوانە، دەفەرموێت: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝١ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۝٢﴾ المؤمنون: ١ - ٢ . واتە: بەڕاستی سەرفرازو سەرکەوتوون ئەو ئیماندارانەی کە لەنوێژەکانیاندا دڵیان بەسراوە بەخوای خۆیانەوەو بەخشوعەوە نوێژەکانیان دەکەن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی کردووە بە ئوممەتەکەی لە نوێژدا نەجولێن دەفەرموێت: (اسْكُنُوا فِي الصَّلَاةِ)[311]. واتە: لە نوێژدا ڕابوەستن و مەجولێن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەبارەت بە زۆر جولاَن و لەدەستدانی خشوع لە نوێژدا هۆشیاری داوە دەفەرموێت: (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَنْصَرِفُ، وَ مَاكُتِبَ إلا عُشْرُ صَلاتِهِ، تُسْعُها، ثُمْنُها، سُبْعُها، سُدْسُها، خُمْسُها، رُبْعُها، ثُلُثُها، نِصْفُها)[312]. واتە: نوێژخوێن کاتێ لە نوێژەکەی بوویەوە، بەپێی خشوع و گەردن کەچیەکەی پاداشتی بۆ دەنوسرێت: جا یان دەیەکی نوێژەکەی بۆ دەنوسرێت، یا نۆ یەکی، هەشت یەکی، حەوت یەکی، شەش یەکی، پێنج یەکی، چوار یەکی، سێیەکی، یان نیوەی بۆ دەنوسرێت.

---

[310]- رواه الطبراني في الكبير عن شداد بن أوس – صحيح الجامع: (٢٥٧٦).

[311]– أخرجه مسلم عن جابر بن سمرة: (٤٣٠).

[312]– رواه أبو داود وأحمد وابن حبان عن عمار بن ياسر – صحيح الجامع: (١٦٢٦).

بۆ دیاریکردنی جولآن هیچ بەڵگەیەك لە قورئان و سونتەتدا نەهاتووە کە سێ جار جولآن خشوع و ئارامی لە نوێژدا ناهێڵێت، بەڵام زۆر جولآن و یاریکردن لە نوێژدا کەراهەتی هەیە، ئەگەر یاریکردنەکە بەدوای یەکدا زۆربوو ئەوە نوێژەکە پوچەڵ دەکاتەوە.

بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمان سوربێت لەسەر ئەوەی نوێژەکەی بە خشوع برازێنێتەوە بۆ خوای گەورە، بەڵام ئەگەر جولآن بەدوای یەکدانەبوو لەبەر زەرورەتێکی شەرعی بوو ئەوە نوێژ پوچەڵ ناکاتەوە. خوای پەروەردگاریش زاناترە.

**٢٣- لاربوونەوە لە نوێژدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ گوێیان لە هەندێ ئایەت دەبێت، بۆ ئەوەی ئەوانەی لەدوریدان هەست بکەن ئایەتەکان کاریگەری لەسەری هەیە جەستەی لاردەکاتەوە بەلای راست و چەپدا یان بۆ پێش و بۆ دواوە یان سەرە لەرزەیەکی بە هێز لە خۆی دێنێت... ئەمانەش هەموویان هەڵەن و لە دینی خوادا هیچ بنەمایەکیان نیە، بەڵکو دەرچوونە لە خشوع.

**٢٤- ئاوڕدانەوە بەم لاو بەولادا:**

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان کاتێ یەکێکیان دەچێتە ناو نوێژەوە بەلای راست و چەپدا ئاوڕدەداتەوە یان سەیری سەروی خۆی دەکات، بەڵکو سەرنجی دیواری مزگەوت و ئەو دیکۆرو زەخرەفەو وێنانە دەکات لەسەری نەخشێنراون... ئەمانەش هەموویان پێچەوانەی سونتەت و رێبازی پێغەمبەرن صلى الله عليه وسلم، بەڵکو خشوع لەدڵی نوێژخوێندا ناهێڵن لەبەرئەوە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە.

عائیشە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: سەبارەت بەلاکردنەوە پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەویش فەرمووی:

(هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الْعَبْدِ)[٣١٣]. واتە: ئەوە دزییەکە شەیتان لە نوێژی بەندەکان دەیدزێ.

---

313– أخرجه البُخاري: (٢/١٩٤– ١٩٥)، والترمذي: (٢٨٦٧).

له سەهلی کوڕی سەعدەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ڕۆژێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چوو بۆ ناو هۆزی بەنی عەمری کوڕی عەوف، بۆ ناوبژی هەتا ئاشتیان بکاتەوە، کاتی نوێژ بوو، بانگدەر کە بیلال بوو هات بۆلای ئەبوبەکر وتی: ئەگەر بانگ بدەم بەرنوێژی دەکەی بۆ خەڵك؟ فەرمووی: بەڵێ، جا کە ئەبوبەکر نوێژی دابەست پاش کەمێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتەوە، هێشتا نوێژەکەیان تەواو نەکردبوو، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یەکە یەکە دڕی بە ڕیزەکاندا، تاخۆی گەیاندە ڕیزی یەکەم لەوێ وەستا، خەڵکەکە دەستیان کرد بە چەپڵەلێدان، ئەبوبەکریش عادەتی نەبوو لابکاتەوە بەڵام کە بینی خەڵکەکە چەپڵەیەکی زۆر لێ دەدەن ئەویش ئاوڕی دایەوە پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم بینی، پێغەمبەر ئاماژەی بۆ کرد: کە لەشوێنی خۆت بمێنەرەوەو نوێژەکەمان بۆ تەواوکە... لە کۆتایی فەرموودەکەدا فەرمووی: (مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمْ التَّصْفِيقَ مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ)[314]. واتە: ئەوە بۆ ئەو هەموو چەپڵەتان لێدا هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ ڕوویدا بابڵێ: (سبحان الله) چونکە ئەگەر وتی: (سبحان الله) ئیتر تێدەگەن لەمەسەلەکە؛ بەڵام لە نوێژدا بە بەری دەست دان لە پشتی دەست بۆ ئافرەتانە.

(حافظ) ئیبن حەجەر دەڵێ: ئەم فەرموودە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئاوڕدانەوە لەناو نوێژدا ئەگەر پێویست بوو دروستە، قسەکردن لەگەڵ نوێژخوێن بە ئاماژە لەپێش ترە لە قسەکردن بە وتە.

**٢٥- پشت ڕێك نەکردنەوە لەکاتی وەستان و دانیشتندا:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان هەیە وەستانی لە نوێژدا تەواو نیە جارێ پشتی چەماندۆتەوە، جارێ خۆی دەخات بەلای ڕاست یان بەلای چەپدا، ئەمەش نەهی لێ کراوە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (لَا يَنْظُرُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى رَجُلٍ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ بَيْنَ رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ)[315]. واتە: خوای گەورە ناڕوانێتە نوێژی هیچ نوێژخوێنێك ئەگەر لە نێوان ڕکوع و سەجدەدا پشتی ڕێك نەکاتەوە.

---

314- رواه البخاري: (١١٤٣، ١١٤٦، ١١٦٠، ١١٧٧، ٢٥٤٤) ومسلم في الصلاة: (٤٢١).

315- أخرجه أحمد، والطبراني في الكبير بسند صحيح وقال المنذري: إسناده جيد.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی کرد بەو پیاوەی نوێژەکەی بە خراپی ئەنجام ئەدا فەرمووی: (ثم ارفع رأسك حتى تعتدل قائما (فيأخذ كل عظم مأخذه)). واتە: پاشان سەرت بەرزکەرەوە هەتا راست دەبیتەوە، بەشێوەیەك هەموو بڕبڕەیەك بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. لە ریوایەتێکی تردا فەرمووی: (وإذا رفعت فأقم صلبك وارفع رأسك حتى ترجع العظام إلى مفاصلها). واتە: کاتێ بەرزبویتەوە پشتت راستکەرەوەو سەرت بەرزکەرەوە هەتا هەموو بڕبڕەیەك بگەڕێتەوە شوێنی خۆی. پاشان فەرمووی: (أنه لا تتم صلاة لأحد من الناس إذا لم يفعل ذلك). واتە: نوێژی هیچ یەکێك لە ئێوە تەواو نیە هەتا ئەو شتە ئەنجام نەدات[٣١٦].

**٢٦- ئەهم ئەهم کردن لە نوێژدا:**

نوێژخوێن هەیە کاتێ هەستی کرد پێشنوێژ نوێژەکەی درێژە پێ دەدات، دەست دەکات بە ئەهم ئەهم کردن وەك ئەوەی بە پێشنوێژ بڵێ: درێژەت داوە بە نوێژەکەت. فەرمودەیەکی لاوازیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان کە لە عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ لِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَدْخَلَانِ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَكُنْتُ إِذَا دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّي تَنَحْنَحَ)[٣١٧]. واتە: دوو کاتی تایبەتیم هەبوو لە شەوو رۆژدا دەچووم بۆلای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ئەگەر بچومایە بۆلای مۆڵەتم دەخواست، جا ئەگەر نوێژی بکردایە ئەهم ئەهم یان کۆکەیەکی دەکرد.

لە سەهلی کوڕی سەعدەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلَاتِهِ فَلْيَقُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ، وَالتَّسْبِيحَ لِلرِّجَالِ)[٣١٨]. واتە: هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ رووبدا بابڵێ: (سبحان الله). چونکە بە بەری دەست دان لە پشتی دەست لەناو نوێژدا بۆ ئافرەتانە، وتنی: (سبحان الله)ش بۆ پیاوانە.

---

[316]– نقلا من مختصر مخالفات الطهارة والصلاة.

[317]– إسناده ضعيف، أخرجه النَّسَائِيُّ (٣/١٢) في كتاب «السهو»، وَابْنُ مَاجَه (٣٧٠٨)، وأحمد (٢/٤٣).

[318]– أخرجه البُخاري: (١/١٧٥) (٢/٨٤، ٨٩) (٣/ ١٣٩).

**٢٧- راكێشانی یەکێك لە مەئمومەکان بۆ ئەوەی نوێژی لەگەڵدا بکرێت:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ چوونە مزگەوت ئەگەر ریزەکان تەواو بوون، جێگەی نەبووەوە، لەدوای ریزەکانەوە دەوەستێ و یەکێك لەپێشی خۆیەوە رادەکێشێ بۆ تەنیشتی خۆی هەتا نوێژی لەگەڵدا بکات.

ئەم کەسە دەیەوێت لەدوای پێشنوێژەوە بەتەنیا نوێژ نەکات بەڵام دەکەوێتە ناو چەند هەڵەیەکەوە: دەبێتە هۆی پچڕانی ریزەکان، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەوبارەوە دەفەرموێت: (مَنْ وَصَلَ صَفّاً وَصَلَهُ اللهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفّاً قَطَعَهُ اللهُ)[319]. واتە: ئەو کەسەی بۆشایی پڕ بکاتەوە، خودایش بە رەحمەتی خۆی ئەو بەسەر دەکاتەوە، ئەو کەسەش ببێ بە هۆی دروستکردنی کەلێن لە ریزەکاندا، خواش پەیوندی لەگەڵ ئەو دەپچڕێ.

هەروەها هەموو موسڵمانان خشوع لەدەست دەدەن بە هۆی ئەو کەلێنەوە لە ریزەکەدا روودەدات.. ئەمەو جگە لەوەی ئازاری ئەو کەسە دەدات کە رایدەکێشێ بۆ تەنیشتی خۆی. بەڵکو کار دەگاتە رادەیەك ئەو کەسە دەیکاتە دەمەقاڵە لەکاتی نوێژدا.

ئیبن تەیمیە دەڵێ: دروستە کەسێك بە تەنیا نوێژ بکات ئەگەر عوزرێکی شەرعی هەبێت، حەنەفیەکانیش وا دەڵێن: ئەگەر هاتوو جێگا نەبوو تەنها لەدوای ریزەکانەوە نەبێت، چاکتر وایە بە تەنیا نوێژەکەی بکات و کەس رانەکێشێ بۆلای خۆی...[320].

**٢٨- ئاماژە بە پەنجەی شایەتمان لەکاتی بیستنی ناوێك لە ناوەکانی خوا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ گوێیان لە ئایەتێك بوو باسی ناوەکانی خوا و سیفاتەکانی دەکرد بۆ نمونە وەك ئەم ئایەتە: ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ الحشر: ٢٣. بە پەنجەی شایەتمان ئاماژە دەکەن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم. چونکە لە هیچ سەرچاوەیەکەوە نەهاتووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی و ئەوانەی کە لەدوای ئەوانیشەوە هاتوون ئەم کارەیان کردبێت.

---

319– رواه النَّسَائِيُّ والحاكم عن ابن عمر – صحيح الجامع: (٦٥٩٠).

320– الاختيارات الفقهية: (٤٢).

**٢٩- ڕێککردنی ریزەکان بە پەنجەکانی پێ:**

هەندێ لە نوێژخوێنان بیروباوەڕیان وایە ریزەکان ڕێك نابن ئیللا بە پەنجەکانی پێ نەبێت، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە.. چونکە سوننەت وایە شان و پاژنەکان ڕێکی یەکتربن.

لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە هاتووە دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەیرێکی خەڵکەکەی کردوو فەرمووی: (أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ – ثَلَاثًا – وَاللَّهِ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ). واتە: سێ جار لەسەریەك فەرمووی- ریزەکانتان ڕێك بخەن و پاڵ بدەن بەیەکەوە سوێند بە خوا یان ئەوەتا پاڵ دەدەن بەیەکەوە و ڕێك دەوەستن یا خوا دووبەرەکی و ناکۆکی دەخاتە نێو دڵەکانتانەوە.

نوعمان وتی: بینیم پیاو شانی دەنا بەشانی هاوڕێکەیەوە و ئەژنۆی دەنا بە ئەژنۆیەوە و پاژنەی دەنا بە پاژنەیەوە[٣٢١].

**٣٠- تەواونەکردنی ریزەکان:**

ئەم سەرپێچیە لە مزگەوتە گەورەکاندا بە ئاشکرا دەبینرێت - بۆ نمونە - کاتێ نوێژخوێن چووە مزگەوت بینی پێشنوێژ لە رکوعدایە لەترسی ئەوەی رکاتەکەی نەفەوتێت لەجیاتی ئەوە ئەو ریزەی پێشی پڕ بکاتەوە ریزێکی تازە دادەمەزرێنێ... ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

**٣١- ڕێك نەخستنی ریزەکان:**

لەئەنجامی تێ نەگەیشتنەوە ئەم سەرپێچیە زۆر دەکرێت، وای لێ هاتووە بە دەگمەن ریزێکی ڕێك وەك ئەوەی سەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەبینی.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ فوَاللَّهِ لَتُقِيمُنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ)[٣٢٢]. واتە: ریزەکانتان ڕێك بخەن و پاڵ بدەن بەیەکەوە سوێند بە خوا یان ئەوەتا پاڵ دەدەن بەیەکەوە و ڕێك رادەوەستن یا خوا دووبەرەکی و ناکۆکی دەخاتە نێو دڵەکانتانەوە.

---

[321]– رواه أحمد وأبو داود عن نعمان بن بشير – صحيح الجامع: (١١٩١).

[322]– رواه وأبو داود عن نعمان بن بشير – صحيح الجامع: (١١٩١).

هەروەها دەفەرمویت: (أقيموا صفوفكم و تراصوا فوالذي نفسي بيده إني لأرى الشياطين بين صفوفكم كأنها غنم عفر)[٣٢٣]. واتە: ریزەکانتان ریك بخەن و پاڵ بدەن بەیەکەوە، بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە کە خوایە لەنێو ریزەکاندا شەیتان دەبینم وەك مەڕی سپی.

وە دەفەرمویت: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ)[٣٢٤]. واتە: ریزەکانتان ریك بکەن چونکە ریکوپێکی ریزەکان بەشێکە لەتەواوی نوێژەکە.

**٣٢- ئینکاری کردنی هەندێ مەئموم لەگەڵ پێشنوێژەکەیان لەسەر ریزبەندی سورەتەکان:**

ئینکاری کردنی هەندێ مەئموم لەگەڵ پێشنوێژ کاتێ سورەتێ پێش سورەتێکی تر دەخات بە پێچەوانەی ریزبەندی سورەتەکانی قورئانەوە، بەڵکو هەندێکیان رێگری لە پێشنوێژ دەکات وەك ئەوەی کارێکی حەرامی کردبێت، ئەمەش لە نەزانی و تێ نەگەیشتنیانەوەیە، چونکە لەبارەی ریزبەندی سورەتەکانی قورئانەوە ناکۆکیەکی زۆر هەیە لەنێوان زانایاندا، کە ئایا کارێکی توقیفی یان ئیجتیهادیە لە هاوەڵانەوە هەتا ئەوەی کە ئیبن تەیمیە و ئیبن (کثیر) و جگە لەوانیش رایان وایە ریزبەندی سورەتەکانی قورئان بە ئیجتیهادی هاوەڵان بووە رەزای خوایان لێ بێ.

بەڵام دەڵێین: چاکتر وایە پێشنوێژ بە پێی ریزبەندی سورەتەکان قورئان بخوێنێت، سورەتێ پێش سورەتێکی تر نەخات، ئەگەر بەم شێوەیەی نەکرد ئەوە پێچەوانەی کاری چاکتری کردووە واتە تاوانی نەکردووە.

**٣٣- قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە سوننەتەکاندا (بێجگە لە شەونوێژ):**

هەندێ لە نوێژخوێنان بە دەنگی بەرز قورئان دەخوێنن لەو نوێژە سوننەتانەدا کە لەپێش یان لەدوای نوێژە فەرزەکانەوە دێن، ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، چونکە لە هیچ نوێژێکی سوننەتدا دەنگی بەرز نەدەکردەوە ئیللا لە شەونوێژدا نەبێت.

---

323– رواه الطيالسي وأبو داود عن أنس – صحيح الجامع: (١١٩٤).

324– متفقٌ عليه عن أنس – صحيح الجامع: (٣٦٤٧).

## ٣٤- داوای ڕەحمەت کردن کاتی گەیشتن بە ئایەتی ڕەحمەت:

هەندێ کەس وادەزانن کاتێ گەیشتن بە ئایەتی ڕەحمەت هەر دەبێت داوای ڕەحمەت لە خوای پەروەردگار بکەن، وە کاتێ گەیشتن بە ئایەتی سزا هەر دەبێت پەنابگرن بە خوا لە سزای ئاگر، فەرمودەکەی(حذیفة)یان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان کە دەفەرموێت: شەوێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم نوێژم دەکرد، دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الْبَقَرَة)، منیش وتم: لەسەری سەد ئایەت ڕکوع دەبات، بەڵام هەر بەردەوام بوو، جارێکی تر وتم: بە دوو ڕکات تەواوی دەکات، کەچی هەر بەردەوام بوو، وتم: کۆتایی پێ دەهێنێت و ڕکوع دەبات، پاشان سورەتی (النِّسَاء)ی دەست پێکرد کۆتایی پێهێنا، پاشان سورەتی (آلَ عِمْرَانَ)ی دەست پێکرد کۆتایی پێهێنا، خوێندنەوەکەشی لەسەرخۆ بوو هەرکە دەگەشت بە ئایەتێك تەسبیحاتی تێدا ببوایە: (سبحان الله)ی دەکرد، وە کاتێ کە دەگەیشت بە ئایەتێك داوای ڕەحمەتی تێدا بوایە داوای ڕەحمەتی دەکرد، کە دەگەشت بە ئایەتێك شوێنی پەناگرتن بوایە بە خوای پەروەردگار، پەنای پێ دەگرت، پاشان چووە ڕکوعەوە..)[٣٢٥].

لە ڕیوایەتی پێشەوا ئەحمەددا هاتووە، کە وتویەتی: کە دەگەشت بە ئایەتی ڕەحمەت داوای ڕەحمەت و بەزەیی دەکرد، کە دەگەشت بە ئایەتی سزا، پەنای دەگرت بە خوا لە سزا، کە دەگەشت بە ئایەتی باسی تەنزیهی خوای گەورەی بکردایە ، (سبحان الله)ی دەکرد[٣٢٦].

لەبەر ئەوە زانایان دەڵێن: - لای حەنەفیەکان و پێشەوا ئەحمەد- موستەحەببە بۆ ئەو کەسەی کە نوێژی سوننەت دەکات نەك فەرز داوا بکات کاتێ گەیشت بەو ئایەتانەی کە باسی داواکردن و ڕەحمەت و بەزەیی و بەهەشت و تەوبەو پەشیمانی یان هیواو ئومێدیان تێدایە، هەروەها پەنابگرێت بە خوا کاتێ گەیشت بەو ئایەتانەی کە باسی پەناگرتن لە سزاو ئاگر یان هەڕەشەیان تێدایە، (سبحان الله) بکات کاتێ گەشت بەو ئایەتانەی کە باسی پاك و بێگەردی خوا دەکەن.

---

325– أخرجه مسلم: (٧٧٢) .

326– أخرجه ابن ماجة: (١٣٥١) وأحمد: (٦/٢٤) بسند جيد.

پێشینەکان وەڵامیان داوەتەوە کە ئەمە لە نوێژی سونەتدا بووە، چونکە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نەهاتووە لە نوێژی فەرزدا پاڕابێتەوە لەکاتی قورئان خوێندنیدا لەگەڵ ئەو هەموو قورئان خوێندنەیدا بەرەوانی[٣٢٧].

**٣٥- قورئان خوێندن و یادی خوا بەدەنگی بەرز لە نوێژدا:**

زۆر لە نوێژخوێنان لە نوێژە نهێنیەکاندا بەدەنگی بەرز قورئان دەخوێنن (وەك نوێژی عەسر و نیوەڕۆ) یان لە رکاتی سێهەمی نوێژی شێوان و سێهەم و چوارەمی نوێژی خەوتناندا. بە رادەیەك دەنگ بەرزدەکەنەوە ئەوانەی لە تەنیشتیانەوەن خشوعیان لەدەست دەردەچێت، ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەتە.. چونکە بۆ مەئموم سوننەتە لە نوێژدا بەبێ دەنگی زیکر و یادی خوا بکات و قورئان بخوێنێ لەبەر ئەوە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نەهاتووە لەسەر ئەوەی بەدەنگی بەرز بیاخوێنێ.

**٣٦- شوێن نەکەوتنی پێشنوێژ:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ کە چوونە مزگەوت پێشنوێژ لە سەجدەدا بوو یان لەدانیشتنی نێوان سەجدەکاندا بوو یا تەحیاتی دەخوێند چاوەڕێ دەکەن هەتا پێشنوێژ هەڵدەسێت ئەو کاتە لەگەڵی دەستدەکەن بە نوێژکردن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

راستیەکەی ئەوەیە پێشنوێژ لەهەر حاڵەتێکدا بوو شوێنی بکەون و بیکەنە پێشەنگی خۆیان، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ الصَّلَاةَ وَالْإِمَامُ عَلَى حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الْإِمَامُ)[٣٢٨]. واتە: کاتێ یەکێکتان هات بۆ نوێژ پێشنوێژ لە هەر حاڵەتێکدا بوو ئێوەش وەك ئەو بکەن.

---

327– الدين الخالص: (٢/٢٧١).

328– رواه الترمذي عن علي ومعاذ – صحيح الجامع: (٢٦١).

### ٣٧- مانەوەی مەئموم لەدوای هەستانەوەی پێشنوێژ:

هەندێ لە نوێژخوێنان دوای ئەوەی پێشنوێژ هەڵدەسێتەوە بۆ رکاتێکی تر کەمێك دەمێننەوە ئەو کاتە هەڵدەسنەوە.. ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە واجبە مەئموم شوێنی پێشنوێژ بکەوێت لەبەر ئەم فەرمودەیە: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ...)[٣٢٩]. واتە: پێشنوێژ بۆیە دانراوە چاوی لێ بکرێت و شوێنی بکەون.

### ٣٨- چوونە رکاتێ لەپێش پێشنوێژەوە:

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ چوونە مزگەوت ئەگەر پێشنوێژ لە تەحیاتی ناوەڕاستدا بوو هەڵئەسایەوە بۆ رکاتی چوارەم ئەوا پێش ئەوەی پێشنوێژ بەپێوە بوەستێ مەئموم بە پێوە دەوەستێ و (الله اكبر) دەکات دەچێتە ئەو رکاتەوە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بەمە هۆشیاری داوە دەفەرموێت: (أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي إِمَامُكُمْ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ وَلاَ بِالْقِيَامِ وَلاَ بِالانْصِرَافِ...)[٣٣٠]. واتە: ئەی خەڵکینە من ئیمامی ئێوەم نە لەرکوعدا نە لەسەجدەدا نە لەکاتی وەستاندا نە لەکاتی سەلام دانەوەدا پێشم مەکەون.

---

[329]- متفق عليه عن أبي هريرة- صحيح الجامع: (٢٣٦٠).

[330]- أخرجه مسلم عن أنس: (٢/ ٢٨) .

**٣٩- نەزانین بە سوننەتی چۆنیەتی دەست بەرزکردنەوە:**

هەندێ کەس لەکاتی(الله اکبر)دا هەرگیز دەستیان بەرز ناکەنەوە، ئەگەر بەرزیشی بکەنەوە بەپێی سوننەت بەرزی ناکەنەوە، ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

شێخ ئەلبانی لەباسی چۆنیەتی دەست بەرزکردنەوەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دەڵێ: و (كان يرفع يديه تارة مع التكبير وتارة بعد التكبير وتارة قبله)[٣٣١]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم جاری وا هەبوو دەستەکانی لەگەڵ تەکبیرەی ئیحرامدا بەرزدەکردنەوە، جاری واش هەبوو دوای تەکبیرەی ئیحرام بەرزی دەکردنەوە، جاری تری واش هەبوو لەپێش تەکبیرەی ئیحرام بەرزی دەکردنەوە. و(كان يرفعهما ممدودة الأصابع (لا يفرج بينها ولا يضمها))[٣٣٢]. واتە: وە بە شێوەیەك بەرزی دەکردنەوە پەنجەکانی دەستی تێدا دەکردنەوە، [بێ ئەوەی لەیەکتر جیایان بکاتەوە، وە نەیشی دەبەستن]. و(كان يجعلهما حذو منكبيه وربما كان يرفعهما حتى يحاذي بهما (فروع) أذنيه)[٣٣٣]. واتە: وە هەتا ئاستی شانەکانی بەرزی دەکردنەوە، وە لەوانەشە بەرزی بکردنایاتەوە هەتا ئاستی نەرمەی گوێچکەکانی[٣٣٤].

---

331- رواه البخاري وأبو داود وابن خزيمة.

332- رواه أبو داود وابن خزيمة.

333- رواه البخاري وأبو داود.

334- صفة صلاة النبي للشيخ الألباني: (ص:٦٠).

٤٠- پێچەوانە تێگەیشتن لە مەبەستی کورت کردنەوەی نوێژ:

زۆر لە نوێژخوێنان تێگەیشتنیان لە مەبەستی کورت کردنەوەی نوێژ ئەوەیە: سورەتە کورتەکان یان ئایەتێ یا دوو ئایەت لە نوێژدا بخوێنرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی زیان پێ گەیاندن و ناتەواوی نوێژ، بەراستی ئەم کورت کردنەوەیە کرداری پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە، چونکە لە مەدینەدا جگە لەو ئیمامی تر نەبووە، لەدوایەوە نوێژیان دەکرد بەهێزو بێ هێز و لاواز، پیر و منداڵ، گەورە و بچوك، ئافرەت و پیاو، خاوەن عوزری شەرعی و ئەوانەی کاری پێویستیان هەبووە.

ئیبن قەیم دەڵێ: فەرمودەی: (أيكم أمّ بِالنَّاسِ فليخفف)[٣٣٥]. واتە: هەرکەستان بەرنوێژیتان بۆ خەڵك کرد با نوێژەکەی کورت کاتەوە. وە ئەوەی ئەنەس کە دەفەرموێت: (كان رسول الله أخف الناس صلاة في تمام)[٣٣٦]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە هەموو کەس زیاتر نوێژەکانی کورت و تەواو بوون. لێرەدا ئەم کورتیە شتێکی نیسبیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کارەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کە کردوویەتی و لەسەری بەردەوام بووە، نەك بۆ ئارەزووی نوێژخوێنەکان، چونکە فەرمانی بە شتێك نەدەکرد خۆی پێچەوانەی ئەو کارەی بکردایە، وە ئەو زانیویێتی ئەوانەی لەدوایەوە نوێژ دەکەن پیر و لاواز و خاوەن کاریان تێدایە، کەواتە ئەوەی کردوویەتی ئەو کورت کردنەوەیە کە فەرمانی داوە بکرێت[٣٣٧].

جا نوێژی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە لە کوێ و نوێژی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە کوێ کە ئەو پێشەنگ بووە لە ناوەندێتی و کورت کردنەوەدا، کە کورت کردنەوەکەی بە ئەندازەی دە تەسبیحات بووە[٣٣٨].

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِنِّي لأَقُومُ إِلَى الصَّلاةِ، وَأُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَأَتَجَوَّزَ)[٣٣٩]. واتە: جاری وا هەیە کە نوێژ دادەبەستم دەمەوێت درێژی بکەمەوە، بەڵام گوێم لە گریانی منداڵێك دەبێت، نوێژەکەم کورت دەکەمەوە[٣٤٠].

---

335- أخرجه البخاري : (٢/١٦٨) ومسلم: (٤٦٧) .

336- أخرجه البخاري : (٢/١٧٠) ومسلم: (٤٦٩) .

337- زاد المعاد: (٢/ ٢١٣) .

338- المجتبى للنسائي: (٢/ ٢٢٥).

339- أخرجه مسلم: (٤/١٨٦- ١٨٧) .

340- نقلا من أخطاء المصلين: (ص: ٧٤).

# هەڵە گوفتاری و کردارییەکان لە رکوعدا

**١- پێشکەوتنی پێشنوێژ لە چوونە رکوعدا:**

بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی کردووە لەوەی مەئموم پێش پێشنوێژ بکەوێ لە چوونە رکوع و سەجدەدا یا جگە لەوانیش. دەفەرموێت: (أَمَا يَخْشَى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الْإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللَّهُ رَأْسَهُ رَأْسَ حِمَارٍ)[341]. واتە: ئەو کەسەی سەری لە پێش پێشنوێژەوە بەرزدەکاتەوە ترسی ئەوەی نیە خوا سەری بکات بەسەری گوێدرێژ.

پێشەوا (خطابي) دەڵێ: خەڵك لەمەدا رایان جیاوازە لە ئیبن عومەرەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەو کەسەی کاری وەها بکات نوێژەکەی دروست نیە. بەڵام بەگشتی زانایان دەڵێن: نوێژەکەی ناتەواوە بەڵام دروستە.

بەڵام ئەو کەسەی لە (الله اكبر)ی نوێژ دابەستن و سەلام دانەوەدا پێش پێشنوێژ بکەوێ، بەبێ گومان ئەوە نوێژەکەی پوچەڵ دەبێتەوە.. ئەمەش رەئی جمهوری زانایانە.

**٢- ئارام نەبوون لە رکوعدا:**

ئەمەش هەڵەیەکە زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان تێی کەوتوون و دەیکەن.. هەڵەیەکە نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد بەو پیاوەی نوێژەکەی تەواو نەبوو نوێژەکەی بکاتەوە، پێی فەرموو: (ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ..). واتە: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە چونکە تۆ نوێژت نەکرد. پاشان پێی فەرموو چۆن نوێژ بکات: (ثُمَّ اركَع حتَّى تَطمَئِنَّ راكِعاً، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا...)[342]. واتە: پاشان بچۆ بەرکوعداو هێندە بوەستە تا جەستەت لە جوڵە دەکەوێت و ئارام دەبێتەوە، پاشان بەرزبەرەوە تا بەتەواوی راست دەبێتەوە.

هەروەها فەرمویەتی: (لَا تُجْزِئُ صَلَاةُ الرَّجُلِ حَتَّى يُقِيمَ ظَهْرَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ)[343]. واتە: نوێژی کەسێك تەواو نیە هەتا ئەو کەسە بەتەواوی پشتی راست دەکاتەوە لە رکوع و سەجدەدا. نوێژ تەواو نیە ئیللا بەم خشوعەوە نەبێت.

---

[341]– أخرجه البخاري: (١٨٢/٢)، ومسلم: (٤٢٧).

[342]– متفقٌ عَلَيْهِ. أخرجه البخاري : ١٩٢/١ ( ٧٥٧ ) ، ومسلم: ١٠/٢ ( ٣٩٧ ) ( ٤٥ ) .

[343]– رواه أبو داود والترمذي عن ابن مسعود، صحيح الجامع: (٧٢٢٤).

**٣- وتنی (إن الله مع الصابرين) له ركوعدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ چووه مزگەوت بینی پێشنوێژ لە ركوعدایە دەست دەکات بە ئەهم ئەهم کردن یان دەڵێ: (إن الله مع الصابرین). ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا پێشنوێژ چاوەڕێی بکات بۆ ئەوەی بگات بە ركوعدا..ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە خشوع لە براکانی تێك دەدات لە نوێژدا، بەڵکو ئەم کارە یەك ناکەوێت لەگەڵ ئەو ئادابەی کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فێری ئوممەتەکەی کردووە ئەویش چوون بۆ نوێژە بە ویقار و لەسەرخۆیی و ئارامی.

**٤- نەزانین بە سوننەتی چۆنیەتی چوونە ركوع:**

زۆر لە نوێژخوێنان شارەزای چۆنیەتی چوونە ركوع نین بۆیە دەبینین پشتیان کوڕ دەکەن و سەریان دەبەنەوە بۆ بەینی ئەژنۆکانیان.. ئەمەش هەڵەیە.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ركوعدا پشتی کوڕ نەدەکردەوە، بەڵکو پشتی پان و ڕێك و ڕاست دەکردەوە (بە شێوەیەك ئەگەر ئاوت بکردبایە بەسەر پشتیدا ڕادەوەستا) سەری نە نزمتر دەکردەوە لە ئاستی پشتی نە بەرزتری دەکردەوە لە ئاستی پشتی بەڵکو لە نێوانیاندا بوو.

هەر چوار مەزهەبەکە و جگە لەوانیش یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە سوننەتە لە ركوعدا بە هەردوو دەست ئەژنۆکان بگیرێ و پەنجەکان بکرێنەوەو پشت تەخت بکرێت و سەری نە بەرزتر نە نزمتر بێ لە پشت و، قۆڵ و ئانیشکەکان دووربخرێتەوە لە لاتەنیشت[٣٤٤].

**٥- وتنی(الله اکبر)ی نوێژ دابەستن لە ركوعدا:**

هەندێ نوێژخوێن کاتێ دواکەوتن لە نوێژی جەماعەت بینیان پێشنوێژ لە ركوعدایە بۆ ئەوەی ركاتەکەیان لەدەست دەرنەچێ بەپەلە ركوع دەبەن کاتێ لە ركوعدان(الله اکبر)ی نوێژ دابەستن دەڵێن، ئەمەش هەڵەیە. ڕاستیەکەی ئەوەیە دەبێت بەپێوە(الله اکبر)ی نوێژ دابەستن بوترێت، پاشان ركوع ببرێت، ئەگەر پەلەی بوو(الله اکبر)ی چوونە ركوع نەڵێ ئەوە نوێژەکەی دروستە، تەنها (الله اکبر)ی نوێژ دابەستنی بەسە.

---

[344]– نصب الراية: (١/٣٧٢).

**٦- نەزانین بەوەی دەست بەرزکردنەوە لەکاتی هەستانەوە لە رکوع سوننەتە:**

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (كَانَ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ رَفَعَ يَدَيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنْ الرُّكُوعِ رَفَعَهُمَا كَذَلِكَ)[345]. واتە: لەکاتی(الله اکبر)ی نوێژ دابەستندا دەستی بەرزدەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی، هەروەها لەپێش چوونە رکوع و دوای هەستانەوەش لە رکوع دەستی بەرزدەکردەوە.

کەچی هەندێ نوێژخوێن ئینکاری لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکەن ئەو سوننەتە ئەنجام دەدات، ئاگاداربن ئەویش سوننەتی دەست بەرزکردنەوەیە هەتا ئاستی شانەکان لەدوای هەستانەوە لە رکوع.. ئەمەش لە ئەنجامی نەزانی خۆیەتی بەو سوننەتەی کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت بووە.

**٧- تەرکی(الله اکبر)ی نێوان روکنەکان:**

زۆر لە نوێژخوێنان تەرکی(الله اکبر)ی نێوان روکنەکان دەکەن، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمانی کردووە بەو پیاوەی نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام نەدا: (... وَيَقْرَأَ مَا تَيَسَّرَ مِنْ الْقُرْآنِ مِمَّا عَلَّمَهُ اللَّهُ وَأَذِنَ لَهُ فِيهِ ثُمَّ يُكَبِّرَ وَيَرْكَعَ...)[346]. واتە: ئەوەش لە توانایدا هەبوو قورئان بخوێنێت لەوەی خوا فێری کردووە و رێی پێداوە تیایدا، پاشان (الله اکبر) بکات و رکوع ببات.

**٨- زیادکردنی وشەی «والشکر» لەکاتی هەستانەوە لە رکوع:**

هەندێ نوێژخوێن کاتێ هەستانەوە لە رکوع وشەی«والشکر» زیاد دەکەن...ئەوەی سابت بووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم لەکاتی هەستانەوە لە رکوعدا فەرمویەتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ (أو) رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ). واتە: پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ.

---

345 – أخرجه البخاري: (٢/١٨١)، ومسلم: (٣٩٠).

346– اخرجه أبو داود: (١/ ٢٢٧) بإسناد صحيح .

له ئەبو سەعیدی خودریەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع دەیفەرموو: (اللهم ربنا لك الحمد ملء السماوات وملء الأرض وملء ما شئت من شيء بعد أهل الثناء والمجد أحق ما قال العبد وكلنا لك عبد لا نازع لما أعطيت ولا ينفع ذا الجد منك الجد)[٣٤٧].

**٩- بیروباوەڕ بەوەی کە نابێ مەئموم بڵێ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَه):**

زۆر لە نوێژخوێنان باوەڕیان وایە وتنی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه). تایبەتە بە پێشنوێژەوە، نەك مەئموم، ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سابت بووە کە فەرمویەتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). واتە: خوای گەورە بیسەری سوپاسگوزاری ئەوانەیە سوپاسی دەکەن. پاشان فەرمویەتی: (رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ)[٣٤٨]. واتە: پەروەردگارا سوپاس و ستایش بۆ تۆ.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)[٣٤٩]. واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم.

بە کۆکردنەوەی ئەم دوو فەرمودە دەردەکەوێت کە کاتێ پێشنوێژ وتی: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه). دەبێت مەئموم بڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ، رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ).

**١٠- چوونە رکوع لەدوای ریزەوە:**

هەندێ نوێژخوێن کاتێ دواکەوتن دەبینن پێشنوێژ لە رکوعدایە دوور لە ریزەکان رکوع دەبەن، ئەمەش هەڵەیە.

لە (أبو بكرة)وە هاتووە، کە وتویەتی: گەیشتم بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە رکوعدا بوو منیش پێش ئەوەی بگەمە ریزەکە رکوعم بردو چوومە ناو ریزەکەوە، ئەوەم بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گێڕایەوە فەرمووی: (زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلَا تَعُدْ)[٣٥٠].

---

[347]– أخرجه مسلم: (٤٤٧)الصلاة، والنسائي: (٢/ ١٩٨– ١٩٧) في الإفتتاح.

[348]– أخرجه البخاري: (٧٩٥).

[349]– أخرجه البخاري وأحمد – الإرواء: (٣١٣).

[350]– أخرجه البخاري عن أبي بكرة: (٧٨٣).

واتە: خوا پەرۆشیت زیاد بکات بۆ دینەکەت بەڵام دووبارەی نەکەیتەوە... وتەی: (وَلَا تَعُدْ). دووبارەی نەکەیتەوە، چونکە لە رکوعدا ڕۆشتن وەك رۆشتنی حەیوانە.

هەروەها زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی نوێژ بە تەنیا لە دوای ریزەکانەوە کەراهەتی هەیە، بەڵکو هەندێکیشیان بە حەرامیان داناوە وەك پێشەوایان ئەحمەد و ئیسحاق و هەندێ لە فەرمودەناسانی پەیڕەوانی پێشەوا شافیعی وەك ئیبن خوزەیمە.

پێشەوا ئەحمەد دەڵێ: هەرکەس لەدوای ریزەکانەوە بە تەنیا نوێژی دابەست، پاشان چووە ناو ڕیزەکەوە بەرلەوەی لەڕکوع هەستێتەوە ئەوە نوێژەکەی دروستەو گێڕانەوەی واجب نیە. بە بەڵگەی فەرمودەکەی (أبو بكرة)، ئەگینا گێڕانەوەی واجب دەبوو بەگشتی فەرمودەکەی (وابِصة)ی کوڕی (معبد) هاتووە، کە وتویەتی: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ)[٣٥١]. واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پیاوێکی بینی لەدوای ریزەکانەوە نوێژی دەکرد، فەرمانی پێکرد نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە[٣٥٢].

**١١- حیساب کردنی رکوعێکی فەوتاو:**

هەندێ نوێژخوێن هەیە کاتێ هات بۆ نوێژ دەبینێ پێشنوێژ لە رکوعدایە ئەیەوێ لەدوایەوە رکوع بەرێ، پێشنوێژ راست دەبێتەوە دەڵێ: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَه). ئەویش لەدوای هەستانەوەی پێشنوێژ رکوع دەبات و بەپەلە سێ جار دەڵێ: (سُبحَانَ رَبِّي العَظِيمِ وَبِحَمدِهِ). وادەزانێت فریای ئەو رکاتە کەوتووە، ئەمەش لە نەزانینیەوەیەتی، چونکە فریای پێشنوێژ نەکەوتووە لە رکوعداو ئەو رکاتەشی بۆ حیساب ناکرێ.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا جِئْتُمْ الصَّلَاةَ وَنَحْنُ فِي سُجُودٍ فَاسْجُدُوا وَلَا تَعُدُّوهَا شَيْئًا وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلَاةَ)[٣٥٣]. واتە: کاتێ هاتن بۆ نوێژ ئەگەر ئێمە سەجدەمان بردبوو ئێوەش سەجدە بەرن بەڵام بە ڕکاتی دامەنێن، هەرکەس گەیشت بە رکوع ئەوە ئەو رکاتەی بۆ حیساب کراوە.

---

351– أخرجه أصحاب السنن وصححه أحمد وابن خزيمة وغيرهما.

352– فتح الباري: (٢/٣١٢– ٣١٣).

353– رواه أبو داود والحاكم والبيهقي عَن أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٤٦٨).

### ١٢- سەیرکردنی پێکان لە رکوعدا:

دەبینین هەندێك نوێژخوێن هەیە كاتێ یەكێك لەوانە چووە ركوعەوە سەیری جێگە سەجدەكەی ناكات، بەڵكو سەیری بەرپێی خۆی دەكات وە كاتێكیش چووە سەجدەوە سەیری باوەشی خۆی دەكات، ئەمەش هەڵەیەو پێچەوانەی سوننەتە چونكە بێگومان سابت بووە لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم كە لەهەموو نوێژەكەیدا سەیری جێگە سەجدەكەی خۆی كردووە تەنها لەكاتی تەحیاتدا نەبێ كە سەیری جێگە سەجدەكەی یان پەنجەی شایەتومانی كردووە.

### ١٣- قورئان خوێندن لە رکوعدا:

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی كردووە لەوانەی لە ركوع یان لە سەجدەدا قورئان دەخوێنن دەفەرموێت: (..أَلاَ وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا)[٣٥٤]. واتە: من ئەوەم لێ قەدەغەكراوە لە ركوع و سەجدەدا قورئان بخوێنم.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نەهی دەكرد لە قورئان خوێندن لە ركوع و سەجدەدا، بەڵكو سوننەتە لە ركوعدا تەسبیحات و لەسەجدەدا تەسبیحات و دوعا بخوێنرێت، ئەگەر جگە لە سورەتی فاتحە بخوێنرێت كەراهەتی هەیە بەڵام نوێژەكە پوچەڵ ناكاتەوە، بەڵام ئەگەر فاتحە بخوێنرێت ئەوە هاوەڵانمان دوو رای جیاوازیان هەیە لەسەری:

یەكەم – خوێندنی سورەتی فاتحە لە ركوع و سەجدەدا وەكو غەیری فاتحە وایە كەراهەتی هەیە بەڵام نوێژەكە پوچەڵ ناكاتەوە كە ئەم قەولە راسترین قەولە.

دووهەم – حەرامە و نوێژەكەی پوچەڵ دەكاتەوە ئەگەر بەقەستی بوو، بەڵام ئەگەر بە سەهو بوو كەراهەتی نیە، بە رای پێشەوا شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێ بەقەستی بێ یان بە سەهو ئەبێ سەجدەی سەهو بەرێت[٣٥٥].

---

[354]– اخرجه مسلم عن ابن عباس رضي الله عنهما: (٤٧٩).

[355]– مسلم بشرح النووي: (٤/٢٦٢).

### ١٤- قورئان خوێندن گەیاندنە ناو (الله اکبر)ی رکوع:

دەبینین زۆر لە ئیمامەکان هەتا دەگەنە (الله اکبر)ی رکوع قورئان دەخوێنن بەبێ وەستان یان کەمێ بێدەنگی لە نێوان قورئان خوێندن و (الله اکبر)دا، ئەمەش هەڵەیە، چونکە پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، مەبەست لەمە ئەو فەرموودەیە کە لە لاپەڕە: (١٣٧)دا لە (أشعث)ەوە هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوو وەستانی بچوکی هەبووە، دووەم دانەیان: (وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ كُلِّهَا)، واتە بەر لە رکوع.

### ١٥- دەست بەرزکردنەوە بەشێوەی دوعاکردن لەکاتی هەستانەوە لە رکوع:

هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی هەستانەوە لە رکوع بەشێوەی دوعاکردن دەستیان بەرزدەکەنەوە... ئەمەش لە سوننەتی پێغەمبەر نیە صلی الله علیه وسلم، چونکە کاتێ لە رکوع راست دەبووەوە دەستەکانی بەرزدەکردەوە هەتا ئاستی شانەکانی و نەرمایی گوێچکەی، بەڵام بەشێوەی دوعاکردن بەرزی نەدەکردەوە.

### ١٦- درێژکردنەوەی قنوت لەلایەن پێشنوێژەوە:

یەکێکی تر لە سەرپێچیەکان ئەوەیە هەندێك لە پێشنوێژەکان درێژە دەدەن بە پاڕانەوەی قنوت ئەمەش دەبێتە هۆی قورسی و گرانی و ئازار بۆ مەئمومەکان -بەتایبەتی بۆ بەساڵاچووان - لەکاتێکدا کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هانی موسڵمانانی داوە چاویان لەحاڵەتی نوێژخوێنانەوە بێت دەفەرموێت: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِلنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ فَإِنَّ مِنْهُمْ الضَّعِيفَ وَالسَّقِيمَ وَالْكَبِيرَ وَإِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَا شَاءَ)[٣٥٦]. واتە: ئەگەر یەکێك لەئێوە پێشنوێژی کرد بۆ موسڵمانان با درێژەی پێ نەدات چونکە ئەوانەی لەدوایەوەن هەیانە لاوازە یان نەخۆشە یا بەساڵاچووە، بەڵام ئەگەر تەنها بوو چەندە توانای هەیە درێژەی پێ بدات.

[356]- متفقٌ عَلَيْهِ عَن أَبِي هُرَيْرَةَ – صحيح الجامع: (٦٥٨).

**١٧- مەسحی دەم و چاو لەدوای پاڕانەوەی قنوت:**

هەندێك لە نوێژخوێنان لەدوای پاڕانەوەی قنوت و جگە لەویش دەست دەهێنن بە دەم و چاویاندا... ئەم کارە پێویستی بە بەڵگەی شەرعی هەیە.

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە لەوەڵامێکیدا لەوبارەوە دەڵێ: دەربارەی دەست بەرزکردنەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەکاتی پاڕانەوەدا فەرمودەی صەحیحی زۆر هەیە، بەڵام بۆ مەسحی دەم و چاو یەك دوو فەرمودە هەیە نابن بە بەڵگە.. خوای پەروەردگاریش زاناترە[٣٥٧].

[357]– الفتاوى الكبرى: (١٨٩/١).

# سەرپێچیە گوفتاری و کرداریەکان لە سەجدەدا

**١- خۆبەردانەوە و ڕۆشتن بۆ سەجدە لەسەر ئەژنۆکان:**

زۆر لە نوێژخوێنان کاتێ دەیانەوێ بڕۆن بۆ سەجدە لەسەر ئەژنۆکان خۆیان بەردەدەنەوەو دەچنە سەجدەوە، ئەمەش دروست نیە ئیللا لە حاڵەتێکدا نەبێت کە عوزرێکی شەرعی هەبێ - وەك نەخۆشی و جگە لەویش.

سوننەتی سابت ئەمەیە کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە، کە وتویەتی: (کان یضع یدیه علی الأرض قبل رکبتیه)[٣٥٨]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی دەخستە سەر زەوی.

وە فەرمانیشی بەوە دەکردو دەیفەرموو: (إِذَا سَجَدَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَبْرُكْ كَمَا يَبْرُكُ الْبَعِيرُ وَلْيَضَعْ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ)[٣٥٩]. واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە سەجدەی برد با وەکو وشتر نەکات، بەڵکو دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بخاتە سەر زەوی.

هەروەها دەیفەرموو: (إِنَّ الْيَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ وَإِذَا رَفَعَ فَلْيَرْفَعْهُمَا)[٣٦٠]. واتە: دەستەکان سەجدە دەبەن هەروەك چۆن رووخسار سەجدە دەبات، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە رووخساری دانا با دەستەکانیشی دابنێت، ئەگەر بەرزی کردەوە با دەستەکانیشی بەرزبکاتەوە.

**٢- ڕاخستنی باسکەکان و جووت بوونی بن باڵ:**

ئەمەش یەکێکە لە سەرپێچیە باوەکان کە بڵاوبۆتەوە لەناو نوێژخوێناندا، ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

---

358- رواه ابن خزيمة: (١/٧٦/١) ، و الحاكم وصححه وافقه الذهبي.

359- أخرجه أبو داود والتمام في الفوائد: (ق ١٠٨/ ١) والنسائي بسند صحيح.

360- رواه ابن خزيمة: (١/٧٩/١)، وأحمد، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (كان لا يفترش ذراعيه). واتە: باسکەکانی رانەدەخست، بەڵکو (كان يرفعهما عن الأرض ويباعدهما عن جنبيه حتى يبدو بياض إبطيه من ورائه)[361]. بەرزی دەکردنەوە لە زەوی و دووری دەخستنەوە لە لاکانیەوە هەتا بن هەنگڵەکانی دەردەکەوت بۆ کەسێك لە پشتیەوە وەستا بێت، (حتى لو أن بهمة أرادت أن تمر تحت يديه مرت)[362]. بەشێوەیەك ئەگەر بەرخۆلەیەك بیویستایە بە ژێر باڵیدا تێپەڕ ببێ تێپەڕ دەبوو.

وە زۆر زیادەڕۆیی تێدا دەکرد هەتا هاوەڵانی دەیانفەرموو: (إنا كنا لنأوي " نرق " لرسول الله صلى الله عليه وسلم مما يجافي بيديه عن جنبيه إذا سجد)[363]. واتە: ئێمە دڵمان دەسووتا بۆ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبەرئەوەی ئەوەندە دەستەکانی دوور دەکردەوە لە لاکانی کە سەجدەی دەبرد.

وە فەرمانیشی بەوە دەکرد دەیفەرموو: (إذا سجدت فضع كفيك وارفع مرفقيك)[364]. واتە: ئەگەر سەجدەت برد ناولەپەکانت دابنێ و ئانیشکەکانت بەرزکەرەوە.

وە دەیفەرموو: (اعتدلوا في السجود ولا يبسط أحدكم ذراعيه انبساط ( وفي لفظ: كما يبسط) الكلب)[365]. واتە: رێك ببنەوە لە سەجدەکانتان، دەستەکانتان رامەخەن هەروەك چۆن سەگ دەستەکانی رادەخات.

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: (ولا يفترش أحدكم ذراعيه افتراش الكلب)[366]. واتە: با هیچ کەسێك لە ئێوە دەستەکانی رانەخات هەروەك چۆن سەگ دەستەکانی رادەخات.

---

361 – أخرجه البخاري: ٣٨٣–٧٧٤، و مسلم: ٤٩٥ .

362 – أخرجه مسلم: ٤٩٦ .

363 – رواه أبو داود وابن ماجه بسند حسن.

364 – رواه مسلم وأبو عوانة.

365 – رواه البخاري ومسلم.

366 – رواه أحمد والترمذي وصححه.

وە دەیفەرموو: (لا تبسط ذراعيك (بسط السبع) وادعم على راحتيك وتجاف عن ضبعيك فإنك إذا فعلت ذلك سجد كل عضو منك معك)[٣٦٧]. واتە: دەستەکانت رامەخە هەروەك چۆن دڕندە دەستەکانی رادەخات، هێز بدە سەر هەردوو لەپی دەستت مەچەکەکانیشت لە خۆت دوور خەرەوە، ئەگەر ئەوەت ئەنجامدا، ئەوا هەموو ئەندامێکت لەگەڵتدا سەجدە دەبات[٣٦٨].

**٣- (الإقعاء) لە نوێژدا:**

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (وَنهاني خليلي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عن إقعاء كإقعاء الكلب)[٣٦٩]. واتە: خۆشەویستەکەم صلى الله عليه وسلم نەهی لێ کردووم وەك دانیشتنی سەگ دابنیشم کەپێی دەوترێت(الإقعاء).

ئەبو عبیدە دەڵێ: (الإقعاء) بریتیە لە دانانی هەردوو بەشی پاشەوەی (سمت) لەسەر زەوی و دانانی هەردوو پێی و هەردوو دەستەکانی لەسەر زەوی وەك دانیشتنی سەگ.

**٤- خۆبەردانەوە بۆ سەجدە لەگەڵ پێشنوێژدا یان لەپێشیەوە:**

یەکێکی تر لە سەرپێچیەکان خۆبەردانەوەیە لەگەڵ پێشنوێژدا یان لەپێشیەوە بۆ سەجدە، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم بێگومان هاوەڵان رەزای خوای لێ بێ نەدەجولان هەتا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناوچاوانی نەخستایەتە سەر زەوی.

لە بەرائی کوڕی عازبەوە هاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم نوێژمان دەکرد کاتێك دەچووە رکوع ئێمەش بەدوایا دەچوینە رکوعەوە، کاتێ سەری بەرزدەکردەوە لە رکوع و دەیفەرموو: (سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ). ئێمەش بەدوایا سەرمان بەرزدەکردەوەو بەردەوام بەپێوە دەبووین هەتا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ناوچاوانی دەخستە سەر زەوی، پاشان ئێمەش دوای دەکەوتین[٣٧٠].

---

[367] – رواه ابن خزيمة والمقدسي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

[368] – صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ للشيخ الألباني: (ص: ١١٠– ١١١).

[369] – أخرجه الطيالسي وأحمد وحسنه الألباني في صفة صلاة: (ص: ٩٨).

[370]– اخرجه مسلم عن البراء: (٤/٢٥٤) (ح١٩٩).

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەمەش ئەدەبێکە لە ئادابەکانی نوێژ، سوننەت وایە مەئموم خۆی بەرنەداتەوە بۆ سەجدە هەتا پێشنوێژ ناوچاوانی نەخاتە سەر زەوی ئیللا مەگەر شارەزای حاڵی بێت کە ئەگەر ئەوەندە چاوەڕێ کات ئەوا پێشنوێژ لە سەجدە هەڵدەسێتەوە[٣٧١].

**٥- سەجدە نەبردن لەسەر حەوت ئەندامەکە:**

بێگومان هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ سەجدە دەبەن لەسەر لوتیان سەجدە دەبەن ناوچاوانیان ناخەنە سەر زەوی - یان بە پێچەوانەوە- وە پێیەکیان گیردەکەن لەزەوی و پێیەکەی تریان بەرزدەکەنەوە...یان هەردووکیان بەرزدەکەنەوە یا یەکێکیان لەسەر ئەوی تریان دادەنێن. ئەمانەش هەر هەموویان پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرن صلی الله علیه وسلم.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعٍ: الْجَبْهَةِ وَالأَنْفِ وَالْيَدَيْنِ وَالرُّكْبَتَيْنِ وَالْقَدَمَيْنِ)[٣٧٢]. واتە: فەرمانم پێکراوە لەسەر حەوت ئەندام سەجدە بەرم ئەوانیش: ناوچاوان و، لوت و، هەردوو دەست و، هەردوو ئەژنۆو، هەردوو پێکان.

**٦- قورئان خوێندن لە سەجدەدا:**

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لەوانەی لە ڕکوع یان لە سەجدەدا قورئان دەخوێنن دەفەرموێت: (..أَلاَ وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا)[٣٧٣]. واتە: من ئەوەم لێ قەدەغەکراوە لە ڕکوع و سەجدەدا قورئان بخوێنم.

**٧- گەڵ بڵاوکردنەوە لە سەجدەدا:**

زۆر لە نوێژخوێنان لەکاتی سەجدەدا گەڵیان بڵاودەکەنەوە. ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە ئەو پێکانی جووت دەکردن و دەیچەقاندن بە زەویدا، سەری پەنجەکانی ڕوو دەکرنە قیبلە.

---

[371]- مسلم بشرح النووي: (٤/٢٥٤).

[372]- أخرجه مسلم: (٤٠٧) والترمذي: (٢٧٢).

[373]- أخرجه مسلم: (٢٠٧) عن ابن عباس – كتاب الصلاة.

حیکمەت لەمەدا ئەوەیە عەورەت داپۆشراو بێت، چونکە پیاو گەڵی بلاوبکاتەوە عەورەتی دەردەکەوێت ئەگەر پۆشاکەکەی پارچە پارچە بێت.

**٨- وازهێنان لە پاڕانەوەی ناو سەجدە:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لە سەجدەدا هەر (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى) دووبارە دەکەنەوە، ناپاڕێنەوە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانی موسڵمانانی داوە لە سەجدەدا زۆر بپاڕێنەوە دەفەرموێت: (أَقْرَبَ مَايَكونَ العَبْدُ مِن ربّه وَهُوَ ساجِدٌ، فَأَكْثَروا الدعاء)[٣٧٤]. واتە: نزیك ترین جێگە کە بەندە لە پەروەردگاریەوە نزیك بێت، ئەو کاتەیە کە لە سەجدەدا بێت، کەواتە لەوکاتەدا زۆر بپاڕێنەوە. بێگومان پاڕانەوە لە سەجدەدا گیرایە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە سەجدەدا دەیفەرموو: (اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ وَجِلَّهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَعَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ)[٣٧٥]. واتە: خوایە لەهەموو تاوانەکانم خۆش ببە، گەورە و بچوکی، سەرەتاو کۆتایی، ئاشکراو پەنهانی

هەروەها لە فەرمودەکەی پێشەوا عەلیدا هاتووە، کە فەرمویەتی: (اللّٰهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللّٰهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)[٣٧٦]. واتە: خوایە سەجدەم بۆ تۆ بردو، باوەڕم بە تۆ هێناو تەسلیمی تۆ بووم، رووم سەجدەی برد بۆ ئەو خوایەی کە بەدیهێناوەو وێنەی کێشاوەو بیستن و بینینی بۆ داڕشتووە، گەورە و پیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترینی بەدیهێنەرانە.

**٩- سەرپێچی لە چۆنیەتی دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە:**

هەندێ نوێژخوێن شارەزانین لە سوننەتی چۆنیەتی دانیشتنی نێوان سەجدەکان، دەبینین هەیانە پێیەکی لەسەر پێکەی تری دادەنێت و...هتد.

---

374– أخرجه مسلم: (٤٨٢) الصلاة وأبو داود: (٨٧٥).

375– أخرجه مسلم: (٤٨٣) الصلاة.

376– أخرجه مسلم: (٧٧١) صلاة المسافرين.

ئەوەی لە سوننەتدا لەو بارەوە هاتووە فەرمودەکەی عائیشەیە رەزای خوای لیٚ بیٚ کە لە باسی چۆنیەتی دانیشتنی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دەفەرمویٚت: (...وَكَانَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى... وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عُقْبَةِ الشَّيْطَانِ...)[377]. واتە: پێی چەپی رادەخست و پێی راستی دەچەقاند بە زەویدا... وە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەهی کردووە لە شێوە دانیشتنی شەیتان - وە شێوەی دانیشتنەکەی لە دانیشتنی سەگ دەچێت. ئەویش بریتیە لە دانانی هەردوو بەشی دواوەی (سمت)و دەستەکانی لەسەر زەوی و چەقاندنی هەردوو پیٚ.

**١٠- وازهێنان لە پاڕانەوەی دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکە:**

ئەمەش هەڵەیەکی ترە لە هەڵەکانی نوێژخوێنان.. چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا ئەم زیکرو دوعایانەی دەخوێند: (اللَّهُمَّ اغفِر لِي وارحَمني [واجبِرني] [وارفعني] واهدني و[عافني] وارزقني)[378]. واتە: خوایە لێم خۆش ببەو رەحمم پیٚ بکەو نوقسانیم تەواو بکەو پلەو پایەم بەرزکەرەوەو رێنمایم بکەو پارێزراو و لەش ساغم بکەو رۆزیم بدە.

هەندیٚ جاریش دەیفەرموو: (رَبِّ اغفِر لي، ربِّ اغفِرلي)[379]. واتە: پەروەردگارم لێم خۆش ببە، پەروەردگارم لێم خۆش ببە.

**١١- ئارام نەگرتن لە سەجدەدا:**

ئەمەش خوای گەورە دەیزانێت بەڵایەکە لەزۆربەی نوێژخوێنان روویداوە، بێگومان ئەوەندە بەپەلە نوێژ دەکەن جەستەیان لەجووڵە ناکەوێت بەتایبەتی لەسەجدەدا، بێگومان ئارام نەگرتن لەنوێژدا دەبێتە هۆی پوچەڵ بوونەوەی نوێژ، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو پیاوەی نوێژەکەی بەتەواوی ئەنجام نەدا فەرموو: (ارْجِعْ فَصَلِّ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ..).

---

[377]- أخرجه مسلم: (٢٤٠) الصلاة.

[378]- رواه أبو داود والترمذي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

[379]- رواه ابن ماجة، وحسنه الألباني في صفة صلاة النبي: (ص: ١١٨).

واتە: بگەڕێرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە تۆ نوێژت نەکرد. پاشان فەرمانی پێکرد ئارام بگرێت لە سەجدەدا پێی فەرموو: (إذا أنت سجدت فأمكنت وجهك ويديك حتى يطمئن كل عظم منك إلى موضعه)[380]. واتە: ئەگەر تۆ سەجدەت برد نێوچاوان و دەستەکانت لەزەوی جێگیر بکە هەتا هەموو ئێسکێکی جەستەت ئارام دەگرێت. لە ریوایەتێکی تردا پێی فەرمووە: (إِذَا سَجَدْتَ فَمَكِّنْ لِسُجُودِكَ)[381]. واتە: ئەگەر تۆ سەجدەت برد ئەندامەکانی سەجدەت جێگیر بکە لە زەویدا.

هەروەها فەرمویەتی: (أَسْوَأُ النَّاسِ سَرِقَةً الَّذِي يَسْرِقُ مِنْ صَلَاتِهِ) واتە: خراپترین دز ئەو کەسەیە دزی لە نوێژەکەی دەکات. وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن دزی لە نوێژەکەی دەکات؟ فەرمووی: (لَا يُتِمُّ رُكُوعَهَا وَلَا سُجُودَهَا)[382]. رکوع و سەجدەکانی بەتەواوی نابات.

جارێکیان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی دەکرد بە لاچاو سەیری کرد پیاوێك پشتی بەتەواوی راست نەدەکردەوە لە رکوع و سەجدەکانیدا، کە لە نوێژەکەی بووەوە فەرمووی: (يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ إِنَّهُ لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَا يُقِيمُ صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ)[383]. واتە: ئەی موسڵمانان، نوێژی تەواو نیە ئەو کەسەتان کەپشتی بەتەواوی راست نەکاتەوە لە رکوع و سەجدەدا.

لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت: (لاَ تُجْزِئُ صَلاَةُ الرَّجُلِ حَتَّى يُقِيمَ ظَهْرَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ)[384]. واتە: هیچ کەسێك نوێژی بەرناکەوێت هەتا پشتی راست نەکاتەوە لە رکوع و سەجدەکانیدا[385].

380– رواه ابن خزيمة: (١/١٠/١). وحسنه الألباني في صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

381– رواه أبو داود وأحمد، وصحيحه الألباني في صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ.

382– رواه ابن أبي شيبة: (٢/٨٩/١) وطبراني والحاكم ووافقه الذهبي.

383– رواه ابن أبي شيبة: (١/٨٩/١) وابن ماجة وأحمد بسند صحيح.

384– صحيح، رواه عوانة وأبو داود: (٨٥٥) والسهمي: (٦١) وصححه دار القطني.

385 – نقلا من صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ للشيخ الألباني: (ص: ٩٩).

**١٢- زۆر نەمانەوە لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا:**

ئیبن قەیم رەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (زاد المعاد): (١/ ٢٣٩)دا دەڵێ: سوننەت و رێبازی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وەهابووە ئەوەندە ئەم روکنەی درێژ دەکردەوە بە ئەندازەی درێژی سەجدەکانی، لەهەموو فەرمودەکانیدا بەم شێوەیە هاتووە و سابت بووە، لە فەرمودەی صەحیح دا لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقْعُدُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ حَتَّى نَقُولَ قَدْ أَوْهَمَ)[٣٨٦]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا ئەوەندە دەمایەوە هەتا کەسی وا هەبوو دەیوت: لەوانەیە لەبیری چووبێت. ئەم سوننەتە دوای نەمانی سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم خەڵکانێکی زۆر وازیان لێ هێناوە.

لەبەر ئەمەیە (ثابت) دەڵێ: ئەنەس کارێکی کردووە نابینم ئێوە بیکەن، لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدا ئەوەندە دەمایەوە هەتا کەسی وا هەبوو دەیوت: لەوانەیە لەبیری چووبێ[٣٨٧].

بەڵام ئەو کەسەی کە سوننەت جێبەجێ بکات و لەبیری دژەکانیدا نەبێت ئەوا گوێ نادات بەو شتانەی کە پێچەوانەی سوننەتە.

**١٣- سەجدەبردن لەکاتی دانیشتنی پێشنوێژدا:**

زۆر لە نوێژخوێنان کاتێك چوونە مزگەوتەوە دەبینن پێشنوێژ لە دانیشتنی نێوان دوو سەجدەکەدایە یان دانیشتووە بۆ خوێندنی تەحیات، ئەویش خۆی بەردەداتەوە بۆ سەر زەوی و سەجدە دەبات پاشان دادەنیشێت وەك چۆن پێشنوێژ دانیشتووە ئەمەش هەڵەیە.. چونکە سوننەت وایە لەنوێژدا پێشنوێژ لە چ حاڵەتێکدا بوو ئەویش بچێتە ئەو حاڵەتەوە.

---

[386]- أخرجه مسلم: (٤٧٣) الصلاة.

[387] - أخرجه البخاري: (٢/ ٢٤٩) صفة الصلاة - ومسلم: (٤٧٣) الصلاة.

### ١٤- بەرزکردنەوەی شتانێك بۆ ئەوەی سەجدەی لەسەر ببرێت:

هەندێ کەس ئەگەر توانای ئەوەیان نەبوو لەسەر زەوی سەجدەبەرن لەکاتێکدا کە عوزرێکیان هەبوو وەك نەخۆشی یان لەسەفەرا بوون شتێ بەرزدەکەنەوە سەجدەی لەسەر دەبەن، بۆ نمونە هەیە جانتاکەی بەرزدەکاتەوە، یان هەیانە ژێرەخەرەکەی بەرزدەکاتەوە ئەمەش لە هەڵەیانەوەیە، چونکە دەبێت بۆ رکوع و سەجدەکەیان بنوشێنەوە بەڵام دەبێت ئەندازەی نوشانەوەکەیان بۆ سەجدەبردن زیاتر بێت لە رکوعەکەیان.

لە (عبداللە)ی کوڕی عومەرەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیه وسلم سەردانی نەخۆشێکی کرد، کاتێك چووینە ژوورەوە لەسەر دارێك نوێژی دەکرد، ناوچاوانی دەخستە سەر دارەکە، پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم دارەکەی لابرد و فڕێیدا، پاشان پشتیەکی هێنا بۆ ئەوەی نوێژەکەی لەسەر بکات، پێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم پێی فەرموو: (دَعْهَا عَنْكَ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَسْجُدَ عَلَى الأَرْضِ ، وَإِلا فَأَوْمِئْ إِيمَاءً ، وَاجْعَلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكِ)[٣٨٨]. واتە: لایبە لەخۆتی دوورخەرەوە ئەگەر توانیت لەسەر زەوی نوێژەکەت ئەنجام بدە، ئەگەر نا تەنها بە ئاماژەکردن نوێژەکانت ئەنجام بدە، با سەجدەکانت نزمتر بێت لە رکوعەکانت.

فەرمودەکە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژ ئەنجامدان بە ئاماژەکردن دروستە، بەشێوەیەك نوشتانەوە بۆ سەجدەکان نزمتر و نزیکتر بێت لە زەویەوە لە رکوعەکان نەك ئەوەی شتێ بەرزبکرێتەوە بۆ ئەوەی سەجدەی لەسەر ببرێ[٣٨٩].

### ١٥- پەنجە جوڵاندن لەنێوان دوو سەجدەکەدا:

ئەمەش کارێکی باوە لەناو نوێژخوێناندا.. پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی اللە علیه وسلم، ئەوەی لەوەوە سابت بووە ئەوەیە پەنجەی نەجوڵاندووە ئیللا لە تەحیاتدا نەبێ.

---

388- أخرجه الطبراني (٢٦٩/١٢) عن ابن عمر باسناد صحيح.

389 - أخطاء المصلين: (ص: ٩٣- ٩٤).

١٦- كۆكردنەوەی پەنجەكان لە سەجدەدا:

هەندێ لە نوێژخوێنان ئەگەر یەکێکیان سەجدە بەرێ بە شێوەی مشتەکۆڵە پەنجەکانی دەستی کۆدەکاتەوە، ئەمەش ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم بێگومان دەفەرموێت: (إِنَّ الْيَدَيْنِ تَسْجُدَانِ كَمَا يَسْجُدُ الْوَجْهُ فَإِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ وَجْهَهُ فَلْيَضَعْ يَدَيْهِ وَإِذَا رَفَعَ فَلْيَرْفَعْهُمَا)[٣٩٠]. واتە: دەستەکانیش سەجدە دەبەن هەروەك چۆن روخسار سەجدە دەبات، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە روخساری دانا با دەستەکانیشی دابنێت، ئەگەر بەرزیکردەوە با دەستەکانیشی بەرزکاتەوە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم متمانەی دەکردە سەر دەستەکانی - واتە لە سەجدەکانیدا - رای دەخستن، پەنجەکانی دەلکاندن بەیەکەوە و رووی دەکردنە قیبلە[٣٩١].

١٧- درێژکردنەوەی سەجدەی دووهەمی رکاتی کۆتایی:

ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە سەجدەکانی وەك رکوعەکانی بووە هیچ جیاوازیەکیان نەبووە لە درێژکردنەوەدا -زۆربەی جار بەم شێوەیە بووە- بەڵام دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان سەجدەی کۆتایی بە ئاشکرا درێژ دەکەنەوە، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە.

390- رواه ابن خزيمة: (١/٧٩/١)، وأحمد، وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

391 – الأحاديث كلها أوردها الألباني بسند صحيح في صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ص: ١٠٨).

## ئەو سەرپێچیانەی پەیوەندیان بە تەحیاتەوە هەیە

**١- هەڵەکانیان لە چۆنیەتی سلاواتدانـدا:**

زۆر لە نوێژخوێنان بەجوانی سلاوات نادەن لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، لە چۆنیەتی سلاواتداندا هەڵە دەکەن ئیتر بە گۆڕین بێت یا بە زیادکردن کە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم نەهاتووە و سابت نەبووە.

(خیرالدین وائلی) دەڵێ: زیادکردن و گۆڕینی سلاواتی ئیبراهیمی دروست نیە، چونکە وشەکانی تەحیات و سلاواتی ئیبراهیمی تەوقیفین و دیاریکراون لەلایەن پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کاتێ پرسیاریان لێکرد لەوبارەوە[٣٩٢].

شێوەی سلاواتدان لەسەر خۆی صلی الله علیه وسلم روون کردۆتەوە بۆ هاوەڵانی کاتێ پرسیاریان لێکرد وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چۆن سلاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[٣٩٣]. [٣٩٤].

**٢- پەنجە نەجوڵاندن لە تەحیاتدا:**

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان پەنجەیان ناجوڵێنن لەکاتی شایەتوماندا بەڵکو بە توندی پەرپەرچی ئەو کەسانەش دەدەنەوە کە ئەم کارە دەکەن.

لە راستیدا پەنجە جوڵاندن شتێکی دروستە و لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت بووە.. بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (يبسط كفه اليسرى على ركبته اليسرى ويقبض أصابع كفه اليمنى كلها ويشير بإصبعه التي تلي الإبهام إلى القبلة ويرمي ببصره إليها)[٣٩٥].

---

[392] – دلائل الخيرات: (ص:٢٩).

[393] – اخرجه البخاري: (٦/ ٢٩٢) والترمذي: (٤٨٣) واحمد: (٥/ ٢٧٤).

[394] – نقلا من أخطاء المصلين: (ص: ٨١).

[395] – رواه مسلم وأبو عوانة وأبن خزيمة.

واتە: دەستی چەپی دەکردەوەو لەسەر رانی چەپی دایدەنا، هەموو پەنجەکانی دەستی راستی دەنوقاندو ئاماژەی بەو پەنجەیەی دەکرد کە لە دوای پەنجە گەورەکەی دێت رووەو قیبلەو چاوی تیێ دەبڕی.

وە (كان إذا أشار بإصبعه وضع إبهامه على إصبعه الوسطى)[٣٩٦]. واتە: کاتێك ئاماژەی بە پەنجەی بکردایە، پەنجە گەورەکەی لەسەر پەنجەی ناوەڕاستی دادەنا.

جاری واش هەبوو: (كان يحلق بهما حلقة)[٣٩٧]. واتە: بازنەیەکی بە پەنجە گەورەکەی و پەنجەی ناوەڕاستی دروست دەکرد.. وە (كان رفع إصبعه يحركها يدعو بها)[٣٩٨]. واتە: پەنجەی شایەتی بەرزدەکردەوەو دەیجولاندو دوعای پێ دەکرد. وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەیفەرموو: (لَهِيَ أَشَدُّ عَلَى الشَّيْطَانِ مِنْ الْحَدِيدِ، يَعْنِي: السَّبَّابَةَ)[٣٩٩]. واتە: قورس ترە لەسەر شەیتان لەوەی کە بە ئاسن لێی بدەیت، واتە: پەنجەی شایەتومان.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: ئەمە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە سوننەتە بەردەوام بێت لەسەر رووکردنی پەنجەی شایەتومان بەرەو قیبلەو جولاندنی هەتا سەلام دانەوە، چونکە پاڕانەوە پێش سەلام دانەوەیە، ئەمەش بۆچوونی پێشەوا مالیك و جگە لەویشە، پرسیار کرا لە پێشەوا ئەحمەد: ئایا پیاو لە نوێژدا پەنجەی دەجولێنێت؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، زۆر بە توندی، ئەمەش (ابن هانيء) باسی کردووە لە کتێبی (مسائله عن إمام أحمد: ١/٨ ) چاپی کتێبخانەی ئیسلامی.

هەروەها دەڵێم: لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە پەنجە جولاندن لە تەحیات و شایەتوماندا سوننەتێکی سابت و سەلمێنراوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم پێشەوا ئەحمەد و جگە لەویش لە پێشەوایانی سوننەت کاریان پێ کردووە، جا با ئەو کەسانە لە خوا بترسن وادەزانن کە ئەمە گاڵتەکردنەو لەگەڵ نوێژدا ناگونجێت، لەبەر ئەمە پەنجەیان ناجولێنن لەگەڵ ئەوەشدا دەزانن ئەمە سەلمێنراوە و راستە، زۆر لە خۆیان دەکەن بۆ گۆڕینی ماناکەی کە ناگونجێ لەگەڵ بنەماکانی زمانەوانی عەرەبی و پێچەوانەی تێگەیشتنی پێشەوایانە.

---

396– رواه مسلم وأبو عوانة.

397– رواه أبو داود والنسائي، وأبن خزيمة: ١/٧٦ وابن حبان في صحيحه: ٤٨٥.

398– رواه أبو داود وابن حبان في صحيحه.

399– رواه أحمد والبزار وأبو جعفر وحسنه في المشكاة: ١/٩١٧.

فەرمودەی: (إنه كان لا يحركها). واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پەنجەی نەدەجولاند. سەلمێنراو نیە لە رووی سەنەدەوە، وەك چۆن سەلماندوومە لە (ضعيف سنن أبي داود: ١٧٥)دا، وە ئەگەر سەلمێنراویش بێت نەفی دەكات، وە فەرمودەكەی تر ئەم بابەتە دەسەلمێنێت، وە سەلمێنەریش دەخرێت بەسەر نەفیكاردا، وەك زانراوە لای زانایان، بۆیە ئەمە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوانەی دەڵێن پەنجە جولاندن سوننەت نیە[400].

٣- وتنی: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ):

لە كاتێكدا كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زیندوو بوو بەم شێوەیە وتراوە: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ). بەلام لەدوای وەفاتی هاوەلان رەزای خوایان لێ بێ وتویانە: (السَّلَام عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ).

لە ئیبن مەسعودەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: دەستم لەناو دەستی پێغەمبەری خوادا بوو صلى الله عليه وسلم كە تەحیاتی فێركردم، هەروەك چۆن سورەتێك لە سورەتەكانی قورئانی فێردەكردم: (التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَام عَلَيكَ أيّها النَّبِيِّ...)[401].

شێخ ئەلبانی دەڵێ: وتەكەی ئیبن مەسعود كە دەڵێ: دەمانوت: (السَّلَام عَلَى النَّبِيِّ). واتە: هاوەلان رەزای خوایان لێ بێ لەكاتێكدا كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زیندوو بوو لەتەحیاتدا دەیانوت: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ).، بەلام پاش كۆچی دوایی دەیانوت: (السَّلَام عَلَى النَّبِيِّ). دەبێت ئەمە لەلایەن پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم خۆیەوە بێت، ئەوەش كە پاڵپشتی ئەمە دەكات ئەوەیە كە عائیشە رەزای خوای لێ بێ بەم شێوەیە تەحیاتی فێردەكردن: (السَّلَام عَلَى النَّبِيِّ)[402].

---

400 – صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ص: ١٢٣– ١٢٤).

401– رواه البخاري ومسلم وابن أبي شيبة: (١/٩٠/٢).

402 – رواه السراج في مسنده: (ج ٩/ ١/ ٢) ، والملخص في الفوائد: (ج ١١/ ٤٥/ ١) بسندين صحيحين عنها.

پێشەوا (حافظ ابن حجر) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: رووکەشی ئەم زیادەیە ئەوە دەگەیەنێت: ئەوان لە پێشدا دەیانوت: (السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ). بە (ك) کە ئامرازی قسە لەگەڵ کردنە رووبەڕوو، بەڵام دوای ئەوەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم مرد وازیان هێنا لە ئامرازی رووبەڕوو بە ئامرازی نادیار باسیان دەکرد و دەیانوت: (السَّلَام عَلَى النَّبِيِّ)[403].

**٤- وتەی کەراهەتی هەیە تەواوکردنی سلاواتی ئیبراهیمی لە تەحیاتی یەکەمدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان وادەزانن کە سلاواتدان لە تەحیاتی یەکەمدا کەراهەتی هەیە، ئەمەش هەڵەیەو بەڵگەی شەرعی لەسەر نیە هەرگیز.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە تەحیاتی یەکەم و جگە لەویش سلاواتی لەسەر خۆی دەدا، وە کردوویەتی بە سوننەت بۆ ئوممەتەکەی، بەوەی کە فەرمانی پێ کردوون بە سلاواتدان لەسەری پاش سەلام لێ کردنی.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: ئەمە بەڵگەی ئەوەی تێدایە: کە دروست و شەرعیە سلاوات لەسەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بدرێت لە تەحیاتی یەکەمدا، وە ئەمە رای مەزهەبی پێشەوا شافیعیە، وەك لە کتێبی (الأم)دا بەڕاشکاوی ئەمەی باس کردووە، وە ئەمەش بە راست زانراوە لەلای شوێنکەوتوانی پێشەوا شافیعی، وەك بە ئاشکرا پێشەوا نەوەوی لە کتێبی (المجموع: ٣/٤٦٠)دا باسی کردووە، وە بە بۆچوونی بەهێز و راشکاوی داناوە لە کتێبی (الروضة: ١/٢٦٣)دا چاپی کتێبخانەی ئیسلامی، وە ئەمەش هەڵبژاردەی (وزیر)ی کوڕی (هبيرة الحنبلي)یە لە کتێبی(الإفصاح)دا، وەك ئیبن رەجەبی حەنبەلی لێیەوە گێڕاویەتیەوە لە کتێبی (ذيل الطبقات: ١/٢٨٠)دا بێ دەنگیش بووە لێی، وە چەندین فەرمودە هاتووە لەسەر سلاواتدان لە تەحیاتدا، بەڵام لە هیچیاندا نەهاتووە تایبەت کرابێ بە تەحیاتی یەکەمەوە، بەڵکو فەرمودەکان گشتین و هەموو تەحیاتێك دەگرێتەوە.

---

[403] – صفة صلاة النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: (ص: ١٢٦).

هەروەها ئەو وتەیەی کە دەڵێ: کەراهەتی هەیە لە تەحیاتی یەکەمدا زیاتر لە: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ ...) بخوێنرێت، ئەمەش هیچ بنەمایەکی نیە لە سوننەتدا و بەڵگەی لەسەر نیە، بەڵکو بۆچوونمان وایە هەرکەس وا بکات ئەوە فەرمانە پێشوەکەی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم جێبەجێ نەکردووە بڵێین: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ، وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ...). تا کۆتایی فەرمودەکە[٤٠٤].

**٥- ئاماژە بە هەردوو پەنجەی شایەتمان لە تەحیاتدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان دەبینین یەکێ لەوان کاتێ دانیشت بۆ تەحیات خوێندن ئاماژە بە هەردوو پەنجەی شایەتمان دەکات، ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە سەلمێنراوە و سابت بووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئاماژەی بە پەنجەی شایەتمانی دەستی ڕاستی کردووە.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بینی بە پەنجەکانی دەپاڕایەوە پێی فەرموو: (أَحِّدْ أَحِّدْ وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ)[٤٠٥]. واتە: تەنها بە یەکێکیان بە پەنجەی شایەتمان ئاماژە بکە.

لە (صحیح مسلم)دا هاتووە، کە وتویەتی: (کان صلی الله علیه وسلم یبسط کفه الیسری علی رکبته الیسری ویقبض أصابع کفه الیمنی کلها ویشیر بإصبعه التي تلي الإبهام إلی القبلة ویرمي ببصره إلیها)[٤٠٦]. واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەستی چەپی دەکردەوەو لەسەر ڕانی چەپی دایدەنا، هەموو پەنجەکانی دەستی ڕاستی دەنوقاندو ئاماژەی بەو پەنجەیەی دەکرد کە لە دوای پەنجە گەورەکەی دێت ڕووەو قیبلەو چاوی تێ دەبڕی.

**٦- زیادکردنی (سیدنا) لە تەحیاتدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لە تەحیاتدا وشەی (سیدنا) زیاد دەکەن و دەڵێن: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى سیدنا محمد..). ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە، چونکە نەسڵ لە هەموو عیبادەت و پەرستشێکدا شوێنکەوتنی ئەوەیە کە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هاتووە، ئەمە لەتەواوی خۆشەویستییە بۆی.

---

404 – صفة صلاة النبي: (ص: ١٢١).

405 – رواه النسائي والحاكم عن سعد وعن أبو هريرة – صحيح الجامع: (١٨٩).

406 – رواه مسلم وأبو عوانة وأبن خزيمة.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم گەورە و سەیدمانە رابەر و پێشەوامانە مامۆستاو پێشەنگمانە، بەڵام بە جوانترین شێوەی شوێنکەوتنی ئەو خواپەرستی دەکەین بەو شێوەیەی کە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە.

لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و لە هاوەڵان و ئەوانەی دوای ئەوانیشەوە نەهاتووە وشەی (سیدنا)یان لە تەحیاتدا وتبێ، سوێند بە خوا ئێمە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بە سەیدی خۆمان دەزانین بەڵام ئێمە بۆمان نیە لە سوننەت و عەقیدە و گوفتار و کرداری ئەو لابدەین.

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: وتەی (سیدنا) لە تەحیاتدا و لەغەیری تەحیاتدا هیچ بنەمایەکی نیە لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و شوێنکەوتوانەوە نەهاتووە ئیللا ئەم فەرموودە نەبێ: (لا تسیدوني في الصلاة). ئەویش هیچ بنەمایەکی نیە (لا تسیدوني) هەڵەیە دەبوایە بوترایە: (لا تسؤّدوني). بەڵام ئەگەر صحیح بوایە دەبووە بەڵگە بۆ ئێمە، ئەگەر وتنی: (سیدنا) دروست بوایە لای هاوەڵان شاراوە نەدەبوو چونکە ئەوان زاناترین کەس بوون بەوەی خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێ[407].

**٧- تەوەڕوك لە رکاتی دووەمداو ئیفتراش لە رکاتی چوارەمدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکانی نوێژخوێنان.

لە رکاتی دووهەمدا ئیفتراش سوننەتە، واتە: قاچی چەپ رابخات و قاچی راست هەڵبێنێت وە لەسەر قاچی چەپ دابنیشێت، تەوەڕوکیش لە دانیشتنی تەحیاتی دووەمدا سوننەتە، واتە: قاچی چەپ بۆ لای راست لە ژێر پێی راستیەوە دەربکات و قاچی راستیشی داچەقێنێت لەسەر پەنجەکان بەرەو رووگە، لای چەپیشی بخاتە سەر زەوی.

پێشەوا شافیعی رای وایە تەوەڕوك لە دانیشتنی کۆتایی نوێژدا دەبێت جا ئیتر نوێژەکە دوو رکاتی بێ وەك نوێژی بەیانی و هەینی یان سێ رکاتی و چوار رکاتی بێ[408].

---

407 – السنن والمبتدعات: (ص: ٦٥).

408 – بداية المجتهد: (١/١٣٤-١٣٥).

له فەرمودەکەی ئەبو حومەیدی ساعدیەوە هاتووە، دەربارەی شێوەی نوێژەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەڵێت: (فإذا جلس في الركعتين جلس على رجله اليسرى ونصب اليمنى، فإذا جلس في الركعة الاخيرة قدم رجله اليسرى ونصب الاخرى وقعد على مقعدته) واتە: کاتێ بۆ تەحیاتی یەکەم دادەنیشت لەسەر پێی چەپی دادەنیشت پێی راستی هەڵدەنا، بەڵام ئەگەر بۆ تەحیاتی کۆتایی دابنیشتایە قاچی چەپی دەبردە پێشەوە بۆ ژێر راستی و ئەوی تریانی هەڵدەنا و لەسەر سمتی دادەنیشت[٤٠٩].

**٨- دووبارە کردنەوەی تەحیات یان بێ دەنگی (لە جیاتی پاڕانەوە):**

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ کە لە تەحیات خوێندن بوونەوە پێشنوێژ بەردەوام دانیشتبوو ئەوا تەحیات دووبارە دەکەنەوە، یان هەندێکیان بێ دەنگ دەبن و هیچ ناڵێن.

بەوەی تەحیات دووبارە دەکاتەوە دەڵێم: بە بیدعەیە هەستاوی پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: (مَنْ أحْدَثَ في أمْرِنا هَذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ)[٤١٠]. واتە: هەر کەسێك شتێك لەم ئاین و شەرعەی ئێمە زیاد بکات، ئەوە لێی قبوڵ ناکرێت و دەدرێتە دواوە.

هەروەها بەوەی کە بێ دەنگ دەبێ دەڵێم: هیچ قورسیەکەی تێدا نیە لە جیاتی ئەو بێ دەنگیە لە دوای تەواوکردنی سلاواتی ئیبراهیمی لە خوای گەورە بپاڕێتەوە، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی:

(إِذَا قَعَدْتُمْ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ فَقُولُوا التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ.... وَلِيَتَخَيَّرْ أَحَدُكُمْ مِنْ الدُّعَاءِ أَعْجَبَهُ إِلَيْهِ فَلْيَدْعُ بِهِ رَبَّهُ عَزَّ وَجَلَّ)[٤١١]. واتە: ئەگەر لە هەموو دوو رکاتێکدا دانیشتن ئەوا بڵێن: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ....پاشان هەر پاڕانەوەیەکی بەدڵ بوو پێی بپاڕێتەوە لە خوای پەروەردگار.

---

[409] – أخرجه البخاري عن أبي حميد الساعدي: (٢/٣٠٥) والترمذي: (٢٦٠).

[410]– مُتَفَقٌ عَلَيْهِ عن عائشة – صحيح الجامع: (٥٩٧٠).

[411]– رواه النسائي واحمد والطبراني في الكبير: (٣/ ٢٥/ ١) بسند صحيح.

### ٩- هەستانەوە پێش سەلام دانەوەی پێشنوێژ:

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ لە نوێژی جەماعەت دواکەوتن بۆ نمونە کاتێ پێشنوێژ رکاتێ لە پێشیەوە بوو یان دانیشتبوو بۆ تەحیات خوێندنی کۆتایی هەرکە پێشنوێژ ویستی سەلام بداتەوە بەپەلە هەڵئەسنەوە بۆ تەواوکردنی نوێژەکەیان.. ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە . چونکە سوننەت وایە دەبێ چاوەڕێ بکات هەتا پێشنوێژ سەلام دەداتەوە ئەو کاتە هەستێ بۆ ئەنجامدانی رکاتە فەوتاوەکەی.

### ١٠- تەرکی پەناگرتن لە چوار شتەکە پێش سەلام دانەوە:

زۆر لە نوێژخوێنان پەنا ناگرن بە خوا لەو شتانەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی پێ کردووین لە پێش سەلام دانەوەدا پەنا بگرین بە خوا لێیان.

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: ئەگەر یەکێ لە ئێوە لە تەحیاتی دووهەم بووەوە ئەوا با پەنا بگرێت لە چوار شت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَمِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ شَرِّ (فِتْنَةِ) الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ)[٤١٢]. پاشان بپاڕێتەوە بەوەی بە چاکی دەزانێت بۆ خۆی[٤١٣، ٤١٤].

---

412– مسلم وأبو عوانة والنسائي وابن الجارود في المنتقى: (٧٢).

413 – ئەوەی زیاتری دەوێ لەوبارەوە با سەیری (صفة صلاة النبي) لائەرە: (١٤٥– ١٤٦) بکات.

414 – دوعای زۆر هاتووە کە پێغەمبەر صلى الله علية وسلم هاوەڵانی فێرکردووە لەدوای تەحیات و پێش سەلامدانەوە بیانخوێنن.

# هەڵەکانی کاتی سەلام دانەوەو دوای سەلام دانەوە

**١- سەر لەراندنەوە لەکاتی سەلام دانەوەدا:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی سەلام دانەوەدا بەتوندی سەریان دەلەرێننەوە.. ئەم کارەش نەسەلمێنراوە و سابت نەبووە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم.

**٢- دەست بەرزکردنەوە لەکاتی سەلام دانەوەدا:**

زۆر لە نوێژخوێنان لەکاتی سەلام دانەوەدا بەلای راست و چەپیاندا دەستەکانیان بەرزدەکەنەوە، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم، بەڵکو ئەم کارەشی قەدەغەکردووە بە بەڵگەی ئەم فەرمودە:

لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووەهاتووە، کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژمان دەکرد کاتێك سەلامان دایەوە بەدەستمان دەمانوت: (السّلام عَلَيكُم. السّلام عَلَيكُم). پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەیری کردین و فەرمووی: (مَا شَأْنُكُمْ تُشِيرُونَ بِأَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمُسٍ إِذَا سَلَّمَ أَحَدُكُمْ فَلْيَلْتَفِتْ إِلَى صَاحِبِهِ وَلاَ يُومِئْ بِيَدِهِ)[٤١٥].

واتە: ئەوە چیتانە ئاماژە بەدەستەکانتان دەکەن، دەڵێی کلکی ئەسپی تۆڕە؟ ئەگەر یەکێك لە ئێوە سەلامی دایەوە تەنها لابکاتەوە بەلای هاوڕێکەی و ئاماژە بەدەستەکانی نەکات.

**٣- هەستانەوە پێش سەلام دانەوەی پێشنوێژ:**

یەکێکی تر لەو سەرپێچیانەی کە بڵاوبۆتەوە لەناو نوێژخوێناندا هەستانەوەیە بۆ ئەو رکاتانەی کە فەوتاون کاتێ دواکەوتوون لە پێشنوێژ - لە پێش یان سەرەتای سەلام دانەوەی پێشنوێژ - ئەمەش هەڵەیەکی ئاشکرایە.

پێشەوا شافیعی رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەگەر پێشنوێژ لە نوێژدا شتێ پێشتان کەوت هەڵمەسنەوە بۆ ئەنجامدانی ئەوەی فەوتاوە هەتا پێشنوێژ هەردوو سەلام دەداتەوە.

---

[415]- أخرجه مسلم عن جابر بن سمورة: ٤/ ٢٠٢/ ح ١٢١.

**٤- بەدەنگی بەرز سڵاواتدان لەدوای سەلام دانەوە:**

ئەم کارە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانیەتی.

سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەکێکە لە گەورەترین پەرستشەکان، بەڵام دەبێت بەو شێوەیە بێت کە لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، بەڵکو سڵاواتدان بەدەنگی بەرز لەدوای سەلام دانەوە لە ڕێبازی سەلەف نیە.

**٥- وتەکەیان: (اللهم أدخلنا الجنة. وأسألك النجاة من النار):**

یەکێکی تر لەو هەڵانەی بڵاوبۆتەوە لەناو زۆربەی نوێژخوێناندا وتنی: (اللهم أدخلنا الجنة. وأسألك النجاة من النار)ە لەدوای سەلام دانەوە.

شێخ عەلی (محفوظ) دەڵێ: یەکێکی تر لەو بیدعەتە ناپەسەندانە وتنی: (اللهم أدخلنا الجنة)یە لەدوای سەلام دانەوەی یەکەم، وە وتنی: (وأسألك النجاة من النار) لەدوای سەلام دانەوەی دووهەمەوە... هەندێ لە پێشەوا شەرع زانەکان دەڵێن: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هیچ یەکێك لە زانایان کاری لەم شێوەیان نەکردووە بەڵکو بیدعەیەکی تازە داهێنراوە لە پاڕانەوەکانی نوێژدا لە جێگەی خۆیدا نیە، چونکە یەکێکیان بەینێ دەخاتە نێوان سەلام دانەوەی یەکەم و ئەوی تریشیان دەیگەیەنێ بە سەلام دانەوەی دووهەم، هیچ کەسێك بۆی نیە بەم شێوەیە بکات[٤١٦].

**٦- تەوقەکردن لەدوای سەلام دانەوەو وتنی: (تقبل الله) (حَرَماً):**

ئەم سەرپێچیە هەموو مزگەوتەکانی گرتۆتەوە، لە سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵان و شوێنکەوتوانی دوای ئەوانیش نیە، بەڵکو بیدعەیەو نەیانکردووە. وتنی: (تقبل الله). لەدوای سڵاودانەوە واتە: خوا قبوڵی بفەرمویێت، لە سوننەتی پێغەمبەر نیە صلی الله علیه وسلم و هاوەڵان و شوێنکەوتوانی دوای ئەوانیش نەیانکردووە.

---

[416]- الإبداع في مضار الابتداع: (ص: ٢٨٣).

پرسیاریان کرد له ئیبن تەیمیه وتیان: ئایا تەوقەکردنی دوای سەلام دانەوە سوننەتە یان نا؟

له وەڵامدا فەرمووی: سوپاس بۆ خوا، تەوقەکردن لەدوای سەلام دانەوە سوننەت نیه، بەڵکو بیدعەیه، خوای پەروەردگاریش زاناترە[417].

(عز)ی کوڕی (عبدالسلام) دەڵێ: تەوقەکردن لەدوای نوێژی بەیانی و عەسر بیدعەیه مەگەر بۆ کەسێك لەسەفەر بێتەوە لەدوای نوێژ بگات بە نوێژخوێنان تەوقەیان لەگەڵ بکات[418].

سوننەتی شەرعی ئەوەیە نوێژخوێن لەدوای سەلام دانەوە لە نوێژە فەرزەکان سێ جار بڵێ: (استغفر الله) بە نهێنی زیکرو دوعاکانی دوای نوێژ بخوێنێت لەجیاتی ئەوەی خۆی سەرقاڵ بکات بە سەلام کردنەوە لەوانەی لە تەنیشتیەوەن.

**٧- راستەوخۆ پاڕانەوە لەدوای سەلام دانەوە:**

دەبینین هەندێ لە نوێژخوێنان وازیان هێناوە لە پاڕانەوەی ناو سەجدە، لەکاتێکدا نزیکترین کاتی بەندە لە خواوە لە سەجدەدایە، پاشان هەرکە سەلامیان دایەوە یەکسەر دەپاڕێنەوە.. ئەمەش لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نیه.

ئیبن قەیم لە کتێبی (زاد المعاد: ١/ ٢٥٧- ٢٥٨)دا دەڵێ: پاڕانەوە لەدوای سەلام دانەوە روو بە قیبلە، لە سوننەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نیه، نە بە سەنەدی (صحیح) وە نە بە (حسن) نەهاتووە.

بەڵام تایبەت کردنی بە نوێژی بەیانی و عەسرەوە نە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نە خەلیفە راشیدینەکانی نەیانکردووە، رێنمایی ئوممەتەکەشی نەکردووە کە ئەو کارە بکەن، بەڵکو ئەوانە خۆیان ئەم کارەیان بینیوە و بە چاکیان زانیوە لە جیاتی سوننەتی دوای سەلام دانەوە، خوای پەروەردگاریش زاناترە.

---

417- الفتاوى لإبن تيمية : (٢٣/ ٢٣٩).

418- فتاوى عز بن عبدالسلام: (ص: ٤٦).

بەڵام ئەو پاڕانەوانەی کە پەیوەستن بە نوێـژەوە بـە گشتی لـە کـردەوەی ئـەون و فـەرمانی کردووە لە نوێژدا ئەنجامیان بدەن، ئەمە شایـستەی حـاڵی نوێژخوێنـە، چـونکە رووی کردۆتـە خوا و لێی دەپاڕێتەوە هەتا لە نوێژدایە، کاتێ سەلامی دایەوە ئەو گفتوگۆیە دەپچڕێت، ئـەو کاتەی لەدەست دەچێ کە لە خواوە نزیکە، ئیتر چـۆن واز لـە پاڕانـەوە دێـنێ لەکاتێکـدا کـە حاڵەتی نزیك بوونەوە و پاڕانەوە و رووکردنە خوایە، پاشان کاتێ سەلامی دایـەوەو کاتەکـەی لەدەست چوو ئەو کاتە دەپاڕێتەوە؟.

**٨- راستەوخۆ سەجدەبردن لەدوای سەلام دانەوە:**

بەڵکو دەبینین هەندێ کەس کاتێ سەلامیان دایـەوە یەکـسەر سـەجدە دەبـەن ئەگـەر لێیـان بپرسی بۆچی سەجدە دەبەی؟ پێت دەڵێ: سوپاسی خوا دەکەم و بۆ ئـەوەی بپاڕێمـەوە سـەجدە دەبەم...ئەمەش هەڵەیە.

ئەی براکانم سوێند بە خوا ئەگەر جڵەوی خۆمان بدەینە دەست هەواو ئارەزووەکانمان هەموو مەشخەڵ و زانستەکانی دین دەگۆڕین، بەڵام پێویستە لەسەرمان بەپێی شەرع و سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە خوا نزیك بینەوە و کردەوەی چاکە بکەین.

**٩- تەسبیحات و داوای لێ خۆشبون کردن بە کۆمەڵ لەدوای سەلام دانەوە:**

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی کە لەدوای تەواو بوونی نوێژ روو دەدەن-بەتایبـەتی لەناوچە گونـد نـشینەکاندا- سـوننەت وایـە لـەدوای نوێـژ هەرکـەس بـۆ خـۆی بـەبێ دەنگـی تەسبیحات و (أستغفار) بکات - بەم شێوەیەش لە سوننەتدا هاتووە و سەلمێنراوە- بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ئازاردانی ئەوەی لە تەنیشتیەوەیەتی.

بەڵام وتەکەی ئیبن عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ: " لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم لەدوای تەواو بوونی نوێژ بە دەنگی بەرز زیکریان دەکرد "[419]، بێگومان ئیبن حەجەر دەڵێ: ئیبن (بطال) وتویەتی: لە(عتبیة)دا لە پێشەوا مالیکەوە هاتووە کە بیدعەیە،... پێشەوا نەوەوی دەڵێ: پێشەوا شافیعی ڕای وایە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ماوەیەکی کەم بەدەنگی بەرز کردویانە هەتا فێری چۆنیەتی زیکرکردن بن، بەڵام بەردەوام نەبوون لەسەری بەدەنگی بەرز، وتەی هەڵبژاردە ئەوەیە پێشنوێژو مەئموم دەبێ بە نهێنی زیکر بکەن مەگەر لەبەر پێویستی فێرکردن[420].

**١٠- بەکارهێنانی تەسبیح و تەرککردنی تەسبیحات بە سەری پەنجەکان:**

دەڵێم: چاکتر وایە تەسبیح بەکار نەهێنرێت، چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەسبیحاتی نەکردووە ئیللا بەسەری پەنجەکانی نەبێت.

چاکتر وایە بەدەستی ڕاست بکرێت چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم: (كَانَ يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ بِيَمِينِهِ)[421]. واتە: بەدەستی ڕاستی تەسبیحاتی کردووە.

عائیشە ڕەزای خوای لێ بێ فەرمووی: (كَانَ يُحِبُّ التَّيَامُنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي طُهُورِهِ وَتَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ، وفي شأنه كلّه)[422]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم حەزی دەکرد لە نەعل لە پێ کردندا و لە شانەکردندا و لە دەسنوێژدا و لە هەموو کارەکانیدا لەلای ڕاستەوە دەست پێ بکات.

تەسبیحات بە هەردوو دەست دروستە، بەڵام چاکتر وایە بەدەستی ڕاست بکرێت چونکە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت بووە و سەلمێنراوە.

---

419 – أخرجه البخاري: (٨٤١– ٨٤٢).

420 – الفتح: (٣٧٩/٢).

421– رواه أبو داود والترمذي والنسائي عن ابن عمر – صحيح الجامع: (٤٩٨٩).

422– متفق عليه عن عائشة – صحيح الجامع: ٤٩١٨.

**١١- خوێندنی فاتیحەو وتنی: « إلى حضرة النبي »:**

خوێندنی فاتیحە و پاشان وتنی: (إلى حضرة النبي صلى الله عليه وسلم) لەدوای نوێژ بیدعەکە لەسەردەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و هاوەڵاندا ڕەزای خوایان لێ بێ نەبووە و نەکراوە.

هەروەها خوێندنی(آية الكُرسي) بەدەنگی بەرز لەلایەن یەکێ لە نوێژخوێنانەوە و، پاشان تەسبیحات کردن لەدوایەوە یەکێکە لەو بیدعانەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هۆشیاری داوە خۆمانی لێ بپارێزین لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: (وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الْأُمُورِ فَإِنَّ كُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَإِنَّ كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ)[٤٢٣].

واتە: خۆتان بپارێزن لەکاروباری تازە داهێنراوەکان لە دیندا، چونکە هەموو کاروبارێکی تازە داهێنراو بیدعەیە، هەموو بیدعەیەکیش گومڕایی و سەر لێشێوانە.

**١٢- وتنی: (أستغفِرُ الله) لە سێ جار زیاتر:**

دەڵێم: زیکرکردن پەرستشێکە لە چاکترین پەرستشەکان، بەڵام لەنێوان ئەو زیکرانەدا هەیە پەیوەستن بە ژمارەوە ناتوانین لێیان زیاد بکەین یان لێیان کەم بکەینەوە... لە(ثوبان)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەدوای سەلام دانەوە لە نوێژ سێ جار دەیفەرموو: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ). واتە: داوای لێ خۆشبوون لە خوا دەکەم. پاشان دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ وَمِنْكَ السَّلَامُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ)[٤٢٤]. واتە: خودایە! ئەی پەروەردگار! سەلام ناوێکە لە ناوەکانی جوانەکانی تۆ و تۆ سەرچاوەی سەلام و سەلامەتی و ئاشتی و ئاسایش و پەناو هانای بەڕاستی تۆ زۆر پیرۆز و گەورەیت ئەی خاوەن شکۆ و بەقەدر.

بۆیە ئیتر بۆ هیچ کەسێ نیە زیاد لە سێ جار بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ) لەدوای نوێژ... لەدوای زیکرەکانی سەلام دانەوە حەز دەکات ملیۆنێجار یان زیاتر بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ).

---

[423]– رواه أحمد والترمذي عن العرباض بن سارية – صحيح الجامع: (٢٥٤٩).

[424]– أخرجه مسلم و أحمد عن الثوبان – صحيح الجامع: (٤٦٨٨).

### ١٣- زیادکردنی وشەی: « تعالیت » :

هەندێ لە نوێژخوێنان دوای نوێژ دادەنیشن بۆ زیکرکردن لە نێوان ئەو زیکرانەدا دەڵێن: (تَبَارَكْتَ وَتَعالَيْتَ يَاذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ) یان هەندێکیان دەڵێن: (وإليك يعود السلام)، ئەمەش هەڵەیە.

ئەوەی سابت بووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ئەمەیە فەرمویەتی: (تَبَارَكْتَ ياذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ)[٤٢٥].

### ١٤- خوێندنی دوو ئایەت لەدوای (آية الكُرسي)یەوە:

هەندێ لە نوێژخوێنان وادەزانن خوێندنی دوو ئایەت لەدوای (آية الكُرسي)یەوە راستەوخۆ سونەتە... ئەمەش هەڵەیە چونکە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانی داوین تەنها(آية الكُرسي) بخوێنین دەفەرموێت: (مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَمْنَعْهُ مِنْ دُخُولِ الْجَنَّةِ، إلا أن يموت)[٤٢٦]. واتە: هەرکەسێك لە دوای نوێژە فەرزەکان (آية الكُرسي) بیخوێنێ هیچ شتێ نابێتە رێگر لەنێوان ئەوو بەهەشتدا ئیللا مردن نەبێ.

---

[425]- أخرجه مسلم و أحمد عن الثوبان – صحيح الجامع: (٤٦٨٨).

[426]- رواه النسائي وابن حبان عن أبي أمامة – صحيح الجامع: (٦٤٦٤).

## سەرپێچیەکانی نوێژی بە کۆمەڵ

### ١- بەپەلە هەنگاونان بەرەو مزگەوت:

بەتایبەتی کاتێك کە دەبینێ پێشنوێژ لە رکوعدایە، ئەویش دەیەوێت بگات بەو رکاتەدا... ئەمەش هەڵەیە، چونکە بە خشوعەوە نوێژەکەی ناکات و دەبێتە هۆی تەشویش بۆ برا نوێژخوێنەکانی.

لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا أَتَيْتُمْ الصَّلاة فَعَلَيكُم بالسَكِينَة، ولا تَأتُوها وَأنتُم تسْعونَ فَمَا أَدْرَكْتُم فَصَلّوا، وَمَا فَاتَكُم فَأَتِمُوا)[٤٢٧]. واتە: کاتێك هاتن بۆ نوێژ بە هەڵەداوان مەیەن بۆ نوێژو پەلە پەل مەکەن، بەڵکو بەئارامی لەسەرخۆ برۆن، ئەوەی پیا راگەیشتن ئەنجامی بدەن، ئەوەی لە دەستان چوو پاش سەلام دانەوەی پێشنوێژ هەستنەوە تەواوی بکەن.

### ٢- خواردنی سیر و پیاز:

هەندێ کەس سیر و پیاز و کەوەر دەخۆن پاشان دەچن بۆ مزگەوت دەبنە هۆی ئازاردانی ئەو نوێژخوێنانەی لە تەنیشتیانەوەن، بگرە مەلائیکەکانیش.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ - يَعْنِي الثُّومَ - فَلاَ يَأْتِيَنَّ الْمَسَاجِدَ)[٤٢٨]. واتە: ئەوەی لەبەری ئەم درەختەی خوارد واتە سیر با نەیەت بۆ مزگەوتەکان.

لە جابرەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خواردنی سیر و پیازی لێ قەدەغەکردین. ئێمەش زۆر پێویستمان بوو خواردمان فەرمووی: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ الْمُنْتِنَةِ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الإِنْسُ)[٤٢٩].

---

427– متفقٌ عَلَيْهِ عن أبي هريرة– صحيح الجامع: (٣٦٩).

428– أخرجه مسلم عن ابن عمر: (٦٦/٥) (ح ٦٨ المساجد).

429– أخرجه مسلم عن جابر: (٨٦/٥) (ح ٦٨ المساجد).

واتە: ئەوەی لەبەری ئەم درەختە بۆگەنەی خوارد با نزیکی مزگەوتەکەمان نەبێتەوە، چونکە هەرچی ئازاری ئادەمیزاد بدات ئازاری مەلائیکەش دەدات.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم بە ئاشکرا قەدەغەکردنی خواردنی سیر و هەرشتێکی تری لەو شێوە و پاشان چوون بۆ مزگەوت، بۆچوونی مەزهەبی هەموو زانیانە.

زانایان دەڵێن: لەبەر ئەوەی خواردنی سیر و پیاز و کەوەر قەدەغەکراوە کەواتە هەر خواردنێ لە خواردنەکان و جگە لەوانیش بۆنیان ناخۆش بێت ئەم قەدەغەکردنە دەیانگرێتەوە. (قاض عیاض)یش دەڵێ: خواردنی توریش دەگرێتەوە ئەگەر خاوەنەکەی ئێق بداتەوە یان قورپێنە بدات. وە دەڵێ: (ابن مرابط) دەڵێ: ئەوانەش دەگرێتەوە کە هاڵاوی ناو دەمیان ناخۆشە یان برینیان پێوەیە و بۆنی برینەکەیان دێ. وە (قاض)ی دەڵێ: زانایان شوێنی کۆبوونەوە بۆ نوێژەکان وەك نوێژی جەژنەکان و نوێژی جەنازە و جگە لەوانیش وەك شوێنەکانی عیبادەت، هەروەها کۆبوونەوە بۆ خوێندنی وانەی زانست و زانیاری و یادی خواو دەعوت کردن بۆ شایی و زەماوەند و منداڵ ناونان و جگە لەوانیش ئەمانەیان قیاس کردووە بە مزگەوتەکان واتە لەو شوێنانەشدا قەدەغەیە.

زانایان دەڵێن: ئەم فەرموودە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەسێ سیر یان جگە لەویش بخوات نابێت بچێتە مزگەوتەوە با چۆڵیش بێت چونکە شوێنی مەلائیکەیە، وە بە گشتی فەرموودەکان[٤٣٠].

منیش دەڵێم: ئەم قەدەغەکردنە بۆ شتانێکە خوا حەڵاڵی کردوون ئەی دەبێ حوکمی ئەو کەسە چی بێت جگەرە دەکێشێت کە خوا حەرامی کردووە پاشان دێت بۆ مزگەوت لەبەردەم خوای پەروەردگاردا رادەوەستێ و ئازاری هەموو ئەوانە دەدات کە لە تەنیشتیەوەن.... هەتا دەڵێم سوێند بە خوا من ناتوانم بە خشوعەوە نوێژ بکەم لە کاتێکدا پیاوێکی جگەرەکێش لە تەنیشتمەوە بێت چونکە بۆنی دوکەڵی جگەرەی لێ دێت.

---

430- مسلم بشرح النووي: (٥/ ٦٧-٦٩) بتصرف.

٣- وتەکەیان: نوێژی بەکۆمەڵ (سنة مؤكدة):

زۆر لە نوێژخوێنان باوەڕیان وایە نوێژی بەکۆمەڵ سوننەتە ئەمەش دەکەنە بەهانە بۆ ئەوەی تەرکی نوێژی بەکۆمەڵ بکەن... چونکە ئەمە ڕێکە لەگەڵ ئارەزوو تەمەڵی و بێ هیمەتیاندا.

شێخ ئەلبانی دەربارەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن: نوێژی بەکۆمەڵ سوننەتی موئەکەدە لە (تمام المنة)دا دەڵێ: دانەر لەم حوکمەدا زۆر نەرمی نواندووە، چونکە واتای (سنة المؤكدة) لەلای فوقەهاکان ئەوەیە کە بکەری پاداشتی دەدرێتەوەو بە نەکردنی سزا نادرێت، جا ئەمە چۆن ڕەوایە لە دەرهەقی ئەوانەی خۆدوادەخەن لە نوێژی بەکۆمەڵ، لەکاتێکدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سوربوو بۆ سووتاندنی ماڵەکانیان بەسەریاندا، وەك لە فەرمودەدا هاتووە.

ئیبن قەیم دەڵێ: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سوتێنەری بکەری تاوانی بچوك نەبوو، جا وازهێنان لە نوێژی بەکۆمەڵ لە گوناهە گەورەکانە.

بەڵکو چۆن ڕاستە ئەمە لەگەڵ وتەی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم کە بە کوێرەکەی فەرمووی: (أجب). واتە: دەبێ وەڵامی بدەیتەوەو بێی بۆ مزگەوت. لەگەڵ ئەوەشدا کە یارمەتیدەرێکی نەبوو وە کەسێك نەبوو دەستی بگرێ بۆ مزگەوت، وەك لە فەرمودەدا هاتووە، بەڵکو لە ڕێگاکەی دارو بەردی لێیە وەك لەهەندێ ریوایەتەکاندا بە (صحیح)ی هاتووە، جا ئایا حوکمێك هەیە وێنەی ئەم (قرینە)انە لەبارەوە هاتبێت جەخت لەسەر واجبێتی بکاتەوە لەگەڵ ئەوەشدا بوترێت: ئەمە واجب نیە؟!.

هەروەها وتەکەی لە فەرمودەی: (...إلا قَدْ استحْوَذَ عَلَيهِمُ الشَيْطَان...). واتە: ئەوە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا. بەڵگەیە لەسەر واجبێتی نوێژی بە کۆمەڵ، ئەگەر کەسێك سوننەتێکی بەجێ نەهێنا، بەڵکو هەموو سوننەتەکانیش، لەسەر پاراستنی واجباتەکان چۆن پێی دەوترێت: (استحْوَذَ عَلَيهِمُ الشَيْطَان)، فەرمودەی دەشتەکیەکەش پاڵپشتی ئەم بۆچوونە دەکات: کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: (دخل الجنة إن صدق). واتە: ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە. ئەمەش ڕوونو ئاشکرایە[431].

---

[431]– تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ٢٥٧).

## ٤- نەکردنی نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوتەکاندا:

ئەم سەرپێچییەش زۆر کەسی گرتۆتەوە شەیتان کردەوەکەیانی بۆ رازاندونەتەوەو وازیان لە نوێژی ناو مزگەوتەکان هێناوە لەکاتێکدا کە خوای گەورە وەسفی ئەوانە دەکات کە بەیانیان و ئێواران زیکر و یادی خوا دەکەن لە مزگەوتەکاندا دەفەرموێت: ﴿ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرْفَعَ وَيُذْكَرَ فِيهَا ٱسْمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلْغُدُوِّ وَٱلْآصَالِ ﴿٣٦﴾ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ ﴾ النور: ٣٦ - ٣٧. واتە: لە مزگەوتانێکدا خوا مۆڵەتی داوەکە بەگەورەو پاك راگیرێت زیکر و یادی خوای تێدا بکرێ، لەو مزگەوتانەدا تەسبیحاتی خوا دەکەن بەیانیان و ئێواراندا، پیاوانێك کە کڕین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناکات لەیادی خوا و نوێژکردن و زەکات دان، لەرۆژێك دەترسن (رۆژی قیامەت)دڵ و چاوەکانیان تێدا(دەگۆڕێن و) ئاوەژوو دەبن.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئوممەتەکەی هانداوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمەڵ لە مزکەوتەکاندا، بۆ واز لێ هێنانیشی هۆشیاریداوە.

بۆ هاندانی ئوممەتەکەی، دەفەرموێت: (صَلَاةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلَاتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الصَّلَاةُ لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلَّا رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ فَإِذَا صَلَّى لَمْ تَزَلْ الْمَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلَّاهُ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ وَلَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا انْتَظَرَ الصَّلَاةَ)[٤٣٢]. واتە: نوێژی پیاوێ لە ئێوە بە جەماعەت بیکات لە مزگەوتدا، خێری بیست و پێنج پلەی نوێژی ماڵ و بازاڕی هەیە، لەبەر ئەوەی ئەگەر لەماڵەوە دەست نوێژێکی رێکوپێکی گرت و، چوو بۆ مزگەوت تەنها بۆ نوێژکردن بڕوات هەر هەنگاوێك کەدەینێ پلەیەك بەرزدەبێتەوەو گوناهێکی دەشواتەوە، ئەگەر چووە مزگەوت و نوێژی کرد، بەردەوام مەلائیکە سڵاواتی لەسەر دەدەن هەتا لە شوێنی نوێژەکەی بمێنێتەوە، دەڵێن خودایە رەحمەت بڕێژە بەسەریدا، خوایە بەزەیت پێیدا بێتەوە، بەردەوام بە نوێژ بۆی حسابە مادەم چاوەڕوانی نوێژ دەکات.

---

[432]- أخرجه البخاري: (٦٤٧)، و مسلم: (٦٥١).

لە (عبداللە)ی کوڕی عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ)[433]. واتە: هەرکەسێ گوێی لە بانگ بێ و نەچێ بەدەمیەوەو نوێژەکەی بە جەماعەت نەکات بەبێ بەهانە ئەوە نوێژی بۆ نیە.

لە ئەبی دەردائەوە ڕەزای خوای لێ بێ ، هاتووە، کە وتویەتی: بیستم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەیفەرموو: (مَا مِنْ ثَلاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ، وَلاَ بَدْوٍ، لا تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إلاَّ قَد اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِم الشَّيْطَانُ. فَعَلَيْكُمْ بِالجَمَاعَةِ، فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ مِنَ الغَنَمِ القَاصِيَة)[434]. واتە: ئەگەر سێ کەس پێکەوە بوون جاگوند نشین بوون یا کۆچەری بەکۆمەڵ نوێژیان نەکرد، ئەوە شەیتان زاڵ بووە بەسەریاندا، لەسەرتان پێویستە لەگەڵ جەماعەت بن، چونکە گورگ ئەومەڕە دەخوات کە تەنهایە.

لە (عبداللە)ی کوڕی مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (وَلَوْ أَنَّكُمْ صَلَّيْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ كَمَا يُصَلِّي هَذَا الْمُتَخَلِّفُ فِي بَيْتِهِ، لَتَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ، وَلَوْ تَرَكْتُمْ سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ لَضَلَلْتُمْ)[435]. واتە: ئەگەر ئێوەش لەماڵەوە نوێژ بکەن و واز لە نوێژی بە کۆمەڵ بهێنن، وەك ئەو پیاوەی لەماڵەوە نوێژەکەی دەکات و ئامادەی جەماعەت نابێ، ئەوە تەرکی سوننەتی پێغەمبەرتان کردووە صلی الله علیه وسلم ئەگەر واشتان کرد ئەوا گومڕاو سەر لێشێواو دەبن.

لە ئەبو هوریرە ڕەزای خوای لێ بێ، هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ فِتْيَتِي فَيَجْمَعُوا حُزَمًا مِنْ حَطَبٍ ، ثُمَّ آتِيَ قَوْمًا يُصَلُّونَ فِي بُيُوتِهِمْ لَيْسَتْ بِهِمْ عِلَّةٌ فَأُحَرِّقُهَا عَلَيْهِمْ)[436]. واتە: نیازم کرد فەرمان بدەم چەند کەسێك دار کۆبکەنەوە و لەگەڵ خۆیان بیهێنن، پاشان بڕۆم ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنم بە سەریاندا کە عوزریان نیە و ئامادەی جومعەو جەماعەت نابن.

---

433- رواه ابن ماجه وابن حبان وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٢٤).

434- رواه أحمد وأبو داود والنسائي، وحسنه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٤٢٥).

435- أخرجه مسلم عن ابن مسعود - صحيح الترغيب والترهيب: (٤٢٥).

436- أخرجه مسلم وأبو داود وابن ماجة - صحيح الترغيب والترهيب: (٤٢٦).

لە ئەبو ئومامەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: ئیبن مەکتوم پیاوێکی کوێری قورەیشی بوو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، ئەوەی ئەم ئایەتانە بە هۆیەوە دابەزیوە: ﴿ عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ١ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ٢ ﴾ عبس: ١ - ٢. واتە: پێغەمبەر ڕووی گرژ کرد و پشتی هەڵکرد، کە کوێرێك هاتە لای.

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم! باوك و دایکم بە قوربانت بن ئەوا دەمبینی من پیاوێکی کوێرم ، پیر بووم، کەسێك نیە دەستم بگرێ بۆ مزگەوت، ئایا ڕوخسەت هەیە لەماڵەوە نوێژەکانم بکەم؟ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (هَلْ تَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي أَنْتَ فِيهِ؟). واتە: ئایا لەو ماڵەوە کە تۆی تێدایە گوێت لە بانگە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: (مَا أَجِدُ لَكَ مِنْ رُخْصَةٍ، وَلَوْ يَعْلَمُ هَذَا الْمُتَخَلِّفُ عَنِ الصَّلاةِ فِي الْجَمَاعَةِ مَا لِهَذَا الْمَاشِي إِلَيْهَا لأَتَاهَا، وَلَوْ حَبْوًا عَلَى يَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ)[٤٣٧]. واتە: کەواتە ڕوخسەتت بۆ نیە، ئەو کەسەی دوادەکەوێ لە نوێژی جەماعەت ئەگەر دەیزانی ئەم بەم شێوەیە دێت بۆ مزگەوت بە سنگەخشێش لەسەر دەست و پێکانی بوایە بۆی دەهات.

(حافظ) ئەبو بەکری کوڕی (منذر) دەڵێ: لە غەیری کەسێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هاتووە فەرمویانە: (مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ). واتە: هەرکەسێ گوێی لە بانگ بێ و نەچێ بەدەمیەوە و نوێژەکەی بە جەماعەت نەکات بەبێ بەهانە ئەوە نوێژی بۆ نیە. لەوانە ئیبن مەسعود و ئەبو موسای ئەشعەری، لە پێغەمبەریشەوە صلی الله علیه وسلم گێڕراوەتەوە، پێشەوایان ئەحمەد و (عطاء) و (أبو ثور) بۆچونیان وایە کە نوێژی جەماعەت فەرزە، پێشەوا شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: "هەر کەسێ توانای هەبێ ڕوخسەت نادرێ نەیەت بۆ نوێژی جەماعەت ئیللا مەگەر عوزرێکی شەرعی هەبێ" تەواوبوو.

---

[437]- رواه الطبراني في الكبير – صحيح الترغيب والترهيب: (٤٣٠).

له دوای باسکردنی فەرمودەکەی ئیبن مەکتوم پێشەوا (خطابي) دەڵێ: ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئامادەبوون بۆ نوێژی جەماعەت فەرزە، ئەگەر سوننەت بوایە ئەوا ئەوانەی پیر و پەککەوتەن و نەخۆشن لەپێشترن بۆ ئەوەی نەچن بۆ نوێژی جەماعەت، هەروەها ئەوانەی حاڵیان وەك حاڵی ئیبن مەکتوم وایە (عطاء)ی کوڕی (أبی رباح) دەڵێ: روخسەت بۆ هیچ کەسێك نیە ئامادەی نوێژی جەماعەت نەبێ مادەم گوێی لە بانگە جا ئیتر شاری بێ یان لادێی. پێشەوا ئەوزاعی دەڵێ: "بۆ وازهێنان لە جومعەو جەماعەت نابێ گوێڕایەڵی باوك بکرێت" تەواوبوو[٤٣٨].

ئیبن تەیمیە دەڵێ: هەرکەسێ باوەڕی وابێ نوێژی ماڵەوە چاکترە لە نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوتدا ئەوە ئەو کەسە بیدعەچی و گومڕایە بەیەك دەنگی موسڵمانان[٤٣٩].

**٥- دواخستنی نوێژ لەکاتی پەسەندی خۆی:**

(أبي ذر) رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموم: (كَيْفَ أَنْتَ إِذَا كَانَتْ عَلَيْكَ أُمَرَاءُ يُؤَخِّرُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا أَوْ يُمِيتُونَ الصَّلاَةَ عَنْ وَقْتِهَا؟). واتە: حاڵت چۆن دەبێت ئەگەر کاربەدەستانێکت لەسەربێت نوێژ دوابخەن لەکاتی خۆی؟ دەڵێ: وتم: چ فەرمانێکم پێ دەکەیت؟ فەرمووی: (صَلِّ الصَّلاَةَ لِوَقْتِهَا فَإِنْ أَدْرَكْتَهَا مَعَهُمْ فَصَلِّ فَإِنَّهَا لَكَ نَافِلَةٌ)[٤٤٠]. واتە: نوێژ لەکاتی خۆیدا بکە، ئەگەر بە نوێژەکەی ئەوانیش گەیشتیت نوێژیان لەگەڵدا بکە، ئەوەش دەبێتە سوننەت بۆت.

[438]– معالم السنن للخطاب: (٢/٢٩١–٢٩٢) نقلا من صحيح الترغيب والترهيب(ص: ١٧٤).

[439]– الفتاوى الكبرى لإبن تيمية : (١/ ١٢٥).

[440]–أخرجه مسلم عن أبي ذر : (٥/ ٢٠٥) المساجد.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: مانای (يُمِيتُونَ الصَّلاَةَ) دواخستنی نوێژ دەگەیەنێت وەك مردوو ڕۆحیان دەرکردووە، مەبەست لە دواخستنی لەکاتی واتە کاتی پەسەندی خۆی نەك هەموو کاتەکەی... لەم فەرمودەدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانی موسڵمانانی داوە لە یەکەم کاتی خۆیدا نوێژەکانیان ئەنجامبدەن. هەروەها ئەوەشی لێ وەردەگیرێ ئەگەر پێشنوێژ لە یەکەم کاتی خۆیدا نوێژی دواخست ڕەوایە بۆ مەئموم بە تەنیا نوێژەکەی ئەنجامبدات لە یەکەم کاتی خۆیدا پاشان لەگەڵ پێشنوێژ ئەو کاتە فەزڵ و گەورەیی جەماعەت و یەکەم کاتی نوێژی دەستدەکەوێت[441].

٦- تەرکی نوێژی جەماعەت لەسەفەردا:

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان ئەگەر یەکێکیان بچێت بۆ سەفەرێك بەشداری نوێژی جەماعەت ناکات چونکە بیروباوەڕی وایە نوێژی جەماعەت تایبەتە بەوانەوە کە نیشتەجێن نەك سەفەری... ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە واجبێتی تایبەت نیە بە نیشتەجێوە، بەڵکو بەڵگەکان نیشتەجێ و سەفەری دەگرێتەوە بەبێ جیاوازی.

کاتێ کەسێکی سەفەری هاتە مزگەوت ئەهلی دوو رکاتیە هەندێ جار چوار رکاتی لەسەر واجب دەبێت ئەویش بەوەی کاتێ چووە مزگەوت هاوەڵی لەگەڵ نەبوو تا پێکەوە جەماعەت بکەن ئەوا لەو کاتەدا واجبە لەسەری لەگەڵ جەماعەت نوێژەکەی بکات، بێگومان واجب لەپێشترە هەتا سوننەت، نابێت خۆی جیابکاتەوە و دوو رکات نوێژ بکات، بێگومان خوای گەورە نوێژی جەماعەتی فەرز کردووە لەسەر ئەوانەی کە نیشتەجێن یان سەفەرین، لەسەر وتەیەکی تری زانایان ئەم جەماعەتە مەرجەو مەرجیش پێویستی زیاترە لە ئەنجام بدرێت[442].

---

441– مسلم بشرح النووي: (٥/ ٢٠٦) .

442– الفتاوى محمد بن إبراهيم: (٢/ ٢٦٥-٢٦٦).

**٧- نوێژکردن لەباخ و شوێنە گشتیەکانداو نەکردنی لە مزگەوتدا:**

ئەم کارە دروست نیە، چونکە واجبە لەسەر موسڵمانان نوێژەکانیان لە مزگەوتدا بەکۆمەڵ بکەن، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە: ﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ ﴾ النور: ٣٧. واتە: پیاوانێك کە کڕین و فرۆشتن بێ ئاگایان ناکات لەیادی خواو نوێژکردن و زەکات دان، لەرۆژێك دەترسن (رۆژی قیامەت)دڵ و چاوەکانیان تێدا(دەگۆڕێن و) ئاوەژوو دەبن.

هەروەها بە بەڵگەی ئەم فەرمودە: (مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ فَلَمْ يُجِبْ فَلاَ صَلاَةَ لَهُ إِلاَّ مِنْ عُذْرٍ)[٤٤٣]. واتە: هەرکەسێ گوێی لە بانگ بێ و نەچێ بەدەمیەوەو نوێژەکەی بە جەماعەت نەکات ئەوە نوێژی بۆ نیە ئیللا مەگەر بەهانەی هەبێت.

**٨- پێشنوێژی کەسێك کە شیاو نەبێت:**

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان گەنجێکی تازە پێگەیشتوو کە لەهەموویان قورئان زانترە نایخەنە پێشەوە پێشنوێژیان بۆ بکات، کەچی پیاوێکی بەتەمەن یان ناودار دەخەنە پێشەوە پێشنوێژیان بۆ بکات کە نازانێت فاتیحەکەش بەڕەوانی بخوێنێت.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەئاشکرا سوننەتی چۆنیەتی پێشنوێژی و کێ شایەنیەتی روونکردۆتەوە دەفەرموێت: (يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَكْبَرُهُمْ سِنًّا)[٤٤٤]. واتە: کێ قورئان زانتر بوو ئەوە دەبێتە پێشنوێژی خەڵك، جا ئەگەر لە قورئاندا یەکسان بوون زاناترینیان بەسوننەت دەبێت بە پێشنوێژ، جا ئەگەر لە سوننەتیشدا یەکسان بوون کێ زوتر کۆچی کردبێت ئەوە دەبێت بە پێشنوێژ، جا ئەگەر کۆچ کردنیشدا یەکسان بوون ئەوە بەتەمەنترینیان دەبێت بە پێشنوێژ.

---

443- رواه أبو داود وابن ماجه والحاكم عن ابن عباس- صحيح الجامع: (٦٣٠٠).

444- اخرجه مسلم وأحمد عن أبي مسعود، صحيح الجامع: (٨٠١١).

ئەم فەرموده بە ئاشكرا ئەوەی تێدایە كە كەسێ شایەنی ئەوەیە پێشنوێژی بكات زۆرترین قورئانی بەچاكی لەبەربێ و شارەزای ئەحكامەكانی بێت.

لیژنەی هەمیشەیی زانایان فەتوایان داوە لەسەر ئەوەی كە دروستە منداڵی ئاقڵ و تێگەیشتوو پێشنوێژی بكات بە بەڵگەی ئەم فەرموده: (يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللّٰهِ..). واتە: كێ قورئان زانتر بوو ئەوە دەبێتە پێشنوێژی خەڵك. لە صەحیحی پێشەوا بوخاری دا بە سابتی لە عەمری كوڕی سەلەمەوە هاتووە، كە وتویەتی: باوكم چووە خزمەت پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: (إِذَا حَضَرَتْ الصَّلَاةُ فَلْيُؤَذِّنْ أَحَدُكُمْ ، وَلْيَؤُمَّكُمْ أَكْثَرُكُمْ قُرْآنًا)[٤٤٥]. واتە: ئەگەر كاتی نوێژ هاتە پێشەوە با یەكێتان بانگ بدات، كێ قورئانی زۆرتر لەبەر بوو ئەوە پێشنوێژیتان بۆ بكات. وتی سەیریان كرد كەسیان نەدی لەمن زیاتر قورئانی لەبەر بێت بۆیە منیان خستە پێشەوەو بەرنوێژیم بۆكردن لەكاتێكدا تەمەنم شەش یان حەوت ساڵان بوو[٤٤٦].

### ٩- دابەستنی نوێژی سوننەت لەكاتی قامەت كردندا:

هەندێ لە نوێژخوێنان لەكاتێكدا كە بانگبێژ دەست دەكات بە قامەت كردن بۆ نوێژە فەرزەكان ئەوكاتە دەست دەكەن بە ئەنجامدانی نوێژی سوننەت، ئەمەش هەڵەیە.. چونكە نەهی لێ كراوە.

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةُ)[٤٤٧]. واتە: كاتێ قامەت كرا بۆ نوێژ جگە لە نوێژە فەرزەكە نوێژی تر ناكرێت.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرموده بەئاشكرا نوێژی سوننەتی قەدەغەكردووە لە دوای قامەت كردن بۆ نوێژە فەرزەكان، جا ئیتر سوننەتی راتبە بێت وەك دوو ركاتی پێش نوێژی بەیانی یان نیوەڕۆو عەسر و جگە لەوانیش، ئەمەش مەزهەبی شافیعی و جمهوری زانایانە.

---

445- رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ وَأَبُو دَاوُد وَالنَّسَائِيُّ عن عَمْرُو بْنُ سَلَمَةَ الْجَرْمِيُّ .

446- مجلة البحوث: (٧٤/٢١).

447- اخرجه مسلم عن أبي هريرة: (٥/ ٣١١) (ح ٦٣ صلاة المسافرين).

### ١٠- راوەستانی ئەوانەی هیچ لە قورئان و سوننەت نازانن لەدوای پێشنوێژەوە:

بەپێی ئاراستەکردنەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سوننەت وایە خاوەن ئاوەزەکان و ئەوانەی لە دین تێگەیشتوون لەدوای پێشنوێژەوە بن دەفەرموێت: (لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ...)[٤٤٨]. واتە: با خاوەن ئاوەزەکان و ئەوانەی لە دین تێگەیشتوون لێم نزیك بن، پاشان ئەوانی دواتر لەوان، پاشان ئەوانی دواتر لەوان - واتە کەسانی شارەزا لەدین لەپشت سەر پێشنوێژەوە بوەستن - .

ئەمەش بۆ ئەوەیە ئەگەر پێشنوێژ هەڵەیەکی کرد بۆی راست بکەنەوە، یان ئەگەر بێ دەستنوێژ بوو یەکێکیان بچێتە جێگاکەی، یا بورایەوە هەر شتێکی تری لەو جۆرە..

کاتێ ئەبو لوئلوئی فارسی نەفرەتی پێشەوا عومەری بریندار کرد لە نوێژی بەیانیدا یەکێك لە نوێژخوێنان چووە پێشەوە و نوێژەکەی بۆ تەواوکردن[٤٤٩].

### ١١- سەرپێچی لە سوننەتی پاڵدان بەیەکەوەدا:

سوننەتی پاڵدان بەیەکەوەو رێك راوەستان لە ریزەکانی نوێژی بەکۆمەڵدا ئەوەیە ریزی یەکەم لەدوای پێشنوێژەوە دەست پێ دەکات بەرەو لای راست ئینجا بەرەو لای چەپ، ریزی دووهەم و ریزەکانی تریش بەهەمان شێوە.. سەرپێچی ئەمەش بە بیدعە دێتە هەژمار، چونکە سەرپێچیە لە ئاراستەکردنەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم[٤٥٠].

### ١٢- بوونی کەلێن و بۆشایی لە نێوان نوێژخوێناندا:

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی کە بڵاوبۆتەوە لە زۆربەی مزگەوتەکاندا بە رادەیەك ئەگەر بتەوێت ئەو بۆشایی و کەلێنەی نێوان خۆت و ئەوەی تەنیشتت نەهێڵیت بە توندیەکی سەیر هەڵدێن، بەڵکو دوای نوێژکە نکولی ئەو کارەش دەکەن لەوانەیە هەندێ جاریش لێت تورە بن... ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی ئەوەوەیە نەشارەزان لە سوننەتی خۆشەویست صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت:

---

448- أخرجه مسلم وأبو داود عن أبي مسعود- صحيح الجامع: ( ٥٤٧٦).

449- السنة والبدعة/ د فؤاد مخيمر: (١/ ١٨٠).

450- السنة والبدعة/ د فؤاد مخيمر: (١/١٧٩).

(مَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ، وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ)[451]. واتە: هەرکەس ریزێك بگەیەنێت خوا دەیگەیەنێت بە روحمی خۆی، هەر کەسیش ریزێك بپچڕێنێت خوا لە روحمی خۆی دەیپچڕێنێت.

ئەی برای خۆشەویستم لەگەڵما سەرنجی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بدە کە دەفەرموێت: (إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَمَلَائِكَتَهُ عَلَيْهِمْ السَّلَام يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ، وَمَنْ سَدَّ فُرْجَةً رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً)[452]. واتە: بەڕاستی خوا و مەلائیکەکانی رەحمەت دەڕژێنن بەسەر ئەوانەدا ریزەکان بەیەك دەگەیەنن، ئەوەی کەلێن و بۆشایی پڕبکاتەوە خوای گەورە پلەیەك بەرزی دەکاتەوە.

**١٣- نزیکی ریزەکانی ئافرەتان لە پیاوانەوە بەبێ بەربەست:**

سوننەت لێرەدا بەم شێوەیە: دەبێت ریزی ئافرەتان دوور بێت لە ریزی پیاوانەوە و بەربەست هەبێ لە نێوانیاندا، یان جێگایەکیان بۆ تەرخان بکرێ و دەرگای چوونە ژوورەوەو هاتنە دەرەوەیان جیاواز بێت بۆ ئەوەی پیاوان نەیان بینن و بەدوور بن لە بەڵاو فیتنە[453].

**١٤- هەوڵ نەدان بۆ ریزی یەکەم:**

پێویستە موسڵمان لەگەڵ برا موسڵمانەکانیدا پێشبڕکێ بکات و بۆ بەدەسهێنانی پاداشتی گەورە لەلایەن خواوە، چونکە خوای پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ آل عمران: ١٣٣. واتە: بەپەلە بن و پێشبڕکێ بکەن تا دەگەنە لێخۆشبوونی پەروەردگارتان و بەهەشتێك کە پانتاییەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوەو ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان پێشبڕکێ ناکەن و سورنین و هەوڵ نادەن لەسەر بەدەسهێنانی ریزی یەکەم، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هانی ئومەتەکەی داوە کە لەریزی یەکەمدا نوێژبکەن.

---

451– رواه النسائي والحاكم عن ابن عمر، صحيح الجامع: (٦٥٩٠).

452– رواه أحمد وابن ماجة والحاكم عن عائشة، صحيح الجامع: (١٨٤٣).

453– السنة والبدعة/ د فؤاد مخيمر: (١/١٨٠).

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لیٚ بیٚ هاتووە، کە وتویەتی: پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمویەتی: (لَوْ يَعْلَمِ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاسْتَهَمُوا)[454]. واتە: ئەگەر ئەو خەڵکە دەیانزانی خیٚری بانگدان و ریزی یەکەمی نویٚژی جەماعەت چەندە گەورەیە، ئەگەر دەشیانزانی پیٚش وەخت ئامادە بوون بۆ نویٚژ چەندە خیٚرە ئەوا پیٚش برکیٚیان بۆ دەکرد.

پیٚغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەبارەت بە دواکەوتن هۆشیاریداوە دەفەرمویٚت: (لاَيَزال قومٌ يتأخرن، حتى يُؤَخِرَهُمُ اللهُ)[455]. واتە: کۆمەڵیٚك دەیکەن بەپیشە هەر دوادەکەون، هەتا خوای گەورەش لە پلەو پایەو پاداشتدا دوایان دەخات.

۱۵- بەربەست دانەنان:

ئەمەش یەکیٚکە لە سەرپیٚچیە باوەکان لە مزگەوتەکاندا.. بۆیە دەبینین نویٚژخویٚن هەیە لە ناوەڕاستی مزگەوتدا بەبیٚ بەربەست نویٚژ دەکات دەبیٚتە هۆی زەحمەت بۆ برا موسڵمانەکانی ئەگەر بیانەویٚ بڕۆنەدەرەوە، یان هەیانە لەدواوە نویٚژ دەکات و پشتی بەدیواری مزکەوتەوەیە دەبیٚتە هۆی زەحمەتی زیاتر چونکە ریٚگە لە هاتوچۆ دەگریٚت.

بیٚگومان پیٚغەمبەر صلی الله علیە وسلم ئەم کارەی قەدەغەکردووە دەفەرمویٚت: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيُصَلِّ إِلَى سُتْرَةٍ وَلْيَدْنُ مِنْ سُتْرَته لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ)[456]. واتە: ئەگەر یەکیٚك لە ئیٚوە نویٚژی کرد با رووەو بەربەستیٚك نویٚژ بکات و لیٚی نزیك بیٚتەوە، نەوەك شەیتان نویٚژەکەی پیٚ ببڕیٚت.

ئەمەش کردەوەی پیٚغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم: (كان إذا صلى في فضاء ليس فيه شيء يستتر به غرز بين يديه حربة فصلى إليها والناس وراءه، وكان صلى الله عليه وسلم لا يدع شيئا يمر بينه وبين السترة)[457].

---

454- أخرجه البخاري:(٧٢١)، ومسلم (٤٣٧).

455- اخرجه مسلم: (٤٣٨) وابن خزيمة: (١٥٦٠).

456- رواه أحمد والنسائي عن سهل بن أبي حثمة- صحيح الجامع: (٦٥٠).

457- صفة الصلاة النبي صلى الله عليه وسلم: (ص: ٥٥) .

واتە: ئەگەر لە دەشتێکدا نوێژی بکردایە هیچ شتێ نەبوایە بیکات بە بەربەست، خەنجەرێکی بەزەویدا دەچەقاند و پاشان رووەو ئەو خەنجەرە نوێژی دەکرد و خەڵکەکەش لەدوایەوە بوون، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم رێی بەهیچ شتێك نەدەدا بە نێوان خۆی و بەربەستەکەیدا تێپەڕ ببێت.

ئەوانەی دەڵێن دانانی بەربەست واجبە: (ابن حزم) لە (المحلی: ٨/٤)دا، شەوکانی لە (السیل الجرار: ١٧٦/١)دا، ئەلبانی لە (صفة الصلاة النبي صلی الله علیه وسلم لاپەڕە: ٥٥)دا. جا ئەو بەڵگەیەی کە پاڵپشتە بۆ واجب بوونی بەربەست دانان ئەوەیە کە هۆیەکی شەرعیە بۆ پوچەڵ نەبوونەوەی نوێژ بە تێپەڕبوونی ئافرەتی باڵغ و گوێدرێژ و سەگی ڕەش بە بەردەمی نوێژخوێندا- ئەگەر سوترەی دانابوو.

* لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشەوە!!! ئایا ئەندازەی بەرزی بەربەست چەندە؟

وەڵامەکەی: ئەمەیە کە پێشەوا (مسلم) لە صەحیحەکەیدا لە عائیشەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: لە جەنگی تەبوکدا دەربارەی ئەندازەی بەرزی بەربەست پرسیار کرا لە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەویش فەرمووی: (كَمُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ)[458]. واتە: بەقەدەر پاڵپشتی کۆپانی وشترێك بێت.

لە تەڵحەی کوڕی (عبیدالله)وە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیهٌ وسلم فەرمویەتی: (إِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ فَلْيُصَلِّ وَلاَ يُبَالِ مَنْ مَرَّ وَرَاءَ ذَلِكَ)[459]. واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەقەدەر پاڵپشتی کۆپانی وشتر لەبەرمیدا بێت با نوێژەکەی بکات و هیچ باکی نەبێت بەو کەسانەی کە لەو دیوی بەربەستەکەوە دەڕۆن.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: (مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ). ئەو دارەیە لەبەشی دواوەی زینی وشتردا هەیە، بە ئەندازەی ئێسکی باڵێکە، یان ئەوەندی سێ یەکی باڵێك دەبێ.

---

458- أخرجه مسلم والبيهقي والنسائي: (١٢٢/١).

459- أخرجه مسلم في صحيحه كتاب الصلاة باب سترة المصلي رقم: (٤٩٩).

پرسیاری دووهەم: ئایا ئەندازەی نێوان نوێژخوێن و بەربەست چەندە؟

لە (عبدالله)ی کوڕی عومەرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ إِذَا دَخَلَ الْكَعْبَةَ مَشَى قِبَلَ وَجْهِهِ حِينَ يَدْخُلُ وَجَعَلَ الْبَابَ قِبَلَ ظَهْرِهِ فَمَشَى حَتَّى يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِدَارِ الَّذِي قِبَلَ وَجْهِهِ قَرِيبًا مِنْ ثَلاثَةِ أَذْرُعٍ صَلَّى يَتَوَخَّى الْمَكَانَ الَّذِي أَخْبَرَهُ بِهِ بِلالٌ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ صَلَّى فِيهِ)[٤٦٠]. واتە: کاتێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەچووە ناو کەعبەوە بەرەو ڕووی دەڕۆشت پشتی لە دەرگای کەعبەوە بوو، ئەوەندەی سێ باڵ نزیك دەبووەوە لەو دیوارەی کە بەرەو ڕووی بوو جا نوێژی دەکرد، لە بیلالەوە هاتووە کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەوەندەی سێ باڵ لە دیوارێکەوە دوور بوو نوێژی دەکرد.

بێگومان نێوان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و بەربەستەکەی نزیك دەبووەوە لە سێ باڵ[٤٦١].

**١٦- تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا:**

ئەمەش یەکێکە لە بەڵاکان... دەبینین خەڵك بە بەردەمی ئەو کەسانەدا کە نوێژ دەکەن تێدەپەڕن وەك چۆن بەسەر شەقامەکانی بازاڕدا دەڕۆن... نازانن کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هۆشیاری توندی داوە سەبارەت بەو کارە ناپەسەندە دەفەرموێت: (لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ)[٤٦٢]. واتە: ئەگەر ئەو کەسەی بە بەردەم نوێژخوێندا تێپەڕ دەبێت بیزانێت چەند تاوانی لەسەرە، ئەوا چل بە پێوە بوەستایە زۆر باشتر بوو بۆی لەوەی کە بە بەردەستیدا بڕوات، (أَبُو النَّضْر) وتی: نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ یان چل مانگ یا چل ساڵ.

بەهەرحاڵ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕونیکردۆتەوە بۆمان کە دروست نیە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا، دەفەرموێت: (إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَلاَ يَدَعْ أَحَدًا يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلْيَدْرَأْهُ مَا اسْتَطَاعَ فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)[٤٦٣].

---

460– أخرجه البخاري: (١٣٤/١) (٥٠٦) عن إبراهيم بن المنذر.

461– مختصر مخالفات الطهارة والصلاة/ عبدالعزيز السدحان: (ص:٦٦-٦٧).

462– أخرجه البخاري: (٥١٠)، ومسلم: (٥٠٧).

463– أخرجه مسلم: (٥٠٥)، وابن ماجة: (٩٥٥)، وأحمد: (٣٤/٣).

واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی کرد با نەهێڵێت کەس بە بەردەمیدا بڕوات، هەتا دەتوانێت نەهێڵێت و دووری بخاتەوە ئەگەر وازی نەهێنا و نەگەڕایەوە باشەڕی لەگەڵدا بکات، چونکە ئەوە شەیتانە.

پێشەوا نەوەوی دەربارەی فەرموودەی یەکەم دەڵێ: ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا حەرامە، چونکە بە دڵنیاییەوە مانای فەرموودەکە قەدەغەکردن و بەڵێنێکی توند دەگەیەنێت و بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

پێشەوا (منذري) لە کتێبی (الترغیب والترهیب)دا لە باسی "ترساندن لە تێپەڕبوون بە بەردەم نوێژخوێندا" دەڵێ: ئەگەر کەسێك بەبێ ئەوەی بەربەست دابنێ نوێژی کرد ئەوە لەدوای سێ باڵ تێپەڕبوون گوناه نیە بە بەردەمیدا، هەروەك دەقی زۆر لەوبارەوە هاتووە لەلایەن زانایانەوە بەلام ئەوانە گوناهبارن کە لەسێ باڵ کەمتر تێپەڕدەبن بە بەردەم نوێژخوێندا.

بەڵام تێپەڕبوون بە بەردەم مەئمومدا گوناه نیە، چونکە پێشنوێژ بەربەستە بۆ ئەوانەی لەدوایەوە نوێژدەکەن.... پێشەوا بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ لەباسی " بەربەستی پێشنوێژ بەربەستە بۆ ئەوانەی لەدوایەوە نوێژدەکەن" پاشان سەنەدەکەی دەداتە پاڵ (عبدالله)ی کوڕی عەباس ڕەزای خوایان لێ بێ کە دەڵێت: (أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الِاحْتِلَامَ وَرَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي بِالنَّاسِ بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ فَنَزَلْتُ وَأَرْسَلْتُ الْأَتَانَ تَرْتَعُ وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ)[٤٦٤]. واتە: بە سواری گوێدرێژێکەوە هاتم تەمەنم نزیکی باڵغ بوون دەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مینا نوێژی دەکرد خەڵکیش لەدوایەوە، بەبەردەم چەند ڕیزێکدا بە ولاغەکەوە تێپەڕیم پاشان گوێدرێژەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ خۆم هاتم نوێژم دابەست لەگەڵیاندا، کەس ئینکاری ئەو کارەی نەکردم[٤٦٥].

464– مُتَّفق عَلَيْهِ.

465– مختصر مخالفات الطهارة والصلاة/ عبدالعزيز السدحان: (ص: ٧٠).

**١٧- نوێژکردن لە نێوان پایەکانی مزگەوتدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان بەبێ ئەوەی پێویست بکات لە نێوان کۆڵەکەو پایەکانی مزگەوتدا دەست دەکەن بە نوێژکردن و ریزی نوێ دادەمەزرێنن.. لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نەهی لێ کردووە، چونکە ئەو پایەو کۆڵەکانە دەبنە هۆی پچڕانی ریزەکان لەیەکتر.

پێشەوا مالیك روخسەتی پێداوە لەکاتی قەرەباڵغیدا دەڵێ: نوێژکردن دروستە لە نێوان کۆڵەکەو پایەکانی مزگەوتدا ئەگەر جێگا نەدەبۆوە.

بەڵام ئیبن مەسعود قەدەغەی کردووە دەڵێ: "ریز مەبەستن بۆ نوێژکردن لە نێوان کۆڵەکەو پایەکانی مزگەوتدا"[٤٦٦].

هەروەها دەبینین هەندێك لە نوێژخوێنان ریزی نوێ پێك دێنن لەکاتێکدا ریزی پێشەوەیان تەواو نەبووە... ئەمەش هەڵەو سەرپێچییە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا نیە صلى الله عليه وسلم.

**١٨- نوێژی تاکە کەس لەدوای ریزەوە:**

ئەم سەرپێچییەش لەناو زۆربەی مزگەوتەکاندا بڵاوبۆتەوە لەکاتێکدا زۆربەی خەڵك دەزانن کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم قەدەغەیکردووە، بەڵام فەرمودەکەی ئەبو بەکرە دەکەنە بەڵگە بۆ خۆیان کە دەفەرموێت: گەیشتم بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە رکوعدا بوو منیش پێش ئەوەی بگەمە ریزەکە رکوعم بردوو بە رکوع بردنەوە چوومە ناو ریزەکەوە، ئەوەم بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گێڕایەوە فەرمووی: (زَادَكَ اللَّهُ حِرْصًا وَلَا تَعُدْ)[٤٦٧].

واتە: خوا سوربوون و پەرۆشیت زیاد بکات بۆ دینەکەت بەڵام دووبارەی نەکەیتەوە.

لە ڕاستیدا ئەم فەرمودە بەڵگەیە لەسەریان چونکە ئەبا بەکرە نوێژەکەی تەواو نەکرد لەدوای ریزەکانەوە، بەڵکو رۆشتە ناو ریزەکانەوە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم رێگری ئەو کارەی لێکرد بەوەی کە جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوە، پێی فەرموو: (وَلَا تَعُدْ). واتە: دووبارەی نەکەیتەوە.

---

466– أخرجه البيهقي: (١٠٤/٣).

467– أخرجه البخاري: (١/ ١٩٩)، واحمد: ٥/ ٣٩، والنسائي: ٢/ ١١٨.

له (وابصه)ەوه هاتووه، كه وتويەتى: پێغەمبەرى خوا صلى الله عليه وسلم پیاوێكى بینى به تەنیا لەدواى ریزەكانەوه نوێژى دەكرد، فەرمانى پێدا نوێژەكەى دووباره بكاتەوه[468].

له عەلى كورِى شەیبانەوه هاتووه كه وتویەتى: دەرچووین هەتا گەیشتین به پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەیعەتمان پێداو نوێژمان لەپشتیەوه كرد، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پیاوێكى بینى به تەنیا لەدواى ریزەكانەوه نوێژى دەكرد، راوەستا هەتا له نوێژەكەى بوویەوه، پێى فەرموو: (اسْتَقْبِلْ صَلاَتَكَ فَلاَ صَلاَةَ لِفَرْدٍ خَلْفَ الصَّفِّ)[469]. واته: نوێژەكەت بگێرِەوه، چونكه ئەو كەسەى به تەنیا لەدواى ریزەكانەوه نوێژ بكات نوێژەكەى دروست نیه.

جەماوەرى زانایان لایان وایه ئەو كەسەى لەدواى ریزەكانەوه نوێژ دەكات نوێژەكەى دروسته بەڵام كەراهەتى هەیه[470].

شێخ ئەلبانى دەڵێ: ئەم دوو فەرموده دژى یەكتر نین و له نێوان ئەم دوو فەرمودەو فەرمودەكەى ئەبو بەكرە دژایەتى نیه، لەبەرئەوه ئەبا بەكره بەتەنیا نوێژى نەكرد لەدواى ریزەكەوه، بۆیه فەرمانى پێنەكرد بەگێرِانەوەى نوێژەكە، وه ئەو پیاوەى كه باسكرا له هەردوو فەرمودەكەدا هاتووه بەتەنیا نوێژى كرد لەدواى ریزەكەوه، جا فەرمانى پێكرد بەگێرِانەوه، كەواته هیچ دژایەتیەكى تێدا نیه، پێشەوا ئەحمەد رەحمەتى خواى لێ بێ بەمە فەرمودەكانى كۆكردووتەوه، (أبو داود) له (مسائله)كەیدا: لاپەرِه: ٣٥)دا دەفەرموێت: بیستم پرسیار كرا له ئیمام ئەحمەد لەبارەى پیاوێكەوه ركوع بەرێت له دوورى ریزەوه، پاشان برِوات هەتا دەچێته ناو ریزەكەوه، بەر لەوەى بگاته ریزەكه پێشنوێژ سەرى بەرزكردەوه له ركوع، فەرمووى: ركاتێك برى دەكەوێت، وه ئەگەر لەدواى ریزەكەوه بەتەنیا نوێژى كرد، نوێژەكەى دەگێرِێتەوه[471].

بەڵام ئەگەر له ریزەكەدا جێگا نەبوو ئەوا دروسته بەتەنیا نوێژ بكات لەدواى ریزەكەوەو گوناهى لەسەر نیه.

---

468– أخرجه الترمذي: (١/ ٤٤٨) وأحمد: (٤/ ٢٢٨) بإسناد صحيح.

469– رواه أحمد: (٤/ ٢٣)، وابن خزيمة: (١/ ١٦٤)، في الإرواء: ٥٤١ .

470– فق السنة بەرگى يەكەم نووسينى سيد سابق لاپەرِه: ١٨٣ .

471– نقلا من تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ٢٨٥–٢٨٦).

**١٩- رێك نەوەستانی پێشنوێژ لەگەڵ مەئموم "ئەگەر دوان بوون":**

هەندێ کەس ئەگەر بوونە پێشنوێژی کەسێکی تر، وەك ئەوەی کە نوێژی جەماعەتی دەفەوتێت، پێشنوێژ کەمێك دەچێتە پێشەوە، ئەسڵ لەمەدا ئەوەیە لەرێکی یەکتر بوەستن نابێت پێشنوێژ بچێتە پێشەوە.

پێشەوا بوخاری رەحمەتی خوای لێ بێ سەرباسێکی داناوە بەناوی "وەستان لەلای راستی پێشنوێژەوە شان بەشانی پێشنوێژ ئەگەر دوان بوون ". وە باسی فەرمودەکەی ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە کە شەوێك لای مەیمونەی پوری مایەوە، لە فەرمودەکەدا هاتووە، کە وتویەتی: (نَامَ ثُمَّ قَامَ فَجِئْتُ فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ..). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەو هەستا بۆ نوێژ منیش هەستام لەگەڵی نوێژ بکەم لای چەپییەوە راوەستام، خستمیە لای راستیەوە. (فتح الباري: ٢/ ١٩٠).

ئیبن حەجەر دەڵێ: وتەی: (رێکی یەك بوەستن) واتە: نە لەدوای پێشنوێژەوە بوەستێ و نە لەپێشەوە. لە (اِبْنِ جُرَيْجٍ)ەوە هاتووە دەڵێ: وتم بە (عَطاء): پیاوێك لەگەڵ کەسێکی تر نوێژ دەکات لە کوێیەوە راوەستێ؟ وتی لەلای راستیەوە، وتم: لە رێکی بوەستێ؟ وتی: بەڵێ، وتم: بۆیە پێت خۆشە لە رێکی پێشنوێژدا بوەستێ تا هیچ بۆشایی و کەلێنێ لە نێوانیاندا نەبێت؟ وتی: بەڵێ. (فتح الباري: (٢/ ١٩٠- ١٩١)[٤٧٢].

**٢٠- ریزی منداڵان لەدوای پیاوانەوە:**

لەناو زۆربەی نوێژخوێنان وابڵاوبۆتەوە، دەبێت ریزی منداڵان لەدوای ریزی پیاوان و لەپێش ریزی ئافرەتانەوە بێت، بەڵگەیان فەرمودەکەی ئەبو داودە: (كَانَ رَسُول اللّٰه صَلَّى اللّٰه عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَجْعَلُ الرِّجَالَ قُدَّامَ الْغِلْمَانِ، وَالْغِلْمَانَ خَلْفَهُمْ، وَالنِّسَاءَ خَلْفَ الْغِلْمَانِ)[٤٧٣]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کاتێ نوێژخوێنانی ریز دەکرد پیاوەکانی دەخستە پێش منداڵەکان و منداڵەکانی لەدوای پیاوەکانەوە ریز دەکرد ئافرەتەکانیشی دەخستە دوای منداڵەکانەوە. فەرمودەکە (ضعیف) لاوازە ..(شهر)ی کوڕی (حوشب)ی تێدایە کە پێشەوا (اِبْنِ حجر) لەبارەیەوە دەڵێ: راستگۆ بووە بەڵام لەگێڕانەوەی فەرمودەدا فەرمودەی (مرسل)ی زۆرە هەروەها وەهمیشی زۆر بووە ... (تقريب التهذيب: (ص: ٢٦٩) رقم: (٢٨٣٠).

---

472- نقلا من مختصر مخالفات الطهارة والصلاة.

473- ضعيف رواه أبو داود: (١/ ١٨١) وأحمد: (٥/ ٣٤١).

شێخ ئەلبانی دەڵێ: لەبارەی ریزبوونی ئافرەتان لەدوای پێشنوێژەوە فەرمودەی زۆر هەیە، بەڵام لەبارەی منداڵ خستنە دوای پیاوانەوە هیچ فەرمودەیەکم نەبینیوە جگە لەمە نەبێت، ئەمەش ناکرێت بە بەڵگە، من هیچ شتێك نابینم ئەگەر منداڵان لەگەڵ پیاواندا بوەستن ئەگەر فراوانی هەبێت لە ریزدا، نوێژی منداڵە هەتیوەکە لەگەڵ ئەنەسدا لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بەڵگەیە بۆ ئەمە[٤٧٤].

فەرمودەی منداڵە هەتیوەکە کە ئاماژەمان پێدا: مولەیکەی نەنکی ئەنەسی کوڕی مالیك رەزای خوای لێ بێ بانگهێشتی پێغەمبەری کرد صلی الله علیه وسلم بۆ خواردنێك کە سازی کردبوو، ئەویش لێی خوارد، پاشان فەرمووی: (قُومُوا فَأُصَلِّيَ لَكُمْ). واتە: هەستن با نوێژتان بۆ بکەم، ئەنەس وتی: حەسیرێکی ئێمە کە لەبەر کۆنی رەش داگەڕابوو، ئاوڕشێنێکم کرد، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چووە سەری من و منداڵێکی هەتیو لەدوایەوە ریزبووین، پیرەژنەکەش لە دوامانەوە بوو، پێغەمبەری خوای صلی الله علیه وسلم دوو رکات نوێژی بۆ کردین و سەلامی دایەوەو رۆیشت[٤٧٥].

ئەگەر ریزی منداڵان جیا بوایە وەك ریزی ئافرەتان ئەوا ئەنەس خۆی لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ریز دەبوو، پاشان هەتیوەکەی دەخستە ریزی دوای خۆی ئینجا پیرەژنەکە، کەواتە نوێژی هەتیوەکە لەگەڵ ئەنەس لەدوای پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم بەڵگەیە بۆ ئەوەی دروستە منداڵان لەگەڵ پیاوان ریز ببەستن[٤٧٦].

**٢١- سەلام دانەوەی دوای دەسنوێژ پوچەڵ بوونەوە:**

زۆربەی خەڵك کاتێ لە نوێژدا دەسنوێژەکەیان دەشکێت یان بیریان کەوتەوە کە هەر دەسنوێژیان نەبووە ئەوا بەلای راست و چەپیاندا سەلام دەدەنەوە، ئیتر بەپێوەبن یان بە دانیشتنەوە... ئەمەش هەڵەیە چونکە ئەوە شوێنی سەلام دانەوە نیە، بەڵکو شوێنی سەلام دانەوە لە کۆتایی نوێژدایە بە بەڵگەی ئەم فەرمودە:

---

474– تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ٢٨٤).

475– أخرجه البخاري: (١/ ١٠٨)، و مسلم: (٢/ ١٣٧) .

476– نقلا من أخطاء المصلين: (ص: ١٢١).

(مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ)[٤٧٧]. واته: کلیلی نوێژ پاك وخاوێنی و دەستنوێژە، دابەستنیشی بە (الله اکبر)ە، بە سەلام دانەوەش تەواو دەکرێت.

راستیەکەی ئەوەیە ئەگەر دەسنوێژەکەی پوچەڵ بوویوە یان بیری کەوتەوە کە دەسنوێژی نیە بەبێ سەلام دانەوە لە ریزەکە بێتەدەرەوە بچێت دەستنوێژ بگرێ و بێتەوە نوێژەکەی بکات.

**٢٢- دامەزراندنی جەماعەتی دووهەم:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە هەڵە باوەکان.. زۆرجار لەکاتێکدا روودەدات کە پێشنوێژ دانیشتووە بۆ تەحیاتی دووەم، هەندێ لە نوێژخوێنان پێش ئەوەی پێشنوێژ سەلام بداتەوە جەماعەتی دووەم دادەمەزرێنن.. راستیەکەی ئەوەیە واجبە لەسەریان لە دوای پێشنوێژی یەکەمەوە نوێژدابەستن یان چاوەڕێ بکەن هەتا سەلام دەداتەوە ئەو کاتە جەماعەتی دووهەم دامەزرێنن[٤٧٨].

**٢٣- بیروباوەڕ بەوەی کە نوێژی فەرز لەدوای کەسێکەوە ناکرێت سوننەت بکات:**

هەندێ لە نوێژخوێنان ئەگەر یەکێ لەوان بەتەنیا لە مزگەوتدا نوێژی سوننەتی دەکرد کەسێ هات ویستی نوێژێکی فەرزی فەوتاو لەدوایەوە بکات، ئەوا بەدەست پاڵی پێوە دەنێ و رێگری لێ دەکات چونکە وادەزانێت ئەو کارە دروست نیە... لە راستیدا دروستە ئەو کەسەی کە نوێژی فەرز دەکات ئیقتیدا بکات بە کەسێکەوە کە نوێژی سوننەت دەکات بە بەڵگەی ئەم فەرمودە: موعازی کوڕی جەبەل نوێژی عیشای لەگەڵ پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم بە جەماعەت دەکرد، پاشان گەڕایەوە بۆ ناو هۆزەکەی ئەو نوێژەی بۆ دەکردن[٤٧٩]- جا نوێژەکە بۆ خۆی سوننەت بوو، بۆ ئەوانیش فەرز.

---

[477]– رواه أبو داود والترمذي والحاكم وصححه وررفقه الذهبي– وصححه الألباني في الارواء: (٣٠١).

[478]– هیچ بەڵگەیە نیە لەسەرئەوەی چاوەڕێ بکەن تاکو پێشنوێژ سەلام دەداتەوە پاشان جەماعەت بکەن بەڵکو ئەم کارە هەرهەمان دوپاتکرنەوەی جەماعەتە لەیەك مزگەوتدا کە نەهی لێکراوەو دروست نیە، واجبە بەشداری جەماعەت بکەن. عبدالرحمان حسین پور.

[479]– متفقٌ عَلَيْه.

**٢٤- شوێن پێشنوێژ کەوتن بەقەستی لەکاتێکدا رکاتێکی زیادە دەکات:**

لە حاڵەتێکدا کە پێشنوێژ هەستایەوە بۆ رکاتێکی زیادە وەك ئەوەی پێنج رکات بکات لە نوێژە چوار رکاتیەکاندا یان سێ رکات بکات لە نوێژی بەیانیدا یا چوار رکات بکات لە نوێژی شێواندا، هەندێ لە نوێژخوێنان شوێنی دەکەون و سەجدە دەبەن لەکاتێکدا دەزانن رکاتێکی زیادەی کردووە ئەمەش لە نەزانینیانەوەیە، چونکە لەم حاڵەتەدا نابێت شوێن پێشنوێژ بکەون.

نوێژخوێنان لەم حاڵەتەدا لەگەڵ پێشنوێژ دەبن بە چەند بەشێکەوە:

**بەشی یەکەم:** شوێن پێشنوێژ دەکەون چونکە وادەزانن پێشنوێژ پێکاویەتی، ئەوانە هیچیان لەسەر نیە.

**بەشی دووهەم:** دەزانن پێشنوێژ رکاتێکی زیادە دەکات (سبحان الله)تەسبیح دەکەن بۆی، ئەگەر بەردەوام بوو شوێنی ناکەون، بەڵکو بە دانیشتنەوە دەمێننەوە هەتا پێشنوێژ سەلام دەداتەوە ئەوانیش لەگەڵ پێشنوێژ سەلام دەدەنەوە، ئەمانە نوێژەکەیان دروستە.

**بەشی سێهەم:** وەك ئەوانەی پێشەوە، بەڵام چاوەڕێی پێشنوێژ ناکەن سەلام دەدەنەوە، ئەمانە نوێژەکەیان دروستە، بەڵام وا چاکترە لەگەڵ پێشنوێژدا سەلام بدەنەوە.

**بەشی چوارەم:** شوێن پێشنوێژ دەکەون لە کاتێکدا دەزانن پێشنوێژ رکاتێکی زیادە دەکات، ئەمەیان هەڵەیە.

لە "فەتواکانی لیژنەی هەمیشەیی" دا هاتووە دەڵێ: لە حاڵەتێکدا کە پێشنوێژ هەستایەوە بۆ رکاتێکی زیادە وەك ئەوەی پێنج رکات بکات لە نوێژە چوار رکاتیەکاندا ئەگەر ئاگاداریان کردەوە بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو واجبە لەسەر ئەو کەسەی کە دەزانێت سەهوی کردووە لێی جیا ببێتەوە بۆ خۆی سەلام بداتەوە یان چاوەڕێ بکات لەگەڵ پێشنوێژدا سەلام بداتەوە.

لەو بارەوە پرسیار کرا لە ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لیّ بیّ ئەویش وتی: نابێت شوێن پێشنوێژ بکەون، بەڵکو بە دانیشتنەوە چاوەڕێی بکەن هەتا پێشنوێژ سەلام دەداتەوە، یان پێش پێشنوێژ سەلام بدەنەوە بەڵام وا چاکترە چاوەڕێی بکەن.(مجموع الفتاوی). بەڵام ئەوانەی شارەزای حوکمی شەرعی نین ئەگەر شوێنی پێشنوێژ کەوتن نوێژەکەیان دروستە وەك ئەوانە وان کە شوێن پێشنوێژ دەکەون نازانن کە پێشنوێژ رکاتێکی زیادەی کردووە[480].

**٢٥- ئینکاری ئەوەی ئیقتیدا دەکا بە کەسێکەوە کە هەستاوەتەوە بۆ تەواوکردنی رکاتە فەوتاوەکانی:**

کاتیّ کەسێك هاتە مزگەوت دەبینیّ پێشنوێژ دوو رکات لە پێشیەوەیەتی -بۆ نمونە نوێژی عیشا- لەگەڵ پێشنوێژدا دوو رکاتەکە تەواو دەکات دوای ئەوەی پێشنوێژ سەلامی دایەوە ئەو هەستایەوە بۆ تەواوکردنی دوو رکاتەکەی تر.. ئەگەر کەسێك ویستی لەدوایەوە نوێژی جەماعەت بکات ئەوا نوێژەکەی دروستە، بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە دەڵێن نوێژەکەی دروست نیە.

بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پیاوێکی بینی بە تەنیا نوێژی دەکرد فەرمووی: (أَلاَ رَجُلٌ يَتَصَدَّقُ عَلَى هَذَا فَيُصَلِّيَ مَعَهُ)[481]. واتە: ئەوە کەسێك نیە خێر بەمە بکات و نوێژی لەگەڵدا بکات.

**٢٦- دیاریکردنی شوێنی تایبەت لەلایەن کەسێکەوە لە مزگەوتدا:**

یەکێکی تر لەو سەرپێچیانەی لەناو نوێژخوێناندا بڵاوبۆتەوە: ئەوەیە کەسێك لە مزگەوتدا شوێنێکی تایبەت بۆ خۆی تەرخان بکات بە شێوەیە هەرگیز کەس نەتوانیّ نوێژی تێدا بکات.

---

480– مجلة البحوث: (٨٧/١٥) نقلا من مخالفات الصلاة والطهارة.

481–رواه أبو داود وابن حبان عن أبي سعيد – صحيح الجامع: ٢٦٥٢.

ئیبن قەیم رەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (بدائع الفوائد)دا دەڵێ: پێشەوا (مروزی) دەڵێ: ئەبو (عبدالله) لەدوای پێشنوێژەوە لە شوێنێکی ریزەکەدا نوێژی دەکرد خەڵك دورکەوتبونەوە لەو شوێنەو چۆڵیان کردبوو پێیان وابوو بۆ کەس نیە لەو شوێنەدا نوێژ بکات، ئەویش شوێنەکەی بەجێهێشت و چووە شوێنێکی تری ریزەکەوە و فەرمووی: دیاریکردنی شوێنی تایبەت لەلایەن کەسێکەوە وەك پەچەی وشتر قەدەغەکراوە[482].

**٢٧- شوێن گرتن بەدانانی راخەر یان هەر شتێکی تر:**

ئەمەش دەچێتە ریزی سەرپێچیەکەی پێشووەوە... ئەسڵ ئەوەیە نوێژخوێن پێش وەخت بڕوات بۆ مزگەوت شوێن بگرێت بۆ خۆی، بەڵام شوێن گرتن بە راخەر و دواکەوتن سەرپێچی کردنی شەرعە لە دوو رووەوە: لەرووی دواکەوتنیەوە، وە لەرووی داگیرکردنی شوێن لە مزگەوتدا بۆ نوێژکردن، وە رێگری لەوانە کە پێشتر دەچن بۆ مزگەوت.

---

482– بدائع الفوائد للإمام ابن القيم: (٣/ ٨٢) .

# هەڵەی پێشنوێژەکان لە نوێژدا

لێرەدا مەبەستم ئەو پێشنوێژەیە کە پێش نوێژی پێنج نوێژەکەیان بۆ دەکات، ئەوەش ئێوەو کۆمەڵێك لەو هەڵانەی کە لە نێوان پێشنوێژی مزگەوتەکاندا بڵاوبونەتەوە:

**١- ماوەیەکی درێژ بێدەنگی پێشنوێژ لە دوای خوێندنی فاتیحەوە:**

زۆر لە پێشنوێژەکان لە نوێژە ئاشکراکاندا لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەوە تا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ دەبن بۆ ئەوەی مەئمومەکان سورەتی فاتیحە بخوێنن، ئەم بێ دەنگیەش لەیەك فەرمودەی (صحیح)دا سابت نەبووەو نەهاتووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم.

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە لە کتێبی(فتاوی)دا دەڵێ: بێدەنگی پێشنوێژ بۆ ئەوەی مەئموم سورەتی فاتیحە بخوێنێ لای پێشەوا ئەحمەد موستەحەب نیە، بەڵام لای هەندێ لە هاوەڵانی موستەحەبە، وەك زانراویشە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئەگەر ئەوەندە بێدەنگ بوایە هەتا مەئمومەکان سورەتی فاتیحەیان بخوێندایە ئەوا لێیەوە دەیانگێڕایەوە، مانای وایە نەیکردووە.

لەوبارەوە پرسیاریان کرد لە شێخ عبدالعزیز بن باز رەحمەتی خوای لێ بێ، ئەمەش دەقی پرسیاری یەکەمە:

**بێدەنگی پێشنوێژ بۆ ئەوەی مەئموم سورەتی فاتیحە بخوێنێ حوکمی چییە ئەگەر پێشنوێژ بێدەنگ نەبوو مەئموم چۆن سورەتی فاتیحە بخوێنێ؟**

**ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: هیچ بەڵگەیەکی راست و ئاشکرا نیە لەسەر ئەوەی پێشنوێژ لە دوای خوێندنی سورەتی فاتیحەوە تا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بێ بۆ ئەوەی مەئموم سورەتی فاتیحە بخوێنێ، بەڵام سوننەتە مەئموم لەکاتی وەستانە کەمەکانی ئیمامدا ئەگەر وەستا بیخوێنێ ئەگەر بۆی ئاسان نەبوو بە نهێنی بیخوێنێ، ئەگەر پێشنوێژ دەیخوێند پاشان بێدەنگ بوو بەگشتی ئەم فەرمودە:**

(لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ)[483]. واتە: ئەو کەسەی سورەتی فاتیحە نەخوێنێت نوێژەکەی دروست نیە. وە ئەم فەرمودە: (لَعَلَّكُمْ تَقْرَؤُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ). واتە: ئێوە لەدوای پێشنوێژەوە قورئان دەخوێنن؟ وتمان بەڵێ، فەرمووی: (لاَ تَفْعَلُوا إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَإِنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا)[484]. واتە: ئەوە مەکەن تەنها سورەتی فاتیحە بخوێنن، چونکە ئەو کەسەی سورەتی فاتیحە نەخوێنێت نوێژی بۆ نیە واتە نوێژەکەی دروست نیە.

ئەم دوو فەرمودە ئەم ئایەتە بەگشتی بوون دەردێنن و تایبەتی دەکەن: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾﴾ الأعراف: ٢٠٤. واتە: کاتێك قورئان خوێندرا گوێی لێ بگرن و بێ دەنگ بن بۆ ئەوەی خوا میهرەبانیتان لەگەڵ بکات.

هەروەها ئەم فەرمودەش تایبەت دەکەن واتە: ئەو دوو فەرمودەی پێشوو دەبن بە (مخصّص) یانی تایبەتکەر بۆ ئەم ئایەت و فەرموودە: (إِنَّمَا جُعِلَ الْإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ فَلَا تَخْتَلِفُوا عَلَيْهِ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا...)[485]. واتە: پێشنوێژ بۆیە دانراوە چاوی لێ بکرێت، جا پێشی مەکەون، کاتێ وتی: (الله اکبر)، ئێوەش بڵێن: (الله اکبر)، کاتێ چووە رکوعەوە ئێوەش رکوع بەرن[486].

## ٢- وتەی: (إن الله لا ينظر إلى الصف الأعوج):

هەندێ لە پێشنوێژەکان کاتێ هەستان بۆ نوێژکردن دەڵێن: (إن الله لا ينظر إلى الصف الأعوج) واتە: خوای پەروەردگار سەیری ریزی لارو وێر ناکات. ئەم وتەیە دەدەنە پاڵ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم... لەکاتێکدا ئەمە هەر فەرمودە نیە، ئەم فەرمودەمان بەسە کە چاکترەو لەپێش ترەو سابت بووە لە پێغەمبەری خواوە صلى الله عليه وسلم کە دەفەرموێت: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ)[487]. واتە: ریزەکانتان رێك بکەن چونکە رێکوپێکی ریزەکان بەشێکە لەتەواوی نوێژەکە.

---

483– متفقٌ عليهِ.

484– رواه أحمد وأبو داود وابن حبان بإسناد حسن.

485– متفقٌ عليهِ.

486– نقلا من مختصر مخالفات الطهارة والصلاة : (ص: ٨٨–٨٩).

487– متفقٌ عليهِ عن أنس – صحيح الجامع: (٣٦٤٧).

**٣- خوێندنی چەند ئایەتێك لەسەریەك و بێ پچڕان:**

ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم، چونکە سابت بووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە ئایەت ئایەت قورئانی خوێندووەو وەستاوە لەسەریان.

دەربارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پرسیاریان کرد لە ئوم سەلەمە رەزای خوای لێ بێ ئەویش فەرمووی: (پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ئایەت ئایەت قورئانی دەخوێند بەم شێوەیە: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾. پاشان دەوەستا: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾﴾. پاشان دەوەستا)[٤٨٨].

پێشەوا ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: وەستانی خوێنەر لەسەر ئایەتەکان سوننەتە با ئایەتی دووهەمیش پەیوەندی هەبێت بە یەکەمەوە پەیوەست بوونی (صفە)ە بە (الموصوف)ەوە یان جگە لەویش)[٤٨٩].

**٤- زۆر لە خۆکردن لەکاتی قورئان خوێندندا:**

دەبینین هەندێ لە پێشنوێژەکان لەکاتی قورئان خوێندندا زۆر لە خۆیان دەکەن بە تایبەتی لەکاتی دەربڕینی هەندێك وشەدا بەشێوەیەك دڵ بێزار دەبێ، ئەمەش دەبێتە هۆی فیتنە بۆ خەڵك و ریگری لە گوێگرتن بۆ قورئان، لەکاتێکدا کە خوای پەروەردگار قورئانی ئاسان کردووە وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾﴾ القمر: ١٧. واتە: سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری لێ وەرگرتن، جا ئایا پەند وەرگرێك هەیە؟.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾﴾ المزمل: ٤. واتە: قورئان بخوێنە یەك لەدوای یەك و ئایەت بەشوێن ئایەتدا. دوای ئەوەی خوای پەروەردگار قورئان خوێندنی ئاسان کردووە لەسەرمان ئیتر پێویست ناکات ئاڵۆزی بکەین.

---

[488]– رواه الترمذي والحاكم عن أم سلمة – صحيح الجامع: (٥٠٠٠).

[489]– الاختيارات الفقهية للإمام إبن تيمية: (ص: ٩٨).

**٥- پێشنوێژ پاڕانەوە تایبەت دەکات بەخۆیەوە:**

ئەمەش هەڵەیە، چونکە لەسەریەتی بە شێوەی کۆ بپاڕێتەوە، بێگومان دەبێ بپاڕێتەوە بۆ خۆی و بۆ برا موسوڵمانەکانی ناو مزگەوت، بگرە دەبێ بپاڕێتەوە بۆ هەموو موسڵمانانی جیهانیش لەهەر شوێنێك هەن.. بۆ نمونە بڵێ: (اللَّهُمَّ اهْدِنَا فِيمَنْ هَدَيْتَ...). نەڵێ: (اللَّهُمَّ اهْدِنِي...).

**٦- گۆڕینی دەنگ لەکاتی وتنی: (الله أكبر)ی دانیشتندا:**

هەندێ لە پێشنوێژەکان کاتێ دادەنیشن بۆ تەحیات خوێندن، دەنگی خۆیان دەگۆڕن بەخاوی و درێژکردنەوە (الله أكبر) دەکەن، بەڵام کاتێك هەستانەوە بە توندی و بەدەنگی بەرز (الله أكبر) دەکەن، ئەمەش هەڵەیە، چونکە پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

بەڵکو ئەمە مەئموم سەرقاڵ دەکات لە نوێژەکەیدا، چونکە پشت بە دەکاتە سەر ئاوازی پێشنوێژ دەبەستێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پێشنوێژ هەڵەی کرد مەئموم پێی نازانێ.

بەڵام هەندێ لە زانایان دەڵێن: ڕەوایە پێشنوێژ (الله أكبر)ی ڕاوەستان درێژ بکاتەوە هەتا دەگاتە سەجدەو لە سەجدەشەوە بۆ هەستانەوە، لەبەر درێژی بەینی نێوانیان. خوای پەروەردگاریش زاناترە.

**٧- زۆر درێژکردنەوەی(الله أكبر)و وتنی بە ئاوازەوە:**

ئەمەش لە سەرپێچیە بەناوبانگەکانی ناو پێشنوێژەکانە.. دەبینین شێوەی زۆر درێژکردنەوەی(الله أكبر) لە جیاتی ئەوەی بڵێن: (الله أكبر) دەبینین دەڵێن: (ئاللە اكبر) یان دەڵێن: (الله ئەكبر) یا دەڵێن: (الله اكبار). ئەمانەش هەر هەموویان سەرپێچین و پێویستە موسڵمان خۆیان لێ بەدوور بگرێت.

**٨- زۆر مانەوە بەپێوەو کەمتەرخەمی لە ڕوکنەکانی تری نوێژدا:**

هەندێ لە پێشنوێژەکان زۆر بە پێوە دەمێننەوە - بەتایبەتی ئەگەر دەنگی خۆش بێت- بەڵام ڕکوع و سەجدەکەیان بەپەلە تەواو دەکەن، تەنانەت لە ڕکاتی سێهەم و چوارەمدا لەبەرئەوەی کە بەدەنگی بەرز قورئان ناخوێنێ، ئەوەندە بەپەلە سورەتی فاتیحە دەخوێنێ کە تۆ ناتوانی نیوەی تەواو بکەی دەچێتە ڕکوعەوە (فإنا لله وإنا إليه راجعون).

بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەندازەی راوەستانی نزیك بوو لە ئەندازەی رکوع و سەجدەو دانیشتنەکانی.

لە فەرمودەی (متفق علیه)دا لە بەرائی کوڕی عازبەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (رَمَقْتُ الصَّلاَةَ مَعَ مُحَمَّدٍ صلی الله علیه وسلم فَوَجَدْتُ قِيَامَهُ فَرَكْعَتَهُ فَاعْتِدَالَهُ بَعْدَ رُكُوعِهِ فَسَجْدَتَهُ فَجَلْسَتَهُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ فَسَجْدَتَهُ فَجَلْسَتَهُ مَا بَيْنَ التَّسْلِيمِ وَالاِنْصِرَافِ قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ). واتە: سەرنجی نوێژی موحەممەدم دا صلی الله علیه وسلم وەستانەکەیم دی، هەستانەوەی دوای رکوعەکەیم دی، سەجدەکەی، دانیشتنی نێوان سەجدەکان، سەجدەی تریش، دانیشتنی نێوان سەلام دانەوەو رۆیشتنی هەموویان نزیك بوون لەیەکەوە.

**٩- درێژکردنەوەی رکاتی دووهەم زیاتر لە یەکەم:**

هەندێ لە پێشنوێژەکان هەڵە دەکەن لەکاتێکدا کە رکاتی دووهەم لە یەکەم زیاتر درێژدەکەنەوە یان دوو رکاتی کۆتایی زیاتر درێژدەکەنەوە لە دوو رکاتی پێشەوە، ئەمە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

ئەمە پێچەوانەی کردەوەیەتی چونکە بوخاری لە ئەبو قەتادەوە رەزای خوای لێ بێ دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم رکاتی یەکەمی نوێژی نیوەڕۆی درێژدەکردەوە رکاتی دووهەمی کورت دەکردەوە، هەروەها نوێژی بەیانیش بەهەمان شێوە.

ئەبو سەعیدی خودری رەزای خوای لێ بێ دەڵێ: (كَانَتْ صَلاَةُ الظُّهْرِ تُقَامُ فَيَذْهَبُ الذَّاهِبُ إِلَى الْبَقِيعِ فَيَقْضِي حَاجَتَهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَأْتِي وَرَسُولُ اللَّهِ صلی الله علیه وسلم فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِمَّا يُطَوِّلُهَا)[490]. واتە: نوێژی نیوەڕۆ دائەبەسرا، کەسێك ئەیتوانی بچێت بۆ بەقیع پێویستی خۆی بەجێبێنێت و پاشان دەستنوێژ بگرێ و بگەڕێتەوە، هێشتا فریای رکاتی یەکەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەکەوت، ئەوەندە درێژەی دەدا بە رکاتی یەکەم.

---

[490] – أخرجه مسلم: ( ٤٥٤ ).

**١٠- درێژکردنەوەی سەلام دانەوە زیاد لە پێویست:**

هەندێ لە پێشنوێژەکان کاتێك سەلام دەدەنەوە وشەی (السلام علیکم و رحمـــة الله) زیـاد لـە پێویست درێژ دەکەنەوە، هەتا جاری وا هەیە هەندێ نوێژخوێن لەگەڵیا سـەلام دەدەنـەوە یـان پێشی دەکەون ئەوەندەی درێژ دەکەنەوە.

هەموو رۆژێ پێنج فەرزەی نوێژ ئەم کارە بە گوێی خۆم دەبیسم.

**١١- درێژکردنەوەی (الله أکبر) زیاد لە پێویست:**

هەندێ لە پێشنوێژەکان بۆ نمونە کاتێك لە رکوعەوە - دەچن بۆ سەجدە- وە لە هەموو (الله أکبر)ەکاندا ئەوەندە وشەی (الله أکبر) درێژدەکەنەوە هەتا پـێش ئـەوەی لـە ئـاوازی (الله أکـبر) ببێتەوە مەئموم سەجدە دەبات یان دەچێتە رکوعەوە یا لە سەجدە سەر بەرزدەکاتەوە.

ئەم کارە بە ئاشکرا لەو پێشنوێژانە دەبینرێ کە هەست بە دەنگ خۆشی خۆیان دەکەن. ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم. وە لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی زۆربەی مەئمومەکان پێشی بکەون و نوێژەکەیان تەواو نەبێت.

## سەرپێچیە تایبەتیەکانی نوێژی بەیانی

**١- وتنی: (صدقت وبررت):**

هەندێ لە نوێژخوێنان لە نوێژی بەیانیدا کاتێ گوێیان لە بانگبێژ بوو وتی: (**الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ**). واتە: نوێژ باشترە لە خەوتن. ئەویش دەڵێ: (صدقت وبررت).

ئەمەش هەڵەیە... چونکە سوننەت وایە بانگدەر چی وت بە دوایدا وەك خۆی بیڵێتەوە بە گشتی ئەم فەرمودە: (**إذَا سَمِعْتُمْ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ...**) . واتە: کاتێ گوێتان لە بانگدەر بوو بە دوایدا وەك خۆی بیڵێنەوە، بەڵام لە جیاتی (**حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ**)دا بڵێ: (**لا حَولَ وَلا قُوَّة إلا بالله**). لەبەر ئەوە کاتێ بانگبێژ وتی: (**الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ**). ئەوەی گوێی لێ بێ دەبێت بڵێ: (**الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ**).

**٢- خوێندنی سورەتی فاتیحە لەدوای نوێژ:**

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: ئەمەی کە دەڵێن خوێندنی فاتیحە لەدوای نوێژی بەیانی زیادەیە بۆ شەرەفی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، وە خوێندنی فاتیحە لەدوای نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا زیادەیە بۆ شەرەفی ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ و، باوەڕیان وایە لەکاتی شتنی جەنازەکەی و پرسیاری گۆڕدا ئامادەدەبن، ئەمەش وتەیەکی خراپ و درۆو دەلەسەیە، لە شەیتانی سەرکەش و لەخۆباییەوەیە[٤٩١].

**٣- وتنی سەد جار: (اللهم صلِّ عليه):**

ئەم کارەش بیدعەیەکی داهێنراوەو هیچ بنەمایەکی شەرعی نیە.

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: سەد جار سڵاواتدانیان لەسەر پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە وتنی: (اللّهم صلِّ عليه) لەدوای نوێژی بەیانی و مەغریب، بەگومانی ئەوەی کە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا حەفتا پێویستی بۆ جێبەجێ دەکات، سی پێویستیش لە دنیادا، ئەمە هیچ بنەمایەکی زانستی لەسەر نیە[٤٩٢].

---

491 – السنن والمبتدعات: (ص: ٦٠).

492 – السنن والمبتدعات: (ص: ٦١).

**٤- تەرکی نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا:**

ئەمەش پێویست بە رونتکردنەوە ناکات.. ئەوەی دەیەوێت بە چاوی خۆی ببینێ با بەیانیان بچێت بۆ مزگەوت سەیر بکات چەند کەس لە موسڵمانان ماڵیان لەنزیك مزگەوتەوەیە پاشان بچێتە ناو مزگەوتەکەوەو بزانێت چەند کەس لەوانە لانوێژی بەیانی بە جەماعەت دەکەن، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەتایبەتی ئوممەتی هانداوە بۆ نوێژی بەیانی، دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ)[٤٩٣]. واتە: ئەوەی نوێژی بەیانی و عەسر بکات دەچێتە بەهەشتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (لَنْ يَلِجَ النَّارَ أَحَدٌ صَلَّى قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا. يَعْنِي الْفَجْرَ وَالْعَصْرَ)[٤٩٤]. واتە: ئەوکەسەی نوێژی پێش خۆرکەوتن و نوێژی پێش خۆرئاوا بوون بکات ناچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، واتە نوێژی بەیانی و عەسر.

وە دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فَهُوَ فِي ذِمَّةِ اللَّهِ...)[٤٩٥]. واتە: هەرکەسێك نوێژی بەیانی بکا ئەوە لە پەناو ئامانی خوادایە.

**٥- سەرقاڵ بوون بە کاروباری دنیاوە لەدوای نوێژی بەیانی:**

زۆر لە نوێژخوێنان لە دوای نوێژی بەیانیەوە دادەنیشن قسەی دنیایی دەکەن و پێدەکەنن خۆیان بە گاڵتەو گەپەوە خەریك دەکەن، هەندێ جار دەچنە دەرەوە لە مزگەوت بۆ هەڵمژینی نەسیمی بەرەبەیان بێ ئاگادەبن لە نەسیمی ئیمان و باخی بەهەشتی زیکرکردن .. لەکاتێکدا کە کاتی زیکرکردنە.

بەڵکو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەواڵی ئەو دەستکەوتە گەورەیەی راگەیاندووە بەڵام کەم کەس بەدەستی دەهێنن.

---

493- رواه مسلم عن أبي موسى – صحيح الجامع: (٦٣٣٧).

494- رواه مسلم وأحمد عن عمارة بن روبية – صحيح الجامع: (٥٢٢٨).

495- رواه مسلم وأحمد عن جندب البجلي – صحيح الجامع: (٦٣٣٩).

له ئەنەسەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ)[496]. واتە: هەرکەسێ نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ بکات، پاشان دانیشێت زیکرو یادی خوا بکات هەتا خۆر هەڵدێت، ئینجا دوو رکات نوێژ بکات، خێرو پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواوی هەیە.

٦- (تثويب) له بانگی دووهەمدا:

ئەمەش هەڵەیەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: سوننەتە بانگبێژ (تثويب) بکات، ئەویش ئەوەیە لە بانگی بەیانیدا لەدوای (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)ەوە بڵێ: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ). واتە: نوێژ باشترە لە خەوتن، (أبو محذورة) ڕەزای خوای لێ بێ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فێری سوننەتی بانگدانم بکە، ئەویش فێری کرد و فەرمووی: (فَإِنْ كَانَ صَلَاةُ الصُّبْحِ قُلْتَ الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ...)[497]. واتە: ئەگەر بانگی نوێژی بەیانی بوو بڵێ: نوێژ باشترە لە خەوتن، نوێژ باشترە لە خەوتن.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: وتنی: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ). لە بانگی یەکەمی بەیانیدایە، کە بەر لەکاتی نوێژە بە چارەکە سەعاتێك، بە بەڵگەی فەرمودەکەی ئیبن عومەر ڕەزای خوایان لێ بێ کە دەڵێت: (الصَّلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ). دووجار بوو لە بانگی یەکەمی بەیانیدا لەدوای (حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)ەوە بوو. (رواه البيهقي: ١/ ٤)، وكذا الطحاوي في شرح المعاني: ١/ ٨٢)، وە سەنەدەکەی (حسن)ە وەك (حافظ) دەڵێ. وە فەرمودەی (أبو محذورة) گشتیە، هەردوو بانگەکە دەگرێتەوە، بەڵام بانگی دووهەم مەبەست نیە، لەبەرئەوە بەموقەییەدی هاتووە لە ریوایەتێکی تردا بەم شێوەیە هاتووە: ئەگەر بانگی یەکەمت دا لە بەیانیدا بڵێ: (الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ، الصَّلَاةُ خَيْرٌ مِنْ النَّوْمِ). (أخرجه أبو داود والنسائي والطحاوي) و جگە لەوانیش، تەخریج کراوە لە (صحيح أبي داود: ٥١٠ - ٥١٦)دا جا فەرمودەکەی (أبو محذورة) لەگەڵ فەرمودەکەی ئیبن عومەر پێك هات[498].

---

[496]– رواه الترمذي عن أنس – صحيح الجامع: (٦٣٤٦) .

[497]– رواه أحمد وأبو داود.

[498] – تمام المنة للشيخ الألباني: (ص: ١٤٦– ١٤٧).

### ٧- بانگی دووهەم پێش کاتی خۆی:

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیەکان کە زۆربەی نوێژخوێنان نوێژی بەیانی پێش کاتی خۆی ئەنجامدەدەن، بەتایبەتی ئەو مزگەوتانەی کە پێنج دەقیقە لەدوای بانگدانەوە نوێژدەکەن، لەگەڵ ئەوەدا کە لانی کەم بیست دەقیقە پێش کاتی خۆی بانگ دراوە هەروەك گۆڤاری (الأزهر)و جگە لەویش لە رۆژنامە دەوڵەتیەکان بڵاویان کردۆتەوە.

### ٨- تەرکی سوننەتی دوو بانگەکە:

بێگومان لای زۆرینەی نوێژخوێنانی زۆربەی شوێنەکان و وڵاتان سابت بووە کە نوێژی بەیانی یەك بانگە، بەڵکو ئەگەر کەسێك دوو بانگ بدات و ئەو سوننەتە زیندوو بکاتەوە ئەوا بەگشتی و بەتایبەتی ئینکاری دەکەن و نەهی لێ دەکەن.

لە پێغەمبەری خواوە صلی الله علیه وسلم سابت بووە کە دوو بانگ دراوە، لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى تَسْمَعُوا تَأْذِينَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ)[٤٩٩]. واتە: بیلال شەوی دەمێنێت بانگ دەدات، جا ئێوە بخۆن و بخۆنەوە هەتا گوێتان لە بانگی ئیبنو ئومی مەکتوم دەبێت.

بەڵام ئەوەی حەنەفیەکان دەڵێن نوێژی بەیانی یەك بانگە هیچ دەلیلێکیان نیە بیکەن بە بەڵگە، هەموو ئەوانەش کە وتویانە قسە هەیە لەسەر سەنەدەکەیان.

جمهوری زانایان دەڵێن: بە گشتی بانگدان سوننەتە لەپێش نوێژی بەیانیدا لە مانگی رەمەزان و جگە لەویش، جیاواز لە رەئی (ابن القطان) کە تایبەتی کردووە بە رەمەزانەوە[٥٠٠].

---

[499]– أخرجه البخاري: (٦٢٢-١٩١٩).

[500]– الفتح: (١٢٣/٢) لة (أخطاء المصلين): (١٢٦-١٢٧) وةرطيراوة بة دةستكاريةوة.

٩- قورئان خوێندن و (تواشیح) پێش بانگدان:

ئەمەش یەکێکە لە خراپە و داهێنراوەکان کە بووەتە هۆی ئەوەی زۆر لە موسڵمانان رقیان لە نوێژی بەیانی بێت .. چونکە وادەزانن بەکارهێنانی بڵندگۆی مزگەوتەکان بۆ پیاهەڵدان و خوێندنەوەی موناجات و هۆنراوە سوننەتە لەکاتێکدا کە داهێنراوە و هیچ بنەمایەکی نیە.

چەندەها نەخۆش بێزار و ماندوو دەکەن، چەند قوتابی خەریکی خوێندن و خوێندنەوەن و لێیان تێك دەدەن و سەرقاڵیان دەکەن، چەند کەسیش خەریکی شەونوێژ و قورئان خوێندنن بێزاریان دەکەن.

ئەمەو لەگەڵ ئەوەشدا چەندەها وشە بەکاردەهێنن لەکاتی ئاوازی (تواشیح)ەکاندا مانای شیرك و هاوەڵ بۆ خوا دانان دەگەیەنن وەك ئەوەی یەك لەوان دەڵێ: (یا محمد یا غیاث المستغثین یا أول خلق الله - أسألك بجاه نبیك محمد) واتە: ئەی موحەممەد ئەی یارمەتی دەری ئەوانەی هانات بۆ دێنن و پێویستیان بە یارمەتیە، ئەی یەکەم دروستکراوی خوا — داوات لێ دەکەم بە شان و شەوکەتی موحەممەد. ئەمەو جگە لە چەندەها وشەی تر کە زەرەر لە عەقیدە و بیروباوەڕ دەدەن.

١٠- قنوت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا بە بەردەوامی:

ئەم تایبەت کردنە بە نوێژی بەیانیەوە بیدعەیە ئەگەر لە نوێژەکانی تردا نەخوێنرێت ئەم بیدعەیەش لەناو زۆربەی وڵاتاندا بڵاوبۆتەوە هەتا گەیشتۆتە رادەیەك ئەگەر پێشنوێژ لە نوێژی بەیانیدا قنوتی نەخوێند خەڵك وادەزانن کە نوێژەکەیان دروست نیە، بەڵکو هەیانە نوێژەکەی دەکاتەوە.

لە راستیدا قنوت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا شەرعی نیە ئیللا لەکاتی ناخۆشی و کارەساتدا نەبێ... ئەو کاتەش دەبێت لە نوێژی بەیانی و نوێژەکانی تریشدا بخوێنرێت.

بەڵام ئەوەی کە شافیعیەکان دەڵێن قنوت خوێندن لە نوێژی بەیانیدا سوننەتە، با لەکاتی ناخۆشی و کارەساتیشدا نەبێ، فەرمودەکەی ئەنەسیان رەزای خوای لێ بێ کردووە بە بەڵگە کە دەفەرموێت: (مَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقْنُتُ فِي الْفَجْرِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا)[٥٠١] . واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بە بەردەوامی لە نوێژی بەیانیدا قنوتی خوێندووە هەتا لەدنیا دەرچوو. ئەم فەرمودە(ضعیف) لاوازە چونکە (أبو جعفری الرازی) تێدایە.

[501]- رواه أحمد: (١٦٢/٣) ودار القطني: (٢/ ٣٩) بإسناد ضعيف.

ئیبن قەیم لە کتێبی (زاد المعاد)دا دەڵێ: ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم وابووە بە تایبەتی لەکاتی بەڵاو کارەساتدا قنوتی خوێندووە، کاتێك بەڵاکە نەمایە تەرکی دەکرد، تایبەتی نەکردبوو بە نوێژی بەیانییەوە، بەڵکو زۆربەی قنوت خوێندنی لە نوێژی بەیانیاندا لەبەرئەوە بووە کە درێژکردنەوەی شەرعیە، چونکە لەگەڵ شەونوێژدا پەیوەندیان هەیە، نزیکە لە بەرەبەیانەوە، کاتی گیرابوونی پاڕنەوەیە، کاتی دابەزینی خواوەندی گەورەیە، مەلائیکەکانی شەو و ڕۆژ ئامادەی دەبن، هەروەك ئەم ئایەتە دەیسەلمێنێت: ﴿وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾﴾ الإسراء: ٧٨.

وەك ئاشکرایە ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم هەموو بەیانیەك قنوتی بخوێندایە، بەو پاڕانەوەیە بپاڕایەتەوە، هاوەڵان بیانخوێندایە، ئەوا نەقڵیان دەکرد وەك چۆن کاتەکەی و ژمارەی ڕکاتەکانی و بە ئاشکرا خوێندنیان نەقڵ کردووە، ئەگەر قنوت بوونی هەبوایە و هاوەڵان لە نەقڵ کردنیدا کەمتەرخەمیان بکردایە ئەوا لە گێڕانەوەی ئەم شتانەی تریشدا کەمتەرخەمیان دەکرد.

بەڵام وتەی بە ویژدانەوە کە زانای بە ویژدان ڕازە دەکات ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە نوێژی بەیانیدا قنوتی خوێندووەو وازی لێ هێناوە، بە نهێنی و بە ئاشکرا، بەڵام نهێنی زیاتر بووە لە ئاشکرایی، تەرککردنی زیاتر بووە لە خوێندنی، بێگومان لەکاتی بەڵاو کارەساتدا قنوتی خوێندووە دوعای لە قەومێ یان لەکەسانێ کردووە، ئەگەر وازیان لەکارەکە بهێنایە ئەویش وازی لە پاڕانەوە لەدژیان دەهێنا، یان ئەگەر ئەسیریان ڕزگار بکردایە، یا ئەوانەی دەعای لێ دەکردن تەوبەیان بکردایە و ئیمانیان بهێنایە، قنوت خوێندنەکەی لەبەر ڕوداوێ بووە، ئەگەر نەمایە تەرکی قنوتی دەکرد، قنوت خوێندنی تایبەت نەکردبوو بە نوێژی بەیانیەوە، بەڵکو لە نوێژی بەیانی و مەغریبدا دەیخوێند، پێشەوا بوخاری لە صەحیحەکەیدا لە ئەنەسەوە گێڕاویەتیەوە[٥٠٢].[٥٠٣]

---

502 – أخرجه البخاري: (٢/٤٠٨) الوتر – ومسلم: (٦٧٧) المساجد.

503 – زاد المعاد للإمام ابن قيم: (١/٢٧٢– ٢٧٣) بە دەسکاریەوە.

## سەرپێچیەکان لە قنوتدا

**١- دەڵێن: قنوت لە وەتردا واجبە:**

شێخ ئەلبانی دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەندێك جار دوعای قنوتی دەکرد لە رکاتەکەی وەتردا، دەشیخستە پێش رکوعەوە. وە حەسەنی کوڕی عەلیشی رەزای خوایان لێ بێ بەو شێوەیە فێرکردبوو کە ( ئەگەر قورئان خوێندنەکەی تەواو بوو لە نوێژی وەتردا بڵێ: (اللّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ ، [فـ]إِنَّكَ تَقْضِي ، وَلا يُقْضَى عَلَيْكَ ، [و]إِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَـنْ وَالَيْـتَ ، [وَلا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ]، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ ). [لاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ].

هەر وەکو وتمان: (هەندێك جار وایکردووە) چونکە هاوەڵان وەتریان گێڕاوەتەوە و باسی قنوتیان نەکردووە تێیدا، ئەگەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەردەوام دوعای قنوتی بکردایە هەموویان لێیەوە دەیانگێڕایەوە.

بەڵێ ئوبەی کوڕی کەعب لێیەوە گێڕاویەتیەوە بە تەنیا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەندێك جار دوعای قنوتی کردووە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە واجب نیە، ئەمەش مەزهەبی جمهوری زانایانە، لێکۆڵەرەوە (ابن الهمام) لە کتێبی ( فتح القدير: ١/٣٠٦ و ٣٥٩ و ٣٦٠)دا دانی بەوەدا ناوە کە وتەی ئەوانەی دەڵێن واجبە لاوازە و بەڵگەیان نیە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ بەویژدانە و دەمارگیری نیە، چونکە ئەوەی تەرجیحی پێداوە پێچەوانەی مەزهەبەکەی خۆشیەتی[504].

**٢- زیادکردنی: (فَلَكَ الْحَمْدُ عَلَى مَا قَضَيْت):**

پێشەوا نەوەوی لە کتێبی (روضة الطالبين: ١/ ٢٥٣)دا دەڵێ: شتێکی زیادەیە.

واتە ئەمە لە سوننەتدا هیچ بنەمایەکی نیە وە لە رێبازی پێغەمبەر نیە صلی الله علیه وسلم، لەگەڵ ئەوەشدا لە وشە بڵاوەکانی ناو پاڕانەوەی قنوتە.

---

504 - صفة صلاة للشيخ الألباني: (ص: ١٤٢- ١٤٣).

**٣- وتنی: ،أشهد وحقا، لەکاتی بیستنی قنوتدا:**

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: وتنی «حقاً، حقاً» لەکاتی بیستنی قنوتدا بیدعەیە ئەگەر نەشبێت بەهۆی نوێژ بەتاڵ کردنەوە لانی کەم کەراهەتی هەیە[505].

لە سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی نیە ڕەزای خوایان لێ بێ.

**٤- تایبەت کردنی قنوتی وەتر بەکاتی دیاریکراوەوە:**

زۆربەی نوێژخوێنان و شافیعیەکان کاتیان بۆ دیاریکردووە بەڵام زۆربەی خەڵك لەسەر دیاریکردنی کاتی قنوتی وەتردا رایان جیاوازە، هەندێکیان مانگی ڕەمەزانیان دیاریکردووە، هەندێکی تر نیوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، هەندێکیش دەڵێن: بەڵکو نیوەی یەکەمی مانگی ڕەمەزانە.

لێرەدا ڕاستی ئەوەیە: بێگومان قنوتی وەتر تایبەت نیە بەکاتی دیاریکراوەوەو لە ساڵدا، بەڵکو مەشروعە لە تەواوی ساڵدا، ئەوانەی رایان لەسەر کاتی دیاریکراوە بەڵگەی سابتیان بەدەستەوە نیە[506].

**٥- سڵاوەتدان لەدوای خوێندنی قنوت:**

خەڵك بەگشتی و بەتاك کەوتونەتە ئەم هەڵەوە لەگەڵ ئەوەشدا لە سوننەتی پێغەمبەری خوا نیە صلی الله علیه وسلم.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: (ئاگاداری): پێشەوا (نسائی) لە کۆتایی قنوتەوە ئەمەی بۆ زیادکردووە (وصلّى الله على النبي الأمي) لەکاتێکدا سەنەدەکەی (ضعیف) لاوازە، پێشەوایان (حافظ ابن حجر) و (قسطلاني)و (زُرْقاني)و جگە لەوانیش بە لاوازیان داناوە، هەر لەبەر ئەوەیە کە من لەکۆکردنەوەی وشەو رستە زیادەکانی ناو فەرمودەکاندا ئەم هێناوەو مەرجەکەی خۆمم پاراستووە کە لە پێشەکی کتێبەکەدا باسم کردووە.

---

505 – السنن والمبتدعات: (ص: ٦٣).

506 – أخطاء المصلين: (ص: ١٣٣–١٣٤).

(عز)ی کوڕی (عبدالسلام) له کتێبی: (الفتاوی: ١/٦٦ — ساڵی١٩٦٢)دا دەڵێ: سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم له قنوتدا دروست نیه، نابێت هیچ شتێك له سڵاواتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم زیاد بکرێت.

ئەم وتەیە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە(عز)ی کوڕی (عبدالسلام) زیادەڕەوی نەکردووە لەباوەڕەکەی خۆیدا کە (بیدعه الحسنه) واته داهێنراوێکی چاك بوونی هەیە، هەروەك هەندێ له زانایانی دواین(خلف) دەیکەن و دەیلێن[507].

٦- سەرپێچی له قنوتی کاتی بەڵاو کارەسات:

هەندێ له پێشنوێژەکان و بانگخوازان ئەگەر بیانەوێ بپاڕێنەوە لەکاتی بەڵاو کارەساتدا دەپاڕێنەوە بە دوعاکەی حەسەنی کوڕی عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ: (اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ...).

لەکاتێدا کە ئەم دوعایە تایبەتە بە نوێژی وەترەوە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وازی هێناوە لەوەی کە پاڕانەوەیەکی دیاریکراوی بۆ دابنێ چونکە پەیوەستە بە حاڵەتە تایبەتیەکان و کارەساتەکانەوەو هەر حاڵەت و کارەساتێك پاڕانەوەی تایبەت بە خۆی بۆ دەکرێ.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەهەر پێنج فەرزەکەدا قنوتی دەکرد واته تایبەتی نەدەکرد بە نوێژی بەیانیەوە، بەڵام قنوتی نەدەکرد جگە لەو کاتە نەبێت کە دوعا لە یەکێك بکات یان بۆ کەسێك بپاڕێتەوە، لەو دوعایانەش کە کردوویەتی: هەندێ جار دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ اللَّهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَاجْعَلْهَا سِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ، [اللَّهُمَّ الْعَنْ لِحْيَانَ وَرِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ]). پاشان کە لە قنوتەکەی دەبووەوە، (الله اکبر)ی دەکرد و سەجدەی دەبرد واته سەڵاواتی پاش قنوتی نەدەخوێند[508].

---

[507] – صفة صلاة النبي: (ص: ١٤٢– ١٤٣).

[508] – صفة صلاة النبي: (ص: ١٤١– ١٤٢).

**٧- مەسحی دەم و چاو دوای قنوت:**

ئەم عادەتەش لەناو زۆربەی خەڵکدا بڵاوە... لە سوننەتدا هەیچ بنەمایەکی نیە، بەڵکو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: مەسحی دەم و چاو لەم شوێنەدا نەهاتووە و بیدعەیە، لە دەرەوەی نوێژیشدا دروست نیە، هەموو ئەوانەی ریوایەت کراون لەوبارەوە لاوازن، بەڵکو هەندێکیان لە هەندێکی تریان لاوازترن هەروەك تەحقیقم کردوون لە (ضعیف أبي داود: ٢٦٢) و (الأحادیث الصحیحە: ٥٩٧)دا، هەر لەبەرئەوەیە کە (عز)ی کوڕی (عبدالسلام) لە هەندێ لە فتواکانیدا دەڵێ: تەنها نەزانەکان ئەم کردەوەیە دەکەن[509].

509 – صفة صلاة النبي: (ص: ١٤١).

## سەرپێچیە تایبەتیەکان لە نوێژی شێواندا

### ١- بیروباوەڕ بەوەی کە کورتکردنەوەی نوێژی شێوان واجبە:

هەندێ لە نوێژخوێنان دەڵێن نوێژی مەغریب غەریبە لەبەر ئەوە دەبێت بە خێرایی قامەت بکرێ و نوێژەکە بەدوایدا.. ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرە **صلى الله عليه وسلم**.

(شیخ محمد عبدالسلام الشقيري) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەندێ جار ئەوەندە درێژەی دەدا بە نوێژی شێوان سورەتی (الأعراف)ی دەخوێند لەدوو ڕکاتدا لەهەر ڕکاتێکدا نیوەی دەخوێند، جاری واش هەبوو سورەتی (الصافات)ی دەخوێند، هەندێ جار سورەتی (المرسلات)ی دەخوێند، جاری واش هەبوو سورەتە کورتەکانی دەخوێند، ئەمانە هەموویان لە ڕیوایەتی (صحيح)دا هاتوون، سوننەت وایە لەسەر شێوەیەك لە درێژی و کورتیدا بەردەوام نەبن، بەڵکو هەندێ جار بە درێژی و هەندێ جاریش بەکورتی بەپێی کات و حاڵەت بێت[510].

### ٢- خوێندنی دوعایەکی نادروست لەکاتی بیستنی بانگی شێواندا:

دەبینین زۆر لە موسڵمانان لەکاتی بیستنی بانگی شێواندا ئەم دوعایە دەڵێنەوە: (**اللّهمّ هذا إقبالُ ليلِك وإدبارُ نهارِك وأصواتُ دُعاتِك، فَاغْفِرْ لي..**)[511]. واتە: خوایە ئێستا کاتی هاتنی شەوەکەتەو، ڕۆشتنی ڕۆژەکەت، وە کاتی بیستنی دەنگی بانگەوازکەرانی تۆیە لێم خۆشببە. ئەم فەرمودە (ضعيف) لاوازە.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: بێگومان ئەمە فەرمودە پێشەوا (ترمذي)و جگە لەویش گێڕاویانەتەوە لە (أبي كثير مولى أم سلمة)ەوە، وە (ترمذي) دەڵێ: فەرمودەیەکی غەریبە، چونکە (أبو كثير) " کە ڕاوی فەرمودەکەیە " ئێمە نایناسین، هەر بۆیە پێشەوا نەوەوی دەڵێ: بەڵێ (أبو داود والترمذي) ڕیوایەتیان کردووە بەڵام لەسەنەدەکەیدا کەسانی نەناسراو هەیە.

---

510 – السنن والمبتدعات: (ص: ٦١).

511– رواه أبو داود وضعفه الألباني في (سنن أبي داود: (٥٣٠).

لەبەر ئەوە دروست نیە وێنەی ئەم فەرموودە بڵاوبکرێتەوە لەناو ئوممەتدا تەنها کاتێك نەبێ کە حاڵەتی لاوازیەکەی ئاشکرا بکرێت[512].

**٣- ئینکاری کردنی سوننەتی پێش شێوان:**

دوو رکات نوێژ لە پێش شێواندا سوننەتێکی موستەحەبە کەچی هەندێ ئینکاری ئەم سوننەتە دەکەن، بەڵکو ئینکاری ئەو کەسەش دەکەن کە ئەو دوو رکاتە دەکات... ئەمەش هەڵەیە.

بەڵام پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئینکاری ئەم سوننەتەی نەکردووە بەڵکو بە سابتی هاتووە کە فەرموویەتی: (صَلُّوا قَبْلَ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ .. قَالَ فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً)[513]. واتە: دوو رکات نوێژ لەپێش نوێژی شێوانەوە بکەن، دووجار ئەمەی فەرموو، جاری سێهەم تا گومان نەکرێ کە ئەمە فەرزە فەرمووی: هەرکەس ئارەزوو دەکات.

(المحب الطبري) دەڵێ: هیچ شتێ لە موستەحەبی ناخات، چونکە مومکین نیە فەرمان بەشتێك بکات موستەحەب نەبێت، بەڵکو ئەم فەرموودە بەهێزترین بەڵگەیە لەسەر موستەحەبی[514].

لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ الْمُؤَذِّنُ إِذَا أَذَّنَ قَامَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَبْتَدِرُونَ السَّوَارِيَ حَتَّى يَخْرُجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُمْ كَذَلِكَ يُصَلُّونَ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ ، وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ شَيْءٌ . قَالَ عُثْمَانُ بْنُ جَبَلَةَ وَأَبُو دَاوُدَ عَنْ شُعْبَةَ لَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلاَّ قَلِيلٌ)[515]. واتە: کاتێ بانگبێژ بانگی دەدا پیاوانی یارانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پەلە پەل پەلاماری تەنیشت کۆڵەکەکانی مزگەوتەکەی پێغەمبەریان دەدا، دوو رکات سوننەتی پێش نوێژی شێوانیان دەکرد هەتا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەهاتە ناو مزگەوت، نێوان بانگ و قامەت کاتەکەی زۆر نیە بۆیە بەپەلە دوو رکات نوێژیان دەکرد، ئاماژەیە بۆ فەرمودەی نێوان هەموو بانگ و قامەتێك دوو رکات نوێژ هەیە بۆ کەسێ بیەوێ.

---

512 – تمام المنة: (ص: ١٤٩).

513– أخرجه البخاري: (١١٨٣– ٧٣٦٨).

514 – فتح الباري: (٣/٧٢).

515– أخرجه البخاري: (٦٢٥).

پێشەوا (قرطبی) و جگە لەویش دەڵێن: بێگومـان زاهـیری فەرمودەکەی ئەنـەس ئـەوە دەگەیەنێت دوو رکات پێش نوێژی شـێوان دوای دەرچـوونی خـۆر پێغەمبـەر صـلی الله علیـە وسلم هاوەڵانی لەسەر راهێناوەو کاریان پێکردووە هەتا پـێش برکێیـان بـۆ کـردووە، ئەمـەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موستەحەبە، ئەصلی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم فەرمودەیـە: (بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ) . واتە: نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا دوو رکات نوێژ هەیە بۆ کەسێ ئارەزوو بکات. بەڵام ئەوەی کە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم نـەیکردوون بـە بـەردەوامی ئـەوە لـە موستەحەبیان ناخات، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لـە سـوننەتە راتبـەکان نـین، پێشەوا ئەحمەد و ئیسحاق و زانایانی فەرمودەناس رایان لەسەرئەوەیە کە موستەحەبن[٥١٦].

516 – فتح الباري: (١٢٨/٢).

## سەرپێچیەکان لە شەونوێژدا

**١- وازهێنان لە شەونوێژ:**

بێگومـان شـەونوێژ کـەس سـەرکەوتوو نیـە تێیـدا تـەنها ئـەو کەسـانە نـەبێت کـە ئیمـان گەیشتۆتە ناو پەڕەکانی دڵیان... بەڵام زۆربەی موسڵمانانی ئـەم ڕۆژگـارە نوێـژی بـەیانی بـە جەماعەت ناکەن، چ جای ئەوەی کە وازیان لە شەونوێژ هێناوە. (فإنا لله وإنا إليه راجعون).

لەبارەی فەزڵ و گەورەیی شەونوێژەوە فەرمودەی زۆر هاتوون هەندێکیان باس دەکەین بەڵکو سوودی هەبێت بۆ هەموو موسڵمانێ لەدنیاو قیامەتدا:

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیه وسلم فەرمویەتی: (يَعْقِدُ الشيطانُ عَلَى قَافِيَةِ رأْسِ أَحَدِكُم اذا هُوَ نامَ ثَلاَثَ عُقْدٍ، يَضرِبُ على كُلِ عُقدَةٍ، عَلَيْكَ لَيْلٌ طوَيْلٌ فَارقد، فإن استَيْقِظَ، فَذَكَرَ الَّله تَعالى، انحَلَّت عُقْدةٌ، فإن توضَأ، انحَلَّـت عُقْدَةٌ، فإن صَلَّى انحَلَّت عُقدَة كُلُّها، فَأصبحَ نَشِيطاً طَيِّـبَ الـنَّفس، وَإلا أَصْـبَحَ خَبيـثَ الـنَّفسِ كَسْلانَ)[517]. واتە: کاتێك دەخەون شەیتان سێ گرێ دەدات لەبەشی دواوەی سەری هەریـەکێك لە ئێوە دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژە ڕاکشێ لێی بەبێ خەم، ئەگەر هەستا لەخەو زیکری خوای گەورەی کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژی گرت گرێیەکی تریان دەکرێتەوە، ئەگەر نوێژی کرد گرێکەی تریشیان دەکرێتەوە، ئەوکاتە لەخەو هەڵئەسێ دڵخۆش و چوست و چالاك دەبێ، ئەگەر واشی نەکرد ئەوا بەیانی لەخەو هەڵئەسێ تەمەڵ و سست و پەست و دڵگران دەبێ.

لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم فەرمویـەتی: (إنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا ، يُرَى ظَاهِرُهَا مِنْ بَاطِنِهَا ، وَبَاطِنُهَـا مِـنْ ظَاهِرِهَا ، أَعَدَّهَا اللهُ لِمَنْ أَطْعَمَ الطَّعَامَ ، وَأَفْشَى السَّلاَمَ ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّـاسُ نِيَـامٌ)[518]. واتـە: بێگومـان بەهەشـت ژووری وای تێدایـە لـە ناویـەوە دەرەوەی دەبینـی، لـە دەرەوە نـاوەوەی دەبینی، ئامادەکراوە بۆ ئەو کەسەی کە خواردن بدات بە فەقیرو هەژاران، سەلام بڵاوبکاتەوە، شەونوێژ بکات لەکاتێکدا خەڵك خەوتوون، قورئانی زۆر بخوێنێ لە شەودا.

---

[517]- أخرجه البخاري ومسلم وأبو داود والنسائي وابن ماجة.

[518]- رواه ابن حبان وصححه الألباني في صحيح الترغيب والترهيب: (٦١٤).

جابیر ڕەزای خوای لێ بێ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بوو دەیفەرموو: (إنّ فى اللّيل لَساعةً، لا يوافِقُها رَجُلٌ مسلِم يَسْأَلُ اللهُ خَيْراً من أَمْرِ الدُنيا وَالآخِرة، إلاّ اعْطاهُ اللهُ إِيّاهُ، وذلِك كُلّ لَيْلَة)[519]. واتە: هەموو شەوێك كاتێكی تايبەتی تێدايە، هەر پياوێكی موسوڵمان بۆی ڕێك بكەوێ لەو كاتەدا هەر شتێك داوا بكات لەخێرو بێری دنياو قيامەت بێگومان خوای گەورە پێی دەبەخشێت، ئەوكاتەش دياريكراو نيە و لە هەموو شەوێكدا ئەوكاتە هەيە.

لە ئەبو ئومامەی باهيليەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمويەتی: (عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ، فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ لَكُمْ إِلَى رَبِّكُمْ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ عَنِ الإِثْمِ)[520]. واتە: شەونوێژ بكەن و بەردەوام بن لەسەری بەگوێرەی توانا، چونكە ئاكارو ڕەوشتی پياوچاكانی پێش ئێوە بووە، نزيك بوونەوەيە لە پەروەردگارتان، هۆی كەفارەت و لێ خۆشبوونی كردەوە ناپەسەندەكانتانە، بەرهەڵستی كەری خراپەو تاوانە.

لە ئەبو هورەيرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتويەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموويەتی: (رَحِمَ اللَّهُ رَجُلا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ، رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا، فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ)[521]. واتە: ڕەحمەتی خوا لەو پياوەی كەشەو هەستا بۆ شەونوێژ ژنەكەشی هەڵئەسێنێ ئەگەر خەو بەری نەدا يان تەمەڵی كردو هەڵنەسا ئاو دەپرژێنێ لەدەم و چاوی، هەروەها ڕەحمەتی خوا لەو ژنەی كە هەستا بۆ شەونوێژ و مێردەكەشی هەڵدەسێنێ، ئەگەر خەبەری نەبووەوە لەبەر تەمەڵی ئاو دەپرژێنێ لە دەم و چاوی تا خەبەری دەبێتەوە.

لە ئەبو هورەيرە و ئەبو سەعيدەوە ڕەزای خوايان لێ بێ هاتووە دەفەرموون: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموويەتی: (إذا أَيقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللّيلِ فَصَلّيا، أوصَلّى رَكْعَتَينِ جَميعاً، كُتِبا فى (الذّاكرينَ وَالذّاكِرَاتِ)[522].

---

[519]- أخرجه مسلم عن جابر – صحيح الترغيب و الترهيب: (٦١٩).

[520]- رواه الترمذي وابن خزيمة والحاكم – صحيح الترغيب و الترهيب: (٦٢٠).

[521]- رواه أبو داود والنسائي وابن ماجه – صحيح الترغيب والترهيب: (٦٢١).

[522]- رواه أبو داود والنسائي وابن ماجه – صحيح الترغيب والترهيب: (٦٢٢).

واتە: ئەگەر پیاوێك شەو هەستا لەخەو ژنەکەشی هەستاند و دوو رکات نوێژیان کرد بە جەماعەت یان بە تەنیا یەکی دوو رکاتیان کرد ئەوا ناویان لە ناو ریزی ئەوانەدا دەنوسرێت کە هەمیشە و بەردەوام زیکر و یادی خوا دەکەن.

عەمری کوڕی عەنبەسە رەزای خوای لێ بێ فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوو دەیفەرموو: (أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الرَّبُّ مِنْ الْعَبْدِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ الْآخِرِ، فَإِنْ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللَّهَ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ)[523]. واتە: نزیکترین کاتێك کە پەروەردگار لە بەندەکەیەوە نزیك بێت لە ناوەڕاستی کۆتایی شەودایە، ئەگەر دەتوانیت لەو کەسانە بیت کە زیکر و یادی خوای گەورە دەکەن لەو کاتەدا ئەوا ببە.

لە ئەبی دەردائەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (ثلاثة يحبهم الله، ويضحك إليهم، ويستبشر بهم: الذي إذا انكشفت فئة قاتل وراءها بنفسه لله عز وجل، فإما أن يقتل وإما أن ينصره الله ويكفيه، فيقول: انظروا إلى عبدي هذا كيف صبر لي بنفسه؟ والذي له امرأة حسنة وفراش لين حسن، فيقوم من الليل فيقول يذر شهوته، ويذكرني، ولو شاء رقد. والذي إذا كان في سفر وكان معه ركب، فسهروا، ثم هجعوا فقام من السحر في ضراء وسراء)[524]. واتە: سێ کەس خوا خۆشی دەوێن و بەدەمیانەوە پێدەکەنێ و شادمان دەبێ پێیان و مژدەیان دەداتێ: کەسێك ئەگەر کۆمەڵێك لە جەنگاوەرە باوەڕدارەکان لە پێناوی خوادا جیهاد بکەن ئەم لەدوایانەوە بجەنگێ و گیانی خۆی بەخت بکات بۆ خوا، جا یان دەکوژرێ یا خوا سەری دەخات و یارمەتیدەری دەبێت، جا دەفەرموێت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن چۆن ئارامی کرت بۆ من، وە کەسێك ژنێکی جوان و جێگای نەرم و گەرمی هەبێت ، بەڵام شەو هەستێت شەونوێژ بکات، خوا دەفەرموێت: ئەو بەندەیەم وازی لە ئارەزووەکانی خۆی هێناوە یادی من دەکات ئەگەر ئارەزووی هەبایە رادەکشا، کەسێك لەسەفەردا بێت کۆمەڵێکی لەگەڵدا بێت، پاش حەوانەوە ئەوان رادەکشێن و دەخەون، ئەم هەڵئەسێ شەونوێژ دەکات، لە سەحەردا لە خۆشی و ناخۆشیدا.

[523]– رواه الترمذي وابن خزيمة – صحيح الترغيب و الترهيب: (٦٢٤).

[524]– حسن رواه الطبراني في الكبير – صحيح الترغيب والترهيب: (٦٢٥).

له (عبدالله)ی کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (مَنْ قام بِعَشْرِ آيَاتٍ، لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الغَافِلِينَ، وَمَن قامَ بِمَائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ القانِتِين، وَمَن قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ المُقَنطرين)[525]. واتە: هەرکەسێك لەشەودا دە ئایەت بخوێنێ ئەوە ناوی تۆمار ناکرێ لە ڕیزی بێ ئاگاو لە خوا غافڵەکان، ئەگەر کەسێ سەد ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ڕیزی ئەو کەسانە دەنوسرێت کە لە فەرمان بەرداری خوای گەورە دەرناچن و لە شەو نوێژدا زۆر بەپێوە ڕادەوەستن، ئەگەر کەسێ هەزار ئایەت بخوێنێ ئەوا ناوی لە ڕیزی ئەوانەدا تۆمار دەکرێ کە بەقەد دنیاو ئەوەشی لە ناویدایە خێریان بۆ نوسراوە.

**٢- شەونوێژکردنی زۆر و پاشان وازهێنان لێی بەیەکجاری:**

هەندێ کەس کتوپڕ ڕوودەکەنە شەونوێژ، هەموو شەوێ هەتا بەیانی بەردەوام دەبن لەسەری بۆ هەفتەیەك یان مانگێك یا زیاتر پاشان بە یەکجاری وازی لێ دەهێنن.. ئەمەش هەمووی هەڵەیە.

ڕاستیەکەی ئەوەیە ئینسان کەمێك لەشەو هەڵبژێرێ بۆ شەونوێژ بەپێی توانای خۆی و بەردەوام بێت لەسەری چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ)[526]. واتە: چاکترین کاروکردەوە لای خوای گەورە بەردەوام ترینیانە لەسەری با کەمیش بێت.

**٣- زیادەڕەوی لە شەونوێژکردن و وازهێنان لەنوێژی بەیانی:**

هەندێ لە نوێژخوێنان دەبینین یەکێك لەوان زیادەڕەوی دەکات هەتا پێش نوێژی بەیانی شەو نوێژ دەکات پاشان دەخەوێتەوە نوێژە فەرزەکەی ناکات یان جەستەی بێ هێز دەبێ و توانای کارکردنی نامێنێ بژێوی بۆ خۆی و خێزانەکەی دابین بکات... بەڵکو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هۆشیاری داوە بەو کەسەی کە بەدەم خەوەوە نوێژ دەکات، دەفەرموێت:

---

[525]– رواه أبو داود وابن خزيمة – صحيح الترغيب والترهيب: (٦٣٥).

[526]– مُتَّفَقٌ عَلَيهِ عن أبو هريرة – صحيح الجامع: (١٦٣).

(إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَا يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ) ٥٢٧. واته: ئەگەر یەکێك لە ئێوە نوێژی دەکرد لەو کاتەدا خەوی دەهات ئەوا با راکشێ و بخەوێ، تا خەوەکەی دەڕوات، چونکە ئەگەر کەسێك لە ئێوە بەدەم خەوەوە وەنەوز بدات و نوێژ بکات رەنگە بیەوێت بپاڕێتەوە بۆ خۆی کەچی جنێو بەخۆی بدات.

لە ریوایەتێکی تردا بەم شێوەیە هاتووە: (إذا نَعَس أحدكم وهو يصلي فَلْيَنْصَرِفْ ، فلعله يدعو على نفسه وهو لا يدري)٥٢٨. واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە وەنەوز بدات و نوێژ بکات با بخەوێ، تا خەوەکەی دەڕوات، چونکە رەنگە بیەوێت بپاڕێتەوە بۆ خۆی بەخۆی نەزانێ دوعا لە خۆی بکات.

عیلەتێکی تری هەیە ئەویش ئەوەیە ئینسان مافی خێزانەکەی جێبەجێ ناکات، هەروەها پاش ماوەیەك توانای نامێنێ و هەست بە بێزاری دەکات واز لە شەونوێژ دێنێ و پاشان واز لەنوێژی بەیانیش دەهێنێ بە جەماعەت، لەبەر ئەوەیە کە خۆشەویست صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (عَلَيْكُمْ هَدْيًا قَاصِدًا فَإِنَّهُ مَنْ يُشَادَّ هَذَا الدِّينَ يَغْلِبْهُ)٥٢٩. واتە: هۆشیاربن رێگایەکی هاوسەنگ و ئاسان بگرن بۆ دینداری زیادەڕوی تێدا مەکەن، چونکە هەرگیز نەبووە یەکێ دین لەسەر خۆی گران بکات بەتوندی باوەشی پێدا بکات تاسەر بیباتەسەر، بەڵکو لە ئەنجامدا دین بەزاندوونی و کۆڵی پێداون.

---

527– رواه مالك والبخاري ومسلم وأبو داود والترمذي وابن ماجة والنسائي.

528– صحيح الترغيب والترهيب للألباني: (٦٣٧).

529– رواه أحمد والحاكم والبيهقي عن بريدة – صحيح الجامع: (٤٠٨٦).

# سەرپێچییەکان لە نوێژی تەراویحدا

### ١- وازهێنان لە نوێژی تەراویح:

ئەم مانگە پیرۆز و گەورەیە دەستکەوتێکە بۆ هەر موسڵمانێك کە دەیەوێت خۆی لە ئاگری دۆزەخ رزگار بکات، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم موسڵمانانی هانداوە بۆ تەراویح کردن و هەستان بۆ شەونوێژ لەم مانگەدا، دەفەرموێت: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ)[٥٣٠] واتە: هەر کەسێك شەوانی رەمەزان بە ئیمانەوە شەو نوێژ و تەراویح بکات چاوەڕێی پاداشت بێت، خوای گەورە لە گوناهی رابردووی خۆش دەبێت.

کەچی دەبینین هەندێ کەس تەرکی نوێژی تەراویح دەکەن خۆیان لەو خێرە گەورەیە بێبەش دەکەن بۆ سەیرکردنی شانۆ و زنجیرە دراما تەلەفزیۆنیەکان و نادیەکان و ئەو شوێنانەی گۆرانی و ئاهەنگیان تێدا دەگێڕن یان خۆیان بەشتی بێ هودەوە خەریك دەکەن... (ولاحول ولا قوة إلا بالله)، ئەمانەش هەموویان لەبەر ئەوەیە بیروباوەڕیان وایە کە مانگی رەمەزان مانای ئەوەیە تەنها خۆیان بەدووربگرن لە خواردن و خواردنەوە لە رۆژەکەیدا، شەوەکەشی بۆ رابواردن و گوناهکردن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إن لله تبارك وتعالى عتقاء في كل يوم وليلة – يعني في رمضان – وإن لكل مسلم في كل يوم وليلة دعوة مستجابة)[٥٣١] واتە: خوای گەورە و پەروەردگار لەهەموو شەو و رۆژێکی مانگی رەمەزاندا خەڵکان رزگار دەکات لە ئاگری دۆزەخ، وە لە هەموو شەو و رۆژێکدا بۆ هەموو موسڵمانێك دوعایەك گیرا دەکات.

ئایا ئەمە دەستکەوت نیە بۆ موسڵمان ئەگەر شەوی رەمەزان لە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری خوای بەخشندەی میهرەبان بباتەسەر بەوەش لە ئاگری دۆزەخ رزگار ببێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنێت بە رۆح و رەیحان بۆ بەبەرزاییەکانی بەهەشتی بەرین و جوان.

---

[530]- مُتَّفَقٌ عَلَيهِ عن أبو هريرة – صحيح الجامع: (٦٤٤٠).

[531]- صحيح لغيره رواه البزار عن أبي سعيد الخدري – صحيح الترغيب والترهيب: (٩٩٢).

**٢- له نوێژدا قورئان خوێندن له مهصحهفدا که پێویست نهبێ:**

دهبینین ههندێ له نوێژخوێنان له نوێژی تهراویحدا مهصحهفهکه له بهردهستیاندا دادهنێن و دهیخوێننهوه شوێن پێشنوێژ دهکهون... ئهمهش یهکێکه له سهرپێچیهکان- چونکه خشوع ناهێڵێ- مهگهر لهبهر پێویستی وهك ئهوهی مهئموم لهپشت سهر پێشنوێژهوه له مهصحهفهکهدا سهری ئایهتهکان دهرخات بۆ پێشنوێژ ئهم کارهش دروسته.

**٣- پهلهکردن له نوێژی تهراویحدا:**

ئهمهش یهکێکه له سهرپێچیه باوهکانی ناو زۆربهی مزگهوتهکان، بهوه کهمتهرخهمی دهکهن له روکنێ له روکنهکانی نوێژدا که ئهویش خشوع و دڵنیایی و ئارامیه که بهوه نهبێت نوێژ تهواونیه، بهڵکو دهبێته هۆی ماندووکردنی ئهوانهی لهدوایهوه نوێژ دهکهن له نهخۆش و بهساڵاچووان.

شێخ (علي محفوظ) دهڵێ: لهوهش خراپتر پێشنوێژ له نهزانی خۆیهوه و خهڵکیش له تهماڵی خۆیانهوه زیادهڕهوی دهکهن له کورتکردنهوهی نوێژی تهراویحدا، لهم حاڵهتهدا نوێژکردن بهتهنیا چاکتره له جهماعهت، بهڵکو ئهگهر مهئموم بزانێت پێشنوێژ ههندێ له روکنهکان تهواو ناکات ئهوه ههرگیز دروست نیه لهدوایهوه نوێژ بکات[٥٣٢].

---

532- الأبداع: (ص:٢٨٦) .

### ٤- بیروباوەڕ بە دیاریکردن و خوێندنی جوزئێ هەموو شەوێ:

ئەمەش هیچ بەڵگەیەکی سوننەتی لەسەر نیە ... سوپاس بۆ خوا ئەم کارە فراوانی تێدا هەیە.

لە ئەبو عوسمانی نەهدیەوە هاتووە دەڵێ: عومەری کوڕی خەتاب ڕەزای خوای لێ بێ سێ قورئان خوێنی بانگ کرد کە قورئانیان لەبەر بوو قورئانی پێ خوێندن، جا ئەوەیان خێرا بوو فەرمانی پێکرد کە سی ئایەت بۆ خەڵك بخوێنێ، فەرمانی کرد بە ناوەندیەکەیان بیست و پێنج ئایەت بخوێنێ، فەرمانی کرد بە وەشیان لەسەرخۆ بوو لە ڕەمەزاندا بیست ئایەت بخوێنێ[533]. ئەم کارە فراوانی تێدا هەیە پێشنوێژ دەتوانێت ئەوەندە بخوێنێ نەبێتە هۆی بێزاربوونی خەڵك لەگەڵ چاودێری سوننەت و ئادابەکاندا.

بەڵام چاکتر وایە لە مانگی ڕەمەزاندا هەر شەوەی جوزئێ لە سی جوزئەکە بخوێنێرێ، لەبەر تەمەڵی خەڵك وازی لێ نەهێنرێ، (كمال الدين)ی کوڕی (همام) دەڵێ: وتەی: لەبەر تەمەڵی خەڵك وازی لێ نەهێنرێ، دڵنیاکردنەوەیە بۆ خەتم کردنی قورئان وە بێگومان ئەوە ئاسان کردنە لەسەر خەڵك نەك قورسکردن و درێژەپێدان هەروەك لە (النهاية)دا بەئاشکرا ڕایگەیاندووە، ئەگەر پێشنوێژی مزگەوت نەیتوانی لە مانگی ڕەمەزاندا خەتمێکی قورئان بکات با بیسپێرێ بەکەسێکی تر[534].

### خوێندنی زیکری داهێنراو لە نێوان هەموو دوو ڕکاتێکدا:

خوێندنی زیکری داهێنراو لە نێوان هەموو دوو ڕکاتێکدا لەناو زۆربەی نوێژخوێناندا بڵاوبۆتەوە " لەوانە" وتەی بانگبێژەکان: (الصلاه والسلام عليك يا أول خلق الله)، دەنگ بەرزکردنەوە لەدوای هەموو دوو ڕکاتێکی نوێژی تەراویح وەك: (صلاة قيام أثابكم الله، والصلاة يرحمكم الله) ، (لا اله إلا الله) لەدوای هەموو حەوانەوەیەك، لەیەکەمدا ڕەزاو ڕەحمەت لەسەر ئەبوبەکری صدیق وە لە دووهەمدا لە عومەری، لە سێهەمدا لە عوسمان، لە چوارەمدا لەسەر عەلی ڕەزای خوایان لێ بێ.

---

533– رواه البيهقي في السنن: (٢/٤٩٧)..

534– فتح القدير: (ص:١/٣٣٥) قيام الليل .

(هەموو ئەمانە) هیچ بنەمایەکیان نیە لە شەرع و سوننەتدا، بەڵکو تەشویشە لەناو ماڵەکانی خوادا و تێکدانی عیبادەتی خواپەرستانە (با نەڵێن) سلاّواتدانە لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم و رەزاو رەحمەتە لەسەر هاوەڵان، چونکە ئەمە شەرعیە لەبەر ئاگادارکردنی خەڵك لە پلەوپایەیان و فەزڵ و چاکەیان، بەڵام (ئێمە دەڵێین) ئەوەی دەیکەن لەبەر ئەوەی لایان وایە شتێکی چاکە و سوننەتە لە نوێژی تەراویحدا، کارێکی داهێنراوە و هیچ سەنەدێکە لەسەر نیە، بیدعەیە و لە شەیتانەوەیە.

(ابن الحاج) دەڵێ: پێویستە لەسەر پێشنوێژ خۆی بەدوور بگرێت لەو بیدعانەی لە نێوان هەموو دوو رکاتێکی نوێژی تەراویحدا دەکرێن، ئەوانەی دەنگیان بەرزدەکەنەوە و بەیەك دەنگی دەیلێنەوە، ئەمانە هەموویان بیدعەن، هەروەها با پێشنوێژ پێش بگرێت لە وتەی بانگبێژەکان: (الصلاه یرحمکم الله) ئەمەش هەر بیدعەیە. داهێنان لە دیندا قەدەغەیە، چاکترین رێنمایی پێغەمبەری سەیدمانە صلی الله علیە وسلم پاشان خەلیفە راشیدینەکان پاشان هاوەڵان، زانایانی سەلەف نەکردوویانە وە نەباسیشیان کردووە بەسە بۆمان ئەوە بکەین کە ئەوان کردوویانە[٥٣٥].

---

535– المدخل: (ص:٢/١٤٥) نقلا من الدين الخالص: (١٧١/٥).

## سەرپێچیەکان لە نوێژی چێشتەنگاودا

**١- بیروباوەڕ بەوەی کە هەرکەس وازی لێ بهێنێ کوێر دەبێ و منداڵەکانی دەمرن:**

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: کاتێك شەیتان زانی نوێژی چێشتەنگاو فەزڵێکی گەورەی هەیە، لەناو نەزانەکاندا بڵاویکردەوە کە هەر کەسێك نوێژی چێشتەنگاو بکات پاشان وازی لێ بهێنێ با عوزریشی هەبێ کوێر دەبێ و خێزان و منداڵەکانی دەمرن.

ئەمەش لەناو خەڵکدا باوە لە خوا بترسن و بزانن کە: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ۚ إِنَّمَا يَدْعُوا۟ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُوا۟ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ﴾ فاطر: ٦. واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان ئەو (شەیتان) تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری داگیرساوی (دۆزەخ) .

لە ئەبو سەعیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي الضُّحَى حَتَّى نَقُولَ لَا يَدَعُهَا وَيَدَعُهَا حَتَّى نَقُولَ لَا يُصَلِّيهَا). واتە: جاری وا هەبوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ئەوەندە بەردەوام دەبوو لەسەر نوێژی چێشتەنگاو دەمان وت ئیتر وازی لێ ناهێنێ جاری واش هەبوو وازی لێ دەهێنا دەمان وت ئیتر نوێژی چێشتەنگاو ناکات.

فەرمودەی: (من داوم علی صلاة الضحی ولم يقطعها إلا من علة كنت أنا وهو في الجنة في زورق من نور في بحر من نور حتی نزور رب العالمين) فەرمودەیەکی باتڵە چونکە زەکەریای کوڕی زویل کەندی درۆزن گێڕاویەتیەوە[٥٣٦] .

[536]- السنن والمبتدعات: (ص: ١٢٤).

٢- وازهێنان له نوێژی چێشتەنگاو:

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر بێ هیەمەتی و تەمەڵی زۆربەی موسڵمانان، چونکە ئەگەر دەیانزانی چەندە فەزڵ و خێرێکی گەورەی هەیە وازیان لێ نەدەهێنا.

له (أبي ذر)ەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى)[537].

واتە: هەموو رۆژێك گشت جومگە و ئێسکێکی ئادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر هەموو (سبحان الله)یەك چاکەیەکە، هەموو (الحمد لله)یەك چاکەیەکە، هەموو (لا الـه الا الله)یەك چاکەیەکە، هەموو (الله اکبر)ێك خێر و چاکەیەکە، فەرمان بەچاکە خێرێکە، قەدەغەکردنی خراپە چاکەیەکە، دوو رکات نوێژی چێشتەنگاو جێگای هەموو ئەمانە دەگرێتەوە.

هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى الضُّحَى أَرْبَعًا، وَقَبْلَ الْأُولَى أَرْبَعًا بنِيَ لَهُ بِهَا بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ)[538]. واتە: هەرکەسێ چوار رکات نوێژی چێشتەنگاو بکات، پێش ئەویش چور رکاتی کردبێت ماڵێکی لە بەهەشت بۆ دروست دەکرێت.

---

537- أخرجه مسلم عن أبي ذر: (٧٢٠).

538- رواه الطبراني في الأوسط عن أبي موسى - صحيح الجامع: (٦٣٤٠).

## نوێژی تەسبیحات و رای جیاواز لەبارەیەوە

زۆربەی زانایان رەئیان لەسەر ئەوەیە فەرمودەی نوێژی تەسبیحاتیان بە(ضعیف) لاواز داناوە ئەوەش ئێوە و ئەم فەرمودەیە با بزانین شەرع زانان دەربارەی سەنەدەکەی چی دەڵێن:

لە ئیبن عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە عەباسی مامی فەرموو: (يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّاهُ أَلَا أُعْطِيكَ أَلَا أَمْنَحُكَ أَلَا أَحْبُوكَ أَلَا أَفْعَلُ بِكَ عَشْرَ خِصَالٍ إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذَلِكَ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ سِرَّهُ وَعَلَانِيَتَهُ عَشْرَ خِصَالٍ أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً فَإِذَا فَرَغْتَ مِنْ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ قُلْتَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً ثُمَّ تَرْكَعُ فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنْ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَهْوِي سَاجِدًا فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنْ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِي أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ إِنْ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي عُمُرِكَ مَرَّةً)[٥٣٩]. واتە: ئەی عەباس! ئەی مامەگیان دە شتت فێردەکەم ئەگەر ئەنجامیان بدەیت خوای گەورە لە گوناهەکانی رابردوو و داهاتووت خۆش دەبێت، گوناهی کۆن و نوێ، هەڵە و قەستی، گەورە و بچوک، پەنهان و ئاشکرا، دەخەسڵەت: چوار رکات نوێژ بکە لەهەموو رکاتێکدا فاتیحە و سورەتێکی تر بخوێنە کە تەواو بوویت هەر بەپێوە پانزە جار لە دوای فاتیحەوە بڵێ: (سُبْحانَ اللهِ وَالحَمْدُ لِلهِ وَلا إلَهَ إلا اللهُ واللهُ أكبَر)، پاشان رکوع بەرەو دەجاری تر بیانڵێ، پاشان راست بەرەوە لە رکوع و دەجاری تر بیانڵێرەوە، ئینجا سەجدە بەرەو دەجاری کە بیان خوێنە، هەستەرەوە لەسەجدە لە نێوان دانیشتنی دوو سەجدەکەشدا دەجاری تر بیانڵێ، پاشان بچۆرەوە سەجدە و دەجاری تریش بیان خوێنە پاشان لە سەجدە سەر بەرزکەرەوە و دەجاری کەش بیان خوێنە، ئەمەش دەکاتە هەفتاو پێنج جار لەهەر رکاتێکدا، هەر چوار رکاتەکە بەو شێوەیە بکە، ئەگەر ئەتوانی هەموو رۆژێ یەك جار ئەو نوێژە بکە، ئەگەر ناتوانی هەفتەی جارێك، ئەگەر نەتتوانی مانگی جارێ، ئەگەر هەر نەتتوانی ساڵی جارێ ئەگەر هەر بۆت نەکرا لە هەموو تەمەنتدا جارێك ئەو نوێژە بکە.

---

[539]- رواه أبو داود ابن ماجه- صحيح الترغيب والترهيب: (٦٧٧).

ئیبن خزیمە دەڵێ: ئەگەر ئەم هەواڵە راست بێت، چونکە لەناو ئەم سەنەدەدا شتێك هەیە، باسی دەکات و پاشان دەڵێ: ئیبراهیمی کوڕی حەکەمی کوڕی ئەبان لە باوکیەوە بە (مرسل)ی ریوایەتی کردووە و باسی ئیبن عەباسی نەکردووە.

(حافظ) دەڵێ: (طبرانـي) ریوایەتی کردووە و لە کۆتاییدا وتویەتی: (ئەگەر گوناهو تاوانەکانت وەك کەفی دەریا یان بەقەدەر ژمارەی زیخ و چەو و لم بێت خوای گەورە لێت خۆش دەبێ).

(حافظ المنذري) دەڵێ: ئەم فەرموودە لە زۆر رێگاوە ریوایەت کراوە، هەروەها لە کۆمەڵێ لە هاوەڵانەوە، وە چاکترین رێگایان ئەم فەرمودەی عیکریمەیە، وە کۆمەڵێك لە زانایان بە صەحیحیان داناوە لەوانە: (الحافظ أبو بكر الآجري)و مامۆستامان (أبو محمد عبد الرحيم المصري)و مامۆستامان (حافظ أبو الحسن المقدسي)، وە (أبو بكر بن أبي داود) دەڵێ: بیستم لە باوکم دەیفەرموو: دەربارەی نوێژی تەسبیحات هیچ فەرمودەیەکی (صحیح) بێجگە لەم فەرمودە نەهاتووە.

(مسلم کوڕی الحجاج) دەڵێ: لە ریوایەتی ئەم فەرمودەیەدا هیچ سەنەدێك لەمە چاکتر نەهاتووە. واتە سەنەدی فەرمودەکەی عیکریمە لە ئیبن عەباسەوە.

ئیبن موبارەك و جگە لەویش لە زانایان رەغبەتیان لەسەر نوێژی تەسبیحاتە، باسی فەزڵ و گەورەییان کردووە [540].

دەڵێم: بێگومان ئەم فەرمودە شێخ ئەلبانی بە صەحیحی داناوە لە: (صحيح الجامع: ٧٩٣٧ - ٧٩٥٥) ، والمشكاة: ١٣٢٨- ١٣٢٩) وصحيح سنن أبـي داود: ١١٧٣- ١١٧٥) و صحيح الترغيب والترهيب: ٦٧٨)دا.

(إن شاءالله) ئەم فەرمودە (صحیح)ە... داواکارین لە خوای گەورە هەموومان عاقیبەت خێر بکات.

---

540- صحيح الترغيب والترهيب للألباني: (ص: ٢٨٢ - ٢٨٣).

# سەرپێچیەکان لەنوێژی ئیستیخارەدا

**١- تەرکی نوێژی (الإستخارة):**

زۆر لە موسڵمانان خێر و قەدری نوێژی ئیستیخارە نازانن... بەندە زەلیلی و بێ دەسەلآتی خۆی بۆ پەروەردگاری رادەگەیەنێت، بەندە لە هەموو هێز و دەسەلآتێك خۆی دادەماڵێت تەنها هێز و دەسەلآتی پەروەردگاری نەبێت هەر ئەو بە پشتیوانی خۆی دەزانێت.

سوننەتە هەر کاتێك موسڵمان ویستی کارێکی گرنگ بکات دوو رکات نوێژی ئیستیخارە بکات، لە خوای گەورە بپاڕێتەوە کە رێگای راستی لەوکارەدا نیشان بدات، بۆ خێری دین و ژین و سەرەنجامی دواڕۆژی، هەروەها دووری بخاتەوە لە خراپەکانی دنیاو دواڕۆژ و هەرشتێ زیانی بۆ دینەکەی هەبێت، ئەم نوێژە فەزڵێکی زۆری هەیە، ملکەچی و زەلیلی نواندنە بۆ خوا، بەڵام بەداخەوە زۆر لە موسڵمانان لایان وایە نابێت بۆ هەموو کارێك ئەم نوێژە بکرێت بۆیە فەرامۆشیان کردووە..

پێشەوا بوخاری لە جابری کوڕی (عبداللە)وە دەگێڕێتەوەو دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لەهەموو کاروبارێکدا فێری نوێژی ئیستیخارەی دەکردین وەك چۆن فێری سورەتێکی قورئانی دەکردین دەیفەرموو: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە ویستی کارێکی گرنگ بکات دوو رکات نوێژی سوننەت بکات پاشان بڵێ: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ هَذَا الْأَمْرَ "فَيُسَمِّيهِ مَا كَانَ مِنْ شَيْءٍ " خَيْرًا لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ خَيْرًا لِي فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي وَبَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنتَ تَعْلَمُ إنَّ هَذا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعاشي وَعَاقِبَةَ أَمْرِي، وَ عَاجِلُهُ وَ آجِلُهُ، فَأصْرِفْهُ عَنّي وَأَصْرِفْني عَنْهُ، وَأَقْدِر لى الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ رَضِني بِهِ)[٥٤١].

[541]- أخرجه البخاري: (٣/ ٤٠) والترمذي: (٤٨٠) و أبو داود: (١٥٣٨).

واتە: خوایە من داوای خێر دەکەم لە عیلمی تۆ و داوای هێز و توانایی دەکەم لە هێز و توانایی تۆ، وە داوای فەزڵ و گەورەیی خۆتت لێ دەکەم، بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم، تۆ دەزانی و من نازانم، تۆ زانای هەموو شاراوەو نادیارەکانی، خوایە تۆ دەزانی ئەگەر ئەم ئیشە[542]. قازانجی دین و دنیاو کۆتایی تێدایە بۆمی هەڵسوڕێنەو ئاسانی بکە بۆم و بەرەکەتی خۆتی تێبخە، وە ئەگەر خراپە بۆم بۆ دین و دنیاو کۆتایم لێمی دووربخەرەوە و وام لێ بکە وازی لێ بهێنم، خێر و چاکەم بۆ هەڵسوڕێنەو رازیم بکە لەسەری.

**٢- بیروباوەڕ بەخەوبینین لەدوای نوێژی ئیستیخارە:**

ئەمەش هەڵەیە، لەوانەیە هەندێ جار خاوەنەکەی خەوی پێوە ببینێ بەڵام ئەوە مەرج نیە بۆ نوێژی ئیستیخارە.. خەوبینین هیچ لە قەدەری خوا ناگۆڕێت، خوای پەروەردگار خۆی دەزانێ چی چاکە بۆ ژیانی دنیاو قیامەتی بەندەکەی، بەندە ئەوەی لەسەرە ئەو نوێژە بکات و بپاڕێتەوەو خۆی تەسلیمی پەروەردگاری بکات، پاشان خوای گەورە ویستی لەسەر چی بێت ئەوەی بۆ دەکات.

**٣- نەزانین بەوەی کە ئیستیخارە دەبێت بۆ هەموو شتێ بکرێت:**

هەندێ لە نوێژخوێنان باوەڕیان وایە نوێژی ئیستیخارە دەبێت تەنها بۆ شتانێك بکرێت کە مرۆڤ دوودڵە تێیدا هیچ لەبارەیەوە نازانێت.. ئەمەش هەڵەیە چونکە دەبێت ئیستیخارە بۆ هەموو شتێ بکرێت وەك پێشتر لە فەرمودەکەدا باسکرا. بێگومان هەندێ جار مرۆڤ دڵنیایە لە شتێك کەچی تیاچونی لەو شتەدایە یان لە شتێك دەترسێت کەچی سەرکەوتن و رزگاری لەو شتەدایە، خوای گەورە لەوبارەوە دەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦﴾ البقرة: ٢١٦. واتە: دەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باش بێت بۆتان، وە دەگونجێ شتێکتان پێ خۆش بێت و خراپ بێت بۆتان، وە خوا (چاك و خراپی ئێوە) دەزانێت و ئێوە نایزانن.

---

[542]– لێرەدا ناوی مەبەستەکەی خۆی بنات.

٤- داهێنان له نوێژی ئیستیخارەدا:

نوێژی ئیستیخاره کارێکی ئاشکرایه پێویستی بە درێژەپێدان و رونکردنەوه نیه، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین خەڵکانێ لە خۆمان لادەدەن لە چۆنیەتی ئەو نوێژەدا، نوێژەکە لادەبەن و بە دەنکە تەسبیح یان مورووە سپیەکان وەکو کوژەکەو کەلانەو هتد ئیستیخاره دەکەن.

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: بەداخەوه پشت دەکەنە ئەم زانیاریە جوان و ئاسانه ئاسمانیه سەماوی و پەنا دەبەن بۆ ئەنجامدانی تیروپشك کە خوای گەورە بە لەفەرمان دەرچوون ناوی بردووه لەم ئایەتەدا: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ۗ ③﴾المائدة: ٣. واتە: داواکردنی بەش بەخت(و نیازگرتنەوە) بە تیروپشك (ئەنجامدانی) ئەمانە هەمووی لەفەرمان دەرچوونە.

مانای وایە داوای رزق و رۆزی و جگە لەویش دەکەن، نیازگرتنەوە بە تیروپشك سێ جۆری هەیە (یەکەم) لێی نوسراوە ئەو کارە بکە. (دووهەم): ئەو کارە مەکە. (سێهەم): هیچ شتێکی لەسەر نەنوسراوە. ئەگەر کەسێ ویستی کارێك بکات دەست دەکات بەناویدا وەك یەك وان یەکێکیان دەردەهێنێت ئەگەر یەکەم بوو ئەوا بە عەزمەوە کارەکەی دەکات، ئەگەر دووهەم بوو وازی لێ دەهێنێت، ئەگەر سێهەم بوو دووبارەی دەکاتەوە، خوای گەورە بە لەفەرمان دەرچوون ناوی بردووه، چونکە رووەکاتە بانگەشە (ئیدعای) زانیاری نادیار(غەیب) و، کاری کاهین و فاڵچیەکانە.

هەندێ جار دەبینین دەچن بۆلای فاڵچیەکان و ئەوانەی موورو تەسبیح دەگرنەوە ئیستیخارە دەکەن لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەبارەیانەوە دەفەرموێت: (مَنْ أَتَى كَاهِنًا أَوْ عَرَّافًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٥٤٣]. واتە: هەرکەس بچێتە لای کاهین یان فاڵچیەك باوەڕی هەبێت بەوەی دەیڵێ ئەوە کافر بووە بەوەی کە بۆ موحەمەد صلی الله علیه وسلم هاتووە و دابەزیوه. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە، کە وتویەتی: (مَنْ أَتَى عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً)[٥٤٤].

---

543– رواه أحمد والحاكم وحسنه في جامع الصغير.

544– رواه أحمد ومسلم كما في الجامع.

واتە: هەرکەس بچێتە لای فاڵچیەك پرسیاری شتێکی لێ بکات چل ڕۆژ نوێژی لێ وەرناگیرێت.

هەندێ جار دەبینی بە دەنکە تەسبیح ئیستیخارە دەکەن و هەر دەنکێك یان موورویەك ناودەنێن، بەم شێوازە: دەنکێك ناو لێ دەنێن (الله) ، ئەوی تر (محمد) ، ئەوی تر (عەلی) ، ئەوی تر (أبو جهل) بەم شێوازە دەنکە تەسبیحەکان دەبژێرن و پیا دەڕۆن تاکو کۆتایی تەسبیحێکی سەدو یەك دانەیی، گرنگ دانەی کۆتاییە واتە دانەی سەدو یەکە، ئەگەر (الله)، یان (محمد)، یا (عەلی) هاتنەوا ئیشەکە دەکەن، بەڵام ئەگەر (أبو جهل) یان (سەگ) هات نایکەن و دەڵێن: ئیستیخارەمان کرد و خراپ هات، ئەمەش بیدعەتی شیعەکانەو کەوتۆتەناو هەندێ لە سۆفی و دەروێشەکانەوە[545]، پاك و بێگەردی بۆ خوا چەندە بێ ئەقڵ و نەزان و گێلن، شتانی خێر و چاکە دەگۆڕنەوە بەشتی سوك و ریسوا[546].

## ٥- خوێندنی پاڕانەوەی ئیستیخارە لە تەحیاتدا:

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان پاڕانەوەی ئیستیخارە ڕاستەوخۆ لەدوای تەحیات و پێش سەلام دانەوە دەیخوێنن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم چونکە دەفەرموێت: (إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ، ثُمَّ لِيَقُلِ...). واتە: هەر کاتێ یەکێك لە ئێوە ویستی کارێکی گرنگ بکات دوو رکات نوێژی سوننەت بکات پاشان بڵێ..

واتە دەبێت پاڕانەوەی ئیستیخارە لەدوای سەلام دانەوە بکرێت، دەست بەرزبکرێتەوە بۆ ئاسمان روو بە قیبلە لە پێشەوە بە سوپاس و ستایش و سڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەست پێ بکات... ئەمانەش هەموو لە ئادابی پاڕانەوەن.

---

545- عبدالرحمن حسین بور.

546 – السنن والمبتدعات: (ص: ١٢٣).

حیکمەت لە پێش خستنی نوێژەکە بەسەر دوعاکەدا ئەوەیە کە نوێژی ئیستیخارە کۆکردنەوەی خێر و چاکەی دنیاو قیامەتەواتە هەم نوێژکردنەو هەم داواکاری دونیاییە، پێویستی بە لێدانی دەرگای پاشای خاوەن دەسەلاتە، هیچ شتێك سەرکەوتوو تر نیە لەو نوێژە، چونکە خۆیەکەم زانین نیشاندانە لەهەموو کات و حالەتێکدا، بە گەورەگرتن و سوپاس و ستایشی خوای گەورەی تێدایە[٥٤٧].

٦- دووبارەکردنەوە نوێژی ئیستیخارە حەوت جار:

لای هەندێ لە نوێژخوێنان وا چاکە نوێژی ئیستیخارە حەوت جار دووبارە بکرێتەوە، ئەم فەرمودە لاوازەیان کردووە بە بەڵگە کە لە ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (إِذَا هَمَمْت بِأَمْرٍ فَاسْتَخِرْ رَبّك سَبْعَ مَرات) . واتە: ئەگەر ویستت کارێك بکەی حەوت جار نوێژی ئیستیخارە بکە.

پێشەوا نەوەوی لە کتێبی (الأذکار)دا دەڵێ: سەنەدەکەی غەریبە، چونکە کەسانی وای تێدایە نەناسراون.

(حافظ العراقي) دەڵێ: هەموویان ناسراون بەلام هەیانە ناسراون بە لاوازی زۆر وەك ئیبراهیمی کوڕی (براء) [٥٤٨].

(ابن عدي) دەڵێ: زۆر لاوازە چونکە فەرمودەی بەتاڵی زۆری گێڕاوەتەوە.

(عقيلي) دەڵێ: لەوانەی کە خاوەن متمانەن فەرمودەی بەتاڵی لێ گێڕاونەتەوە[٥٤٩].

---

547 – الدين الخالص: (٥/ ٢٤١).

548 – نيل الأوطار: (٣/ ٣٥٥).

549 – الميزان: (١/ ٢١) نقلا من أخطاء المصلين (ص: ١٨٠).

# سەرپێچیەکان لەنوێژە بارانەدا

**١- وازهێنان لە نوێژە بارانە لەکاتی پێویستدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لە سەرپێچیە باوەکانی ناو موسڵمانان..... بەڵگەیە لەسەر کەمتەرخەمی زۆری مرۆڤ لە بەندایەتی کردن بۆ پەروەردگاری.

پێویستە لەسەر موسڵمانان لەکاتی وشکەساڵی و بێ بارانیدا، یان لەکاتی بێ ئاویدا تەوبە بکەن و لە تاوانەکان بگەڕێنەوەو کۆببنەوە و دوو رکات نوێژە بارانە بکەن و بپاڕێنەوە لە پەروەردگار بارانی رەحمەتیان بۆ ببارێنێ و رزگاریان بکات لە وشکە ساڵی، هۆی وشکە ساڵی و بێ بارانی زۆری گوناهو تاوانە وەك چۆن گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری نیشانەی فەرو بەرەکەتە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٦﴾﴾ الأعراف: ٩٦. واتە: ئەگەر دانیشتوانی شارەکان باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە (لە قەدەغەکراوەکانی خوا) بەڕاستی دەرگای بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە بەڵام بڕوایان نەهێنا (بە پێغەمبەرەکەیان) ئینجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان بەهۆی ئەوەی کە کردیان.

بێگومان سابت بووە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نوێژە بارانەی کردووە، لە (عبدالله)ی کوڕی زەیدەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِلَى الْمُصَلَّى فَاسْتَسْقَى وَحَوَّلَ رِدَاءَهُ حِينَ اسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، صَلَّى رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ)[550]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەرچوو بۆ جێگای نوێژەکەی رووی کردە قیبلەو عەباکەی بە هەڵەوگەڕاوەیی لەبەرکرد و دوو رکات نوێژی بۆکردن بەدەنگی بەرز.

لە ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (خرج نبي الله صلى الله عليه وآله وسلم يوما يستسقي فصلى بنا ركعتين بلا أذان ولا إقامة ثم خطبنا ودعا الله عز و جل وحول وجهه نحو القبلة رافعا يديه ثم قلب رداءه فجعل الأيمن على الأيسر والأيسر على الأيمن)[551].

---

550 – أخرجه البخاري: (١/٢٦١) ومسلم: (٣/٢٣).

551 – أخرجه البخاري: (٢/ ٤٢٧) ومسلم: (٨٩٤).

واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕۆژێ چووەدەر بۆ نوێژە بارانە دوو ركات نوێژی بۆ كردین بێ بانگ و قامەت پاشان وتارێكی بۆ داین، ئینجا لە خوای گەورە پاڕایەوە و رووی لە خەڵكەكە وەرگێڕاو رووی كردە قیبلە هەردوو دەستی بەرزكردەوە لە پاشاندا عەباكەی هەڵگێڕایەوە و لای راستی دا بەسەر شانی چەپدا و لای چەپی دا بەسەر شانی راستدا.

لە (عبد الله)ی كوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: (خرج النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ للاستسقاء متذلّلاً متواضعًا متخشّعاً متضرعًا)[552]. واتە: رۆژێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتەدەر بۆ نوێژە بارانە بە ملكەچی و لارەملی و خۆ بەكەم زانی و ترس و خۆ بە موحتاج زانین.

**٢- دیاریكردنی سورەت بۆ خوێندن:**

شێخ ئەلبانی دەربارەی حوكمی خوێندنی فاتیحە بەدەنگی بەرز لە نوێژە بارانەدا و دیاریكردنی سورەتی (الأعلى والغاشية) بۆ خوێندن دەڵێ: ئەمما خوێندنی بەدەنگی بەرز صەحیح و سابتە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم لە فەرمودەی (عبدالله)ی كوڕی زید)ەوە كە باسكراوە لە كتێبەكەدا، وە هەروەها لە (الإرواء: ٣ / ١٣٣)دا تەخریج كراوە، ئەمما دیاریكردنی ئەو دوو سورەتە باسكراوە صەحیح نیە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم لەبەرئەوەی لەسەنەدەكەیدا (محمد كوڕی عبد العزیز كوڕی عمر الزهري) تێدایە،ئەویش زۆر (ضعیف) لاوازە، بڕوانە (تلخیص المستدرك)ی (ذهبي) و (نصب الراية)ی (زيلعي) و (إرواء الغليل: ٣ / ١٣٤) و (الضعيفة: ٥٦٣١).

راستی ئەوەیە چی بۆ پێشنوێژ گونجاوەو بۆی دەخوێنرێت با بخوێنرێت پێویست بە دیاریكردنی هیچ سورەتێك ناكات[553].

---

552 – رواه أبو داود: (١١٦٥) والترمذي: (٥٥٨) باسناد حسن.

553 – تمام المنة: (ص: ٢٦٤).

٣- وتەی: لەبەرکردنی عەبا بەهەڵەوگەڕاوەیی وەك پێشنوێژ:

ئەمە سابت نیە... ڕاستیەکەی ئەوەیە لەبەر کردنی کەوا بە هەڵەوگەڕاوەیی تایبەتە بە پێشنوێژەوە نەك بەوانەی لە دوایەوە نوێژ دەکەن.

شێخ ئەلبانی دەربارەی ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە دەڵێ: وتەی: (کاتێ وتار کۆتایی هات نوێژخوێنان هەموویان عەباکانیان هەڵدەگێڕنەوە... دەستیان زۆر بەرزدەکەنەوە).

دەڵێم: لێرەدا دوو بابەت هەیە دانەر بەڵگەی لەسەر نەهێناوەتەوە.

**یەکەم:** هەڵگێڕانەوەی عەباکانیان.

**دووهەم:** دەست بەرزکردنەوەیان.

بەڵگە بۆ یەکەم فەرمودەکەی (عبدالله)ی کوڕی زیدە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوام بینی صلی الله علیه وسلم کاتێ نوێژە بارانەی بۆ کردین دوعا کردنەکەی درێژکردەوە و دوعای زۆری دەکرد، پاشان ڕووی وەرچەرخان بەرەو قیبلەو عەباکەی هەڵگێڕایەوە، خەڵکیش لەگەڵیا هەڵیان گێڕایەوە. (أخرجه أحمد بسند قوي). بەڵام باسکردنی هەڵگێڕانەوەی عەباکانی خەڵك (شاذ)ە هەروەك تەحقیقم کردووە لە (سلسلة الأحاديث الضعيفة: ٥٦٢٩)دا.

بەڵگەش لەسەر بابەتی دووهەم فەرمودەکەی ئەنەسە کە هاتووە لە کیتابەکەدا بە ژمارە(٢). لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەردوو دەستی بەرزدەکردەوە و دوعای دەکرد خەڵکەکەش دەستیان بەرزدەکردەوە و دوعایان دەکرد (أخرجه البخاري تعليقا ووصله البيهقي وغيره). ئەوەی تێدا نیە کە خەڵکەکە زیادەڕەویان کردووە لە دەست بەرزکردنەوەدا، بەڵکو ئەوە سابت بووە لە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم خۆیەوە، هەروەك لە فەرمودەی عائیشەدایە لە کتێبەکەداو، فەرمودەکەی ئەنەس لە (الصحيحين)دا، جا من زیادەڕەوی لەدەست بەرزکردنەوەدا بۆ پێشنوێژ دەبینم نەك ئەوانەی لە دوایەوە نوێژ دەکەن[٥٥٤].

---

554 – تمام المنة: (ص: ٢٦٤– ٢٦٥).

## سەرپێچیەکان لە نوێژی خۆرگیراندا

**١- وازهێنان لە نوێژی خۆرگیران:**

زۆربەی خەڵك هیچ لەبارەی نوێژی خۆر گیرانەوە نازانن، بەڵکو ئەوانەی دەیزانن کاری پێ ناکەن، دەبینین زۆربەی خەڵك لەکاتی خۆرگیراندا هەڵە و کاری نابەجێی زۆر دەکەن وازدەهێنن لەوەی کە صەحیحە و لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم سابت بووە.

هەندێ لە خەڵك دەبینین لەکاتی خۆرگیراندا تەپڵ و تەشت و حاجەتەکانی ناوماڵ دێنن لێی دەدەن هوتاف دەکێشن و دەڵێن: «يا بنات الحور سيبوا القمر...». ئەمەش یەکێکە لەو داب و نەریتە داهێنراوانەی کە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە لە سوننەتدا... وازدەهێنن لە نوێژی خۆر گیران.

بە کۆی یەك دەنگی زانایان نوێژی خۆرگیران سوننەتێکی (المؤكدة)یە بۆ پیاوان و ئافرەتان، ئەبو عەوانە دەڵێ: واجبە. بێگومان چاکتر وایە بە جەماعەت بکرێت هەرچەندە بە جەماعەت کردنی مەرج نیە، بانگەوازی بۆ بکرێت و بوترێت: (الصلاة جامعة)[٥٥٥].

جمهوری زانایان لەسەر ئەوەن دوو رکاتە، لەهەر رکاتێکدا دووجار رکوع دەبرێت[٥٥٦].

**٢- سلام دانەوەی مەئموم لەگەڵ پێشنوێژ لەکاتێکدا رکوعی یەکەمی فەوتا بێت:**

لە نوێژی خۆر گیران یان مانگ گیراندا هەندێ لە نوێژخوێنان دوای ئەوەی پێشنوێژ سەری بەرزکردەوە لە رکوعی یەکەم دێنە مزگەوت لەگەڵ پێشنوێژ دەچنە رکوعی دووهەمەوە، پاشان لەگەڵ پێشنوێژ سەلام دەدەنەوە، چونکە نوێژی خۆر گیران و مانگ گیران دوو رکاتە، لەهەر رکاتێکدا دووجار رکوع دەبرێت ئەگەر نوێژخوێن فریای رکوعی یەکەم نەکەوت ئەوە نەگەیشتووە بە رکاتێکدا... بەڵام لە نوێژەکانی تردا لە هەموو رکاتێکدا رکوعێك دەبرێت.

بۆیە پێویستە لەسەر ئەوەی فریای رکوعی یەکەم ناکەوێت لە نوێژی خۆر گیران ومانگ گیراندا دوای ئەوەی پێشنوێژ سەلامی دایەوە هەستێتەوە رکاتێکی تر بکات و دووجا رکوعی تێدا بەرێت.

---

555– أخطاء المصلين: (ص: ١٧٧).

556 – أخرجه البخاري عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: (١٠٦٥).

**٣- دەڵێن: نوێژی خۆرگیران بە دەنگی بەرز یان بە نهێنی وەك یەكە:**

هەندێ لە نوێژخوێنان وادەزانن نوێژی خۆر گیران بە دەنگی بەرز بخوێنرێت یان بە نهێنی وەك یەكە، لەگەڵ ئەوەدا كە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم یەكجار نوێژی خۆرگیرانی كردووە ئەویش بەدەنگی بەرز.

لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: (جَهَرَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي صَلَاةِ الْكسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ فَإِذَا فَرَغَ مِنْ قِرَاءَتِهِ كَبَّرَ فَرَكَعَ) واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە نوێژی خۆرگیرانی بەدەنگی بەرز دەخوێند كاتێ لە خوێندن دەبوویەوە (الله اكبر)ی دەكردوو دەچووە ركوعەوە.

پێشەوا بوخاری لەوبارەوە سەرباسێكی داناوە بەناوی: (بَاب الْجَهْرِ بِالْقِرَاءَةِ فِي الْكُسُوفِ) واتە: باسی قورئان خوێندن بەدەنگی بەرز لە نوێژی خۆر گیراندا.

## سەرپێچییەکان لە نوێژی ترسدا

بیروباوەڕ بەوەی کە لەدوای وەفاتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سوننەت نیە:

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: مەزهەبی زانایان لەسەرئەوەیە نوێژی ترس هەتا ئەمڕۆش سوننەتە هەروەك چۆن لەسەردەمی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم سوننەت بووە، جگە لە ئەبو یەسف و موزنی کە دەڵێن: لەدوای وەفاتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سوننەت نیە. حەسەنی کوڕی زیاد و هەندێ لە هاوەڵانی ئەو وەك (اللؤلؤي) وە هەروەها ئیبراهیمی کوڕی (علية) لەسەر وتەکەی ئەوانن وەك لە (فتح)دا هاتووە. مەفهومی ئەم ئایەتەیی خوای گەورەیان کردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَاةَ ﴿١٠٢﴾﴾ النساء: ١٠٢. واتە: کاتێك تۆ (ئەی موحەممەد صلی الله علیه وسلم لە جەنگدا) لەناو بڕوادارانـدا بوویت و پێش نوێژیت بۆ کردن. جمهوری زانایان وەڵامی ئەمەیان داوەتەوە و دەڵێن: مەرجی بوونی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەناو بڕواداراندا بۆ بەیانی حوکم هاتووە نەك بوون و وجودی خۆی، کەوتە مانای ئایەتەکە ئاوای لێ دێت: بە کردەوەی خۆت بۆیان روون بکەرەوە چونکە کردەوە ئاشکرا تر و روونترە لە گوفتار وەك (ابن العربي)و جگە لەویش دەیڵێن.

پێشەوا (طحاوي) دەڵێ: جارێك (أبو يوسف) وتی: نوێژی ترس مەکەن لەدوای وەفاتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، چونکە لای وابو نوێژکردن لەگەڵ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆ دەستکەوتنی فەزڵی زیاتر بووە. پاشان (طحاوي) دەڵێ: ئەم وتەیە لای ئێمە هیچ نیە. جمهوری زانایان یەك دەنگی هەوەڵانی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە نوێژی ترس لەدوای وەفاتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سوننەتە، وە ئەم فەرمودەی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم: (صَلوا كَمَا رَأيْتُمُونِي أُصَلِّي). واتە: نوێژ بکەن بەو شێوەیەی کە من دەبینن دەیکەم. گشتی بوونی زاراوەی ئەم فەرمودە لەپێشترە تا ئەو تێگەیشتنەکەی ئەمان لە ئایەتەکە[557].

---

[557] – نيل الأوطار: (٣/٣٧٧).

# هەڵەكان لە نوێژی موسافیردا

**١- تەواوكردنی نوێژ لە سەفەردا:**

زۆر لە نوێژخوێنان لە سەفەردا واز لە كورتكردنەوەی نوێژ دەهێنن نوێژەكانیان بەتەواوی ئەنجام دەدەن، واتە چوار ركات دەكەن. ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم چونكە كورتكردنەوەی نوێژ لەوەوە بە سابتی هاتووە.

لە عائیشەوە خێزانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هاتووە، كە وتویەتی: (فُرِضَتْ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَزِيدَ فِي صَلَاةِ الْحَضَرِ)[558]. واتە: نوێژ كە فەرز كرا دوو ركات دوو ركات بوو، لە ماڵ و لە سەفەردا، جا نوێژی سەفەر هەر بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام نوێژی ماڵ زیاد كرا بۆ چوار ركات.

هەروەها لە عائیشەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: (أَوَّلُ مَا فُرِضَتْ الصَّلَاةُ رَكْعَتَيْنِ ، فَأُقِرَّتْ صَلَاةُ السَّفَرِ وَأُتِمَّتْ صَلَاةُ الْحَضَرِ)[559]. واتە: نوێژ یەكەمجار كە فەرز كرا دوو ركات بوو، جا نوێژی سەفەر هەر بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام نوێژی ماڵ بەتەواوی دانرا ، واتە كرا بە چوار ركات.

پێشەوا (زهری) دەڵێ: بە عوروەم وت: بۆچی عائیشە لە سەفەردا نوێژی بە تەواوی دەكرد؟ وتی: ئەویش (تأویل) لێكدانەوەی بۆ دەكرد وەك چۆن پێشەوا عوسمان تەئویلی دەكرد[560].

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: زانایان رایان جیاوازە لەسەر كورتكردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، پێشەوایان شافیعی و مالیكی كوڕی ئەنەس و زۆرینەی زانایان دەڵێن: تەواوكردن و كورتكردنەوە دروستە، بەڵام كورتكردنەوە چاكترە، ئێمەش وتەیەكمان هەیە: بێگومان تەواوكردن چاكترە، لەروویەكەوە هەردووكیان وەك یەكن، بەڵام صحیح و مشهور ئەوەیە كورتكردنەوە چاكترە. پێشەوا ئەبو حەنیفە و زۆر لە زانایان دەڵێن: كورتكردنەوە واجبە، تەواوكردن دروست نیە ئەم فەرمودەیان كردووە بە بەڵگە بۆ خۆیان، و دەڵێن: كورتكردنەوەی نوێژ لە سەفەردا كاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی بووە بە زۆری.

---

558– مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ. رواه البخاري: (٣٥٠) ومسلم: (٦٨٥) واللفظ له.

559– مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ.

560 – اخرجه مسلم: (٦٨٥) كتاب صلاة المسافرين: (٢،١).

وتەی: (وتم بە عوروە بۆچی عائیشە لە سەفەردا نوێژی بە تەواوی دەکرد؟ وتی: ئەویش تەئویلی دەکرد وەك چۆن پێشەوا عوسمان تەئویلی دەکرد) زانایان لەبارەی تەئویلی رایان جیاوازە، لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوەن کە عائیشە و ئیمام عوسمان تەواوکردن و کورتکردنەوەیان بەدروست زانیوە و یەکێك لە دوو دروستەکە واتە کورتکردنەوەیان بەرێوەبردووە[٥٦١].

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کاتێك دەچوو بۆ سەفەر نوێژە چوار رکاتیەکانی کورتدەکردەووە و دەیکردن بە دوو رکات هەتا دەگەڕایەوە بۆ مەدینە، وە هەرگیز سابت نەبووە لە سەفەردا ئەو نوێژە چوار رکاتیانەی بە تەواوی کردبێت، ئەمما فەرمودەکەی عائیشە: (إِنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقْصُرُ فِي السَّفَرِ وَيُتِمّ وَيُفْطِرُ وَيَصُومُ). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سەفەردا نوێژی کورتدەکردەووە و بەتەواویش دەیکرد، رۆژووی دەگرت و جاری واش هەبوو بە رۆژوو نەدەبوو. ئەم فەرمودە صەحیح نیە، لە شیخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیەم بیستووە دەیفەرموو: ئەمە درۆیەو هەڵبەستراوە بەدەم پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم...تەواو.

گێڕدراوەتەوە: (كَانَ يَقْصُرُ وَتُتِمّ). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سەفەردا نوێژی کورت دەکردەووە، عائیشەش چوار رکات نوێژی دەکرد، هەروەها(يُفْطِرُ وَتَصُومُ). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە سەفەردا بە رۆژوو نەدەبوو، بەڵام عائیشە بەرۆژوو دەبوو.واتە عائیشە لە هەدوو حاڵەتەکەدا عەزیمەی وەردەگرت، مامۆستامان ئیبن تەیمیە دەڵێ: ئەمەش باتڵە... چونکە ناگونجێت دایکی ئیمانداران کارێك بکات پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانی بێت، بە پێچەوانەی ئەوانەوە نوێژ بکات، چۆن شتی وەها دەگونجێت لەکاتێکدا خۆی ئەم فەرمودەیەی گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت: خوای گەورە یەکەمجار نوێژی فەرزکرد دوو رکات دەکرا، کاتێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کۆچی کرد بۆ مەدینە نوێژی سەفەر هەر بەو شێوەیە مایەوە، بەڵام نوێژی ماڵ زیاد کرا بۆ چوار رکات، ئیتر چۆن نوێژەکانی دەکات بە پێچەوانەی نوێژەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئەو موسڵمانانەی لەگەڵی بوون.

---

[561] – مسلم بشرح النووي: (٥/ ٢٧١-٢٧٣).

منیش دەڵێم: لەدوای وەفاتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم عائیشە لە سەفەردا چوار رکات نوێژی دەکرد.

ئیبن عەباس و جگە لەویش دەڵێن: عائیشە تەئویلی دەکرد وەك چۆن پێشەوا عوسمان تەئویلی دەکرد، هەمیشە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە سەفەردا نوێژی کورتدەکردەوە، هەندێك لە راوی فەرمودەکان لەم دوو فەرمودە فەرمودەیەکیان دروستکردووە و وتویانە: (فكان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقصُر وتتم هي). واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە سەفەردا نوێژی کورتدەکردەوە، بەڵام عائیشە تەواوی کردووە، پاشان هەندێ تر لە راویەکان بە هەڵەداچوون و وتویانە: (كَانَ يَقْصُرُ ويُتِمُّ أي هو). واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە سەفەردا نوێژی کورتدەکردەووە جاری وەهاش بووە تەواوی کردووە [٥٦٢].

**٢- کورتکردنەوە یان کۆکردنەوە پێش دەرچوون لەشار:**

ئەمەش هەڵەیە زۆر کەس کەوتوونەتە ئەم هەڵەوە دەبینی یەکێ لەوانە نوێژەکەی کورت دەکاتەوە پێش دەرچوون لەشار.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: کورتکردنەوەی نوێژ دەست پێ دەکات بە جیابوونەوە لە خانوبەرەکانی شوێنی نیشتەجێبوونی یان لە دەواری قەومەکەی ئەگەر دەوارنشین بوو ئەمە پوختەی قسەیە لەم بارەوە[٥٦٣].

بە مەرج گیراوە لای هەر چوار مەزهەبەکە و ئیسحاق: دەرچوون لە شوێن شوێنی نیشتەجێبوونی بەو جادەدا کە لێی دەردەچێت کەواتە دروست نیە نوێژ کورتکاتەوە هەتا جیانەبێتەوە لە خانوبەرەکانی شارەکەی یان دێکەی، بەو جادەدا کە ئەو پیا دەڕوات، با ئەو گەڕەکە جیابێت لەشار، یان پەیوەست بێت پێیەوە، بۆی نیە نوێژ کورتکاتەوە هەتا لە سنورەکەیان جیانەبێتەوە. ئەگەر لە ئاوەدانی دەرچوو دروستە نوێژ کورتکاتەوە هەرچەندە لە جادەکانی ترەوە گەڕەکی تر هەبێت، بۆ ئەو شوێنی دەرچوون ئیعتیباری هەیە نەك جادەکانی تر[٥٦٤].

---

562 – زاد المعاد لابن قيم الجوزية: (١/ ٤٦٤–٤٦٦).

563 – مسلم بشرح النووي: (٥/٢٧٩).

564 – الدين الخالص: (٤/ ٦١).

**٣- ماوەی کورتکردنەوە:**

ئەم کارە زانایان ناکۆکی زۆریان لەسەری هەیە.

راسترین وتە لەسەر ئەم کارە: ئەوەی پێی بوترێت سەفەر، با ماوەکەی کورت بێ و دوور نەبێت نوێژی تێدا کورت دەکرێتەوە، چونکە دیاریکردنی ماوەی سەفەر بۆ رۆژێ یان دوو رۆژ یا سێ رۆژ هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماوەیەکی دیاریکراوی دانەناوە بۆ ئوممەتەکەی هەتا نوێژی تێدا کورتکەنەوە و بەرۆژوو نەبن، بەڵکو بەگشتی رێی پێداون بەمەرجێك پێی بوترێ سەفەر هەروەك چۆن رێی پێداون بۆ تەیەممومم کردن لە هەموو سەفەرێکدا بەڵام ریوایەتەکانی دیاریکردنی رۆژێ یان دوو رۆژ یا سێ رۆژ هیچیان (صحیح) خوای پەروەردگاریش زاناترە[٥٦٥].

**٤- ئیقتیدا بەنیشتەجێوە بۆ کەسێ لە سەفەردا بێت:**

زۆر لە نوێژخوێنان هەڵە دەکەن ئەویش بەوەی لە کاتێکدا سەفەرین - لەدوای کەسێکی نیشتەجێ یان موسافیرەوە چوار رکات نوێژ دەکەن- بەمە وازدەهێنن لە سوننەتی کورتکردنەوە کە رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

---

565 – زاد المعاد لإبن قيم الجوزية: (١/٤٨١).

# کۆکردنەوەی نوێژ لەشوێنی نیشتەجێدا

زۆربەی خەڵك بیروباوەڕیان وایە لە شوێنی نیشتەجێدا کۆکردنەوە نوێـژ دروسـت نیـە، بـەڵکو ئـەو کەسـەش ئـەو کـارە دەکـات بـە بیدعەچـی لەقەڵـەمی دەدەن، ئەمـەش تێگەیـشتنێکی هەڵەیە، چونکە بە سابتی لە سوننەتی پاك و پـیرۆزدا هـاتووە دروسـتە بـۆ نوێـژخوێن نوێـژی نیوەڕۆ و عەسر بەسـەریەکەوە بکـات ئـیتر بـە پـێش خسـتن یـان دواخسـتن، هـەروەها نوێـژی مەغریب و عیشاش بەو شێوەیە، بەڵام ئەمانـە هـەموویان دەبـێ بـەو شـێوازە بێـت کـە لـە شەرعدا هاتووە، - ئەم کۆکردنەوەیە بەس بۆ کەسی سەفەری و کاتی سەرماو سـۆڵەو بـارەش و باران بارین نیە، بەڵکو بۆ هـەموو پێویـستی و عـوزرێکی مرۆڤـە... ئـەوەش ئێـوە و ئـەم بەڵگانەی لای خوارەوە.

لە ئیبن عەباسەوە هاتووە، کە وتویەتی: (صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ سَفَرٍ). واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری بەیەکەوە کردووە بەبێ ئەوەی ترسی هەبێت یان سەفەر بکات. ئەبو زوبێر دەڵێ: لە سەعیدم پرسی بۆچی وای کردووە؟ وتی: منیش پرسیم لە ئیبن عەباس بۆچی وای کردووە؟ فەرمووی: (أَرَادَ أَنْ لاَ يُحْرِجَ أَحَدًا مِنْ أُمَّتِهِ)[566]. واتە: ویستویەتی ئومەتەکەی تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی نەکات.

لە (عبدالله)ی کوڕی شەقیقەوە هاتووە، کە وتویەتی: (خَطَبَنَا ابْنُ عَبَّاسٍ يَوْمًا بَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ وَبَدَتِ النُّجُومُ وَجَعَلَ النَّاسُ يَقُولُونَ الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ، قَالَ: فَجَاءَهُ رَجُلٌ مِنْ بَنِى تَمِيمٍ لاَ يَفْتُرُ وَلاَ يَنْثَنِى الصَّلاَةَ الصَّلاَةَ. فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ أَتُعَلِّمُنِى بِالسُّنَّةِ؟ لاَ أُمَّ لَكَ. ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، فَحَاكَ فِي صَدْرِى مِنْ ذَلِكَ شَىْءٌ فَأَتَيْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ فَسَأَلْتُهُ فَصَدَّقَ مَقَالَتَهُ)[567].

واتە: ئیبن عەباس ڕۆژێ دوای نوێژی عەسر وتاری بۆ داین هەتا ڕۆژ ئاوا بوو ئەستێرەکان دەرکەوتن، خەڵکەکە هاواریان لێ هەستا وتیان: نوێژ نوێژ، وتی: هەتا پیاوێکی هۆزی تەمیم هات و بێ دەنگە نەدەبوو وتی: نوێژ نوێژ، ئیبن عەباس فەرمووی: تۆ من فێری سوننەت دەکەی؟ ئەی لەباری دایکت بچوایەیت! پاشان فەرمووی: بینیم پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی نیوەڕۆو عەسرو ئێوارەو عیشای کۆکردۆتەوە.

---

566 – أخرجه مسلم: (٥٠) كتاب صلاة المسافرين.

567 – أخرجه مسلم: (٥٧) كتاب صلاة المسافرين.

جا (عبدالله)ی کوڕی شەقیق فەرمووی: لە دڵمدا شتێك دروست بوو، بۆیە چووم بۆلای ئەبو هورەیرە لەوبارەوە پرسیارم لێکرد؟ ئەویش فەرمودەکەی ئیبن عەباسی بەڕاست خستەوە.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: هەندێکی تریان دەڵێن: ئەمەش (حمل) دەکرێتە سەر کۆکردنەوە بە عوزری نەخۆشی یان هەر عوزرێکی تری لەو جۆرە، ئەمەش رای ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و قازی حسینە لە هاوەڵەکانی ئیمە، وە (خطابي) و (متولي) و (رویاني) لە هاوەڵەکانمان ئەمەیان هەڵبژاردووە، وە ئەمەش رای هەڵبژێردراوە بۆ تەئویل کردنی ئەو فەرمودەیە، لەبەر رواڵەت(ظاهیر)ی فەرمودەکەو کارپێکردنی ئیبن عەباس و (موافقە)کردنی ئەبو هورەیرە، وە لەبەر ئەوەی زەحمەت و ناڕەحەتی لەوەدا (نەخۆش و عوزرەکان) زیاترە تاوەکو باران بارین.

وە کۆمەڵێك لە پێشەوایان رایان وایە کۆکردنەوەی نوێژ دروستە لە ماڵدا لەبەر پێویستی، بۆ کەسێك نەیکاتە عادەت، ئەمەش راو بۆچوون (اِبْن سِيرِين) و (أشْهَب)ە لە هاوەڵەکانی پێشەوا مالیك، وە(خَطَّابِي)یش گێڕاویەتیەوە لە (قَفَّال) و (وَالشَّاشِيّ الْكَبِير) لە هاوەڵەکانی شافیعی گێڕاویەتیەوە لە (أَبِي إِسْحَاق الْمَرْوَزِي)ەوە ئەویش لە کۆمەڵێك لە (أَصْحَاب الْحَدِيث) زانایانی فەرمودەناسەوە، (اِبْن الْمُنْذِر) ئەمەی هەڵبژاردووە، وە رواڵەت(ظاهیر)ی قسەکەی ئیبن عەباس ئەم رایە سەردەخات و پشتگیری دەکات کە دەڵێت: ویستویەتی ئوممەتەکەی تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی نەکات. بۆیە بە نەخۆشی و شی تر بیانوی بۆ نەهێناوەتەوە، خوای پەروەردگاریش زاناترە[568].

(اِبْن الْمُنْذِر) دەڵێ: مانای نیە (حمل) بکرێتە سەر عوزرێك لە عوزرەکان، چونکە ئیبن عەباس رەزای خوایان لێ بێ هۆکارەکەی باسکردووە کە دەدەڵێت: ویستویەتی ئوممەتەکەی تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی نەکات[569].

ئیبن تەیمیە دەڵێ: فراوانترین مەزهەب لە مەزهەبەکاندا دەربارەی کۆکردنەوەی نوێژ مەزهەبی پێشەوا ئەحمەدە، چونکە ئەو رێی داوە نوێژ کۆبکرێتەوە لەلایەن کەسێکەوە کە کاری هەبێ و تووشی زەحمەت و ناڕەحەتی ببێ ئەگەر نوێژەکانی کۆنەکاتەوە[570].

---

568 – مسلم بشرح النووي: (٥/ ٣٠٥).

569 – عون المعبود: (٤٠٥/ ٧٩).

570 – مجموع الفتاوى: (٢٤/ ٢٨).

# سەرپێچیەکانی کەسی نەخۆش

گەورەتین سەرپێچی کەسی نەخۆش ئەوەیە واز لە هەموو نوێژەکانی دێنێ هەتا چاك دەبێتەوە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە شەرع لە چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژکانیدا رێگای بۆ ئاسان کردووە... بەهیچ شێوەیەك بیانووی بۆ نەهێشتۆتەوە هەتا وازبهێنێ لە نوێژکردن، چونکە ئەگەر نەیتوانی دەسنوێژ بگرێت یان خۆی بشوات ئەگەر لەشگران بوو بۆی هەیە تەیەمموم بکات" ئەگەر ئاوەکە نەخۆشیەکەی زیاد دەکرد یان دەبووە هۆی مردنی".

ئەگەر نەیتوانی بە پێوە نوێژ بکات با بەدانیشتنەوە نوێژ ئەنجام بدات، ئەگەر نەیتوانی بەدانیشتنەوە نوێژ بکات، با لەسەر تەنیشت نوێژ بکات رکوع و سەجدەکەی بە کەمێك چەمینەوە بکات.

شێخ ئەلبانی لە کتێبی (صفة صلاة النبي)دا باسی چۆنیەتی نوێژی نەخۆشی نقلّ کردووە بە بەڵگەی هەندێ فەرموودە لەوانە:

عیمرانی کوڕی حصین رەزای خوای لێ بێ وتی: نەخۆشی مایەسیریم هەبوو پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە چۆنیەتی نوێژکردنم؟ فەرمووی: (صَلِّ قائِماً، فَإن لَم يَستَطيع فَقاعِداً، فَإن لَم يَسْتَطع فعلَى جَنب)[571]. واتە: بەپێوە نوێژ بکە، ئەگەر توانات نەبوو بەدانیشتنەوە، ئەگەر بەدانیشتنەوە توانات نەبوو، لەسەر تەنیشت نوێژکەت بکە.

هەروەها وتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە نوێژی کەسێك نوێژەکەی بەدانیشتنەوە بکات؟ لە وەڵامدا فەرمووی: (مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا (وفي رواية: مُضْطَجِعًا) فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ)[572].

---

571 – رواه البخاري وأبو داود وأحمد.

572 – رواه البخاري وأبو داود وأحمد.

واتە: ئەو کەسەی بەپێوە نوێژەکانی ئەنجام بدات ئەوە چاکترە، وە ئەو کەسەی بەدانیشتنەوە نوێژەکانی ئەنجام بدات ئـەوە نیـوەی پاداشـتی راوەسـتاوی هەیـە، ئـەو کەسـەی بەڕاکـشانەوە بیکات، وە لە ریوایەتێکی تردا ئەو کەسەی لەسەر تەنیـشت نوێـژەکانی بکـات ئـەوە نیـوەی پاداشتی دانیشتووەکەی هەیە. مەبەست پێی نەخۆشەکەیە.

ئەنـەس رەزای خـوای لـێ بـێ وتـی: کۆمـەڵێ لـە موسـڵمانانان بـە هـۆی نەخۆشـیەوە بەدانیشتنەوە خەریکی ئەنجامدانی نوێژەکانیان بوون، کـە پێغەمبـەری خـوا صـلی الله علیـە وسلم بەو شێوەیە چاوی کەوت پێیان فەرمووی: (إِنَّ صَلَاةَ الْقَاعِدِ عَلَـى النِّـصْفِ مِـنْ صَـلَاةِ الْقَائِمِ)[573]. واتە: نوێـژی کەسـێك بەدانیـشتنەوە نوێژەکـەی ئـەنجام بـدات پاداشـتەکەی نیـوەی نوێژی کەسێکە بەپێوە نوێژەکانی ئەنجام بدات.

جارێ پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم سەردانی نەخۆشێك دەکات، لەسەر پشتیەك سوجدە دەبات و نوێژەکەی دەکـات، ئـەویش لای دەبـات و فڕێـی دەدات، نەخۆشـەکە دارێـك دێنێ بۆ ئەوەی نوێژەکەی لەسەر بکات، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم دارەکـەش لا دەبـات و فڕێی دەدات، پاشـان دەفـەرموێت: (صَلِّ عَلَى الأَرْضِ إِنِ اسْتَطَعْتَ، وَإِلا فَأَوْمِ إِيمَـاءً وَاجْعَـلْ سُجُودَكَ أَخْفَضَ مِنْ رُكُوعِكَ)[574]. واتـە: ئەگـەر توانیـت لەسـەر زەوی نوێژەکـەت ئـەنجام بـدە، ئەگـەر نـە تـەنها بـە ئامـاژەکردن نوێـژەکانت ئـەنجام بـدە، بـا سـەجدەکانت نـزمتر بـن لـە رکوعـەکانت[575].

چۆنیەتی دانیشتنەکانی وەك لە فەرموودەدا هـاتووە: (وَكَانَ يَجْلِـسُ مُتَرَبِّعًـا)[576]. واتـە: شێوەی دانیشتنەکانی چوارمشقی بوو. هەروەها دروستە وەك چۆن بۆ تەحیات دادەنیشێ بەو شێوەیە دانیشێت.

---

[573] – رواه أحمد وابن ماجه بسند صحيح.

[574] – رواه الطبراني والبزار وابن السماك والبيهقي وسنده صحيح.

[575] – نقلا من صفة الصلاة النبي: (ص: ٥٢-٥٣).

[576] – رواه النسائي وابن خزيمة والحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

ئەگەر لەسەر تەنیشت نەیتوانی ئەوا با بە راکشانەوە لەسەر پشت نوێژەکانی ئەنجام بدات بەپێی توانا پێکانی رووبکاتە قیبلە، هەر چوار مەزهەبەکەو جمهوری زانایان راو بۆچوونیان لەسەر ئەوەیە، چونکە تەکلیفی بەپێوە وەستان نارەحەتی و زەحمەتە[577].

دوای ئەمە ئیتر گومان ناکەم نەخۆشێك ئەگەر باوەڕی بە خواو بە دوارۆژ هەبێت وازبهێنێ لە یەك نوێژ لەدوای ئەم هەموو ئاسانکاریەی کە خوای بەخشندەی میهرەبان کردوویەتی، بەڵکو نەخۆش نزیك دەبێتەوە لە مردن لەو کاتەدا زیاتر پێویستی بە خۆئامادەکرن هەیە بۆ گەیشتن بە خوای پەروەردگار، داواکارم لە خوای و بە بەزەیی شیفای نەخۆشە موسڵمانەکان بدات و لەمردووەکانیشیان خۆشبێت.

---

577– الدين الخالص: (٤/ ٣٣).

## سەرپێچییەکان لە نوێژی جەنازەدا

**١- وەستانی خەڵك بەریز لەلای راستی پێشنوێژەوە:**

ئەم کارەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

سوننەت وایە خەڵك لەدوای پێشنوێژەوە چەند ریزێك تەواو بکەن، ئەمەش لەبەر گشتی ئەو فەرمودانەی لەبارەی تەواوی و رێکخستنی ریزەکانەوە هاتووە لەوانە فەرمودەکەی صلی الله علیه وسلم کە دەفەرموێت: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصُّفُوفِ مِنْ إِقَامَةِ الصَّلَاةِ)[٥٧٨]. واتە: ریزەکانتان رێك بخەن با ریزەکانتان لارو وێر نەبێ، چونکە رێك خستنی ریزەکان بەشێکە لە تەواوی نوێژ.

**٢- وەستان لە ناوەراستی پیاو و لەلای سەری ئافرەتەوە:**

ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم...بە سابتی هاتووە ئەگەر مردووەکە پیاو بوو پێشنوێژ لای سەریەوە رادەوەستێ، بەڵام ئەگەر ئافرەت بوو ئەوا لە ناوەراستییەوە دەوەستێت.

**عن أبي غالب الخياط قال: (شهدت أنس بن مالك صلى على جنازة رجل، فقام عند رأسه، ( وفي رووایة: رأس السرير ) فلما رفع، أتي بجنازة امرأة من قريش أو من الأنصار، فقيل له: يا أبا حمزة هذه جنازة فلانة ابنة فلان فصل عليها، فصلى عليها، فقام وسطها، (وفي رواية: عند عجيزها، وعليها نعش أخضر) وفينا العلاء بن زياد العدوي، فلما رأى اختلاف قيامه على الرجل والمرأة قال: يا أبا حمزة هكذا كان رسول الله صلى الله عليه وسلم يقوم حيث قمت، ومن المرأة حيث قمت قال: نعم، قال: فالتفت إلينا العلاء فقال: احفظوا)**[٥٧٩].

---

578– متفقٌ عليهِ عن أنس– صحيح الجامع: (٣٦٤٧).

579– رواه أبو داود: (٢ / ٦٦– ٦٧) وصححه الألباني في أحكام الجنائز.

واتە: لە (أبي غالب الخياط)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیکم بینی لەسەر تەرمی پیاوێك نوێژی دەکرد لەلای سەریەوە راوەستا بوو، لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە کە لەلای سەری تابوتەکە یان راکێشراوەکەوە راوەستا، کاتێك تەرمی پیاوەکەیان هەڵگرت، تەرمی ژنێکی قورەیشی یان ئەنصاریان هێنا، وتیان ئەی ئەبو حەمزە ئەمە تەرمی فلانی کچی فلانە نوێژی لەسەر بکە ئەویش لەلای ناوقەدیەوە وەستاو نوێژی لەسەر کرد، عەلائی کوڕی زیادی عەدەویمان لەناودا بوو کاتێ جیاوازی وەستانی لەسەر تەرمی ئافرەت و پیاو بینی وتی: ئەی ئەبو حەمزە ئایا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بەو شێوەیە لەسەر تەرمی ئافرەت و پیاو رادەوەستا کە تۆ وەستایت؟ فەرمووی: بەڵێ، وتی: عەلائی کوڕی زیاد ئاوڕی دایەوە بە لامانداو وتی: لەبەری بکەن.

لە (سمرة کوڕی جندب)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: (صَلَّيْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَصَلَّى عَلَى أُمِّ كَعْبٍ مَاتَتْ وَهِيَ نُفَسَاءُ فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لِلصَّلاَةِ عَلَيْهَا وَسَطَهَا)[٥٨٠]. واتە: بەدوای پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم نوێژم کرد، لەوکاتەی کە لەسەر (أُمِّ كَعْب) نوێژی کرد، کە مردبوو بەهۆی منداڵ بوونەوە، لەو نوێژەدا پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە ناوەڕاستیدا وەستابوو.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: فەرمودەکە بە ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە سوننەتە پێشنوێژ لە ناوەڕاستی ئافرەتدا بووەستێت، ئەمەش بە واتای فەرمودەی ئەنەس دێت کە فەرموویەتی: (عند عجيزها) بەڵکو ئەمە وتەیەکە زیاتر ئاشکرای دەکات، لە فەرمودەکەی (سمرة) ئاشکرا ترە لە ئاماژەکردنیدا[٥٨١].

---

[580] – أخرجه البخاري: (٣ / ١٥٦ – ١٥٧) ومسلم: (٣ / ٦٠).

[581] – أحكام الجنائز: (ص: ١١٠).

**٣- دەست بەرزکردنەوە و دەنگ بەرزکردنەوە لەکاتی هەموو(الله اکبر)ێکدا:**

ئەمە یەکێکی ترە لەو سەرپێچیانەی کە زۆر لە موسڵمانان دەیکەن لە نوێژی جەنازەدا... پێچەوانەی سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە ئەو تەنها لە تەکبیرەی یەکەمدا دەستی بەرزدەکردەوە.

لە (عبدالله)ی کوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (**أن رسـول الله كان يرفع يديه علي الجنازة في أول تكبيرة، ثم لا يعود**). واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەکاتی نوێژکردنی لەسەر جەنازە لە تەکبیرەی یەکەمدا دەستەکانی بەرزدەکردەوە، لە تەکبیرەکانی تردا نەدەگەڕایەوە. واتە: بەرزی نەدەکردەوە.

ئەم فەرموده (دار قطني) تەخریجی کردووە بە سەنەدی ئەو پیاوانەی کە جێگەی متمانەن و باوەڕ پێکراون جگە لە (فضل)ی کوڕی (سكن) کە نەناسراوە، (ابن التركماني) لە (**الجوهر النقي: ٤٤/٤**)دا لێی بێدەنگ بووە، پاشان (ترمذي) لەبارەی فەرمودەی یەکەمەوە دەڵێ: " ئەم فەرمودە غریبە" ئەهلی زانست و زانیاری راو بۆچوونیان جیاوازە لەسەری، زۆربەی ئەهلی زانست و زانیاری لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و جگە لەوانیش رایان وایە کە دەبێت پیاو لەهەموو تەکبیرەیەکدا دەستەکانی بەرزکاتەوە، ئەمەش قسەی (ابن المبارك) و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

هەندێ لە زانایان دەڵێن: دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە تەنها لە یەکەمجاردا نەبێت، ئەمەش قسەی (ثوري)و خەڵکی کوفەیە، (ابن المبارك) لە باسی نوێژی جەنازەدا باسی ئەوەی کردووە بەدەستی راستی دەستی چەپی نەگرتووە، بەڵام هەندێ لە زانایان راو بۆچوونیان وایە بەدەستی راستی دەستی چەپی گرتووە، وەك لە نوێژدا کردوویەتی.

لە کتێبی (المجموع)ی پێشەوا نەوەوی: ٥ / ٢٣٢)دا هاتووە (ابن المنذري) لە کتێبی: (الاشراف والاجماع)دا دەڵێ: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە بەرزکردنەوەی دەستەکان لە(الله اکبر)ی یەکەمدایە، لە تەکبیرەکانی تردا رایان جیاوازە.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: هیچ شتێکم نەبینیوە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی بەرزکردنەوەی دەستەکان سوننەت بێت جگە لەکاتی تەکبیرەی یەکەمدا نەبێت، من وای نابینم کە شەرعی بێت، ئەمەش مەزهەبی ئەبو حەنیفەو جگە لەویشە، شەوکانی و جگە لەویش لە لێکۆڵەرەوەکان ئەم رایەیان هەڵبژاردووە، (ابن حزم: ٥ / ١٢٨)ە لەوبارەوە دەڵێ: سەبارەت بە بەرزکردنەوەی دەستەکان لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نەهاتووە کە دەستەکانی بەرزکردبێتەوە لەکاتی تەکبیرە کردندا، جگە لەکاتی تەکبیرەی یەکەمدا نەبێت، دروست نیە ئەو کارە بکرێت، چونکە ئەو کارە لە نوێژدا هیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم هاتووە ئەوەیە کە لەکاتی هەموو دانەوینەوە و هەستانەوەیەکدا دەستی بەرزکردۆتەوە و تەکبیرەی کردووە، بەڵام لەنوێژی جەنازەدا دانەوینەوە و بەرزبونەوەی تێدا نیە[٥٨٢].

**٤- سێ (الله اكبر)و ئینکاری کردنی کەسێ زیاتر بکات:**

چوار تەکبیرەی لەسەر جەنازە مەشهورە بەڵام هەندێ کەس سێ تەکبیرەی لەسەر دەکەن - ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە، بەڵکو نازانن لەسەر جەنازە پێنج تەکبیرە زیاتر هەتا دەگاتە نۆ تەکبیرە دروستە.

شێخ ئەلبانی دەڵێ: چوار تەکبیرە یان پێنج تەکبیرەی لەسەر دەکرێت، هەتا دەگاتە نۆ (الله اكبر)، هەموو ئەمانەش جێگیر و سەلمێنراون لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم، بۆیە هەرکامیان بکات نوێژەکەی لەسەر دەکەوێت، بەڵام باشتر وایە هەمەجۆر بێت، جارێ ئەمەیان ئەنجام بدات جارێکی تر ئەوی تریان ، هەروەکو کردارەکانی هاوشێوەی وەك دەست پێکردنی نوێژ و، شێوازە جۆر بەجۆرەکانی تەحیات و ، شێوازی سڵاواتە ئیبراهیمیەکان و هاوشێوەکانیان، بەڵام ئەگەر پێویستی کرد نوێژخوێن پابەند بێت بە جۆرێکیانەوە، ئەوا چوار تەکبیرە بکات، چونکە زۆرینەی فەرموودەکان لەوبارەوە هاتوون[٥٨٣]، ئەمەش روونکردنەوەی ئەوەیە:

---

582 – أحكام الجنائز وبدعها: (ص: ١١٦).

583 – أحكام الجنائز: (ص: ١١١).

* سەبارەت بەکردنی چوار تەکبیرە، فەرمودەیەکی زۆرمان پێگەیشتووە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم کە ئەمە هەندێکیانە:

لە (عبداللە)ی کوڕی عەباسەوە رەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (مَاتَ إِنْسَانٌ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَعُودُهُ فَمَاتَ بِاللَّيْلِ فَدَفَنُوهُ لَيْلًا فَلَمَّا أَصْبَحَ أَخْبَرُوهُ فَقَالَ مَا مَنَعَكُمْ أَنْ تُعْلِمُونِي قَالُوا كَانَ اللَّيْلُ فَكَرِهْنَا وَكَانَتْ ظُلْمَةٌ أَنْ نَشُقَّ عَلَيْكَ فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ [ قال: فأمّنا، وصفنا خلفه ]، [ وأنا فيهم ]، [ وكبر أربعا ])[584]. واتە: پیاوێ مرد، کەسێك بوو پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەردانی دەکرد لەکاتی نەخۆشیەکەیدا، شەو بەخاکیان سپارد، کە رۆژ بوویەوە هەواڵیان پێدا، فەرمووی: چی رێگر بوو لەوەی هەواڵی مردنیم پێ بگەیەنن؟ وتیان: شەو بوو، تاریکیش بوو، پێمان خۆش نەبوو زەحمەتت بدەین، رۆشتە سەر گۆڕەکەی و پێشنوێژی بۆ کردین، منیش لەناویاندا بووم، چوار تەکبیرەی لەسەر کرد.

سەبارەت بە نوێژی جەنازە لەسەر نەجاشی لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە، کە وتویەتی: (فأمّنا وصَلى عليه، وَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ)[585]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێشنوێژی بۆ کردین و نوێژی لەسەر کرد و چوار (الله اكبر)ی لەسەر کرد.

* سەبارەت بە کردنی پێنج تەکبیرە، لە (عبدالرحمن کوڕی أبي ليلى)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: (كان زيد بن أرقم يُكَبِّرُ عَلَى جَنَائِزِنَا أَرْبَعًا وَإِنَّهُ كَبَّرَ عَلَى جَنَازَةٍ خَمْسًا ، كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُكَبِّرُهَا (فلا أتركها (لاحد بعده) أبدا)[586]. واتە: زەیدی کوڕی ئەرقم چوار تەکبیرەی دەکرد لەسەر جەنازەکانمان، جارێکیان پێنج تەکبیرەی لەسەر مردوویەك کرد، منیش لێم پرسی؟ لەوەڵامدا وتی: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەو شێوە دەیکردن، بۆیە هەرگیز لەبەر کەس وازیان لێ ناهێنم.

---

584– أخرجه البخاري: (٣/٩١ – ٩٢) وابن ماجه والسياق له: (١/ ٢٦) والسياق له، ومسلم مختصرا.

585– أخرجه البخاري: (٣ / ٩٠، ١٤٥) ومسلم: (٣ / ٥٤).

586– أخرجه مسلم: (٣ / ٥٦) وأبو داود: (٢ / ٦٧، ٦٨).

* سەبارەت بەکردنی شەش و حەوت تەکبیرە، ئەوا چەندەها (آثار)ی (موقوف)مان لەوبارەوە پێگەیشتووە، بەڵام ئەو(آثار)انە لە حوکمی فەرمودەی(مرفوع)دان، چونکە هەندێ لە گەورە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەم کارانەیان ئەنجامداوە لەپێش چاوی هاوەڵانی تر بێ ئەوەی هیچ نکولیەکیان لەسەر کردبێت، یان یەکێك ڕێگریان بووبێت، لەوانەش:

**یەکەم:** لە (عبدالله)ی کوڕی مەعقەلەوە هاتووە، کە وتویەتی: **(أن علي بن أبي طالب صلى على سهل بن حنيف، فكبر عليه ستا، ثم التفت إلينا، فقال: إنه بدري، قال الشعبي: وقدم علقمة من الشام فقال لابن مسعود: إن اخوانك بالشام يكبرون على جنائز هم خمسا، فلو وقتم لنا وقتا نتابعكم عليه، فأطرق عبد الله ساعة ثم قال: انظروا جنائزكم فكبروا علها ما كبر أئمتكم، لا وقت ولا عدد)**[587]. واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ نوێژی لەسەر (سهل کوڕی حنیف) کردو شەش تەکبیرەی لەسەر کرد، پاشان لای کردەوە بەلاماندا وتی: بەشداری بەدری کردووە، پێشەوا (الشعبي) دەڵێ: (علقمة) لە شامەوە هات و بە (ابن مسعود)ی وت: براکانتان لە شام پێنج تەکبیرە دەکەن لەسەر جەنازەکانیان، جا ئەگەر دەکرێ ژمارەیەکمان بۆ دیاری بکەیت و ئێمەش شوێنتان بکەوین لەو ژمارەیەدا، (عبدالله)ی کوڕی مەسعود بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بوو وتی: سەیری جەنازەکانتان بکەن بەگوێرەی پێشنوێژەکانتان تەکبیرەیان لەسەر بکەن، چونکە ژمارە دیاریکردن نیە.

**دووهەم:** لە (عبد خير)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: **(كان علي رضي الله عنه يكبر على أهل بدر ستا، وعلى أصحاب النبي صلى الله عليه وسلم خمسا، وعلى سائر الناس أربعا)**[588]. واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ لەسەر ئەو کەسانەی کە ئەهلی بەدر بوون شەش تەکبیرەی دەکرد، لەسەر هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێنج تەکبیرەی دەکرد، لەسەر خەڵکەکەش بەگشتی چوار تەکبیرەی دەکرد.

587– أخرجه ابن حزم في " المحلى " (٥، ١٢٦) بهذا التمام، وقال: " وهذا إسناد غاية في الصحة ".

588– أخرجه الطحاوي والدار قطني (١٩١) ومن طريقه البيهقي (٤/ ٣٧) وسنده صحيح رجاله ثقات كلهم.

**سێهەم:** لە موسای کوڕی (عبدالله)ی کوڕی یەزیدەوە هاتووە، کە وتویەتی: (أن عليا صلى على أبي قتادة فكبر عليه سبعا، وكان بدريا)[589]. واتە: پێشەوا عەلی ڕەزای خوای لێ بێ نوێژی لەسەر (أبي قتادة) کردو، حەوت تەکبیرەی لەسەر کرد، بەشداری جەنگی بەدری گەورەی کردووە.

* سەبارەت بەکردنی نۆ تەکبیرە، ئەوا دوو فەرمودەی تێدایە، ئەوانیش:

**یەکەم:** لە (عبدالله)ی کوڕی زوبێرەوە هاتووە، کە وتویەتی: (أن النبي صلى الله عليه وسلم صلى على حمزة فكبر عليه تسع تكبيرات)[590]. واتە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم نوێژی لەسەر حەمزە کردو، نۆ تەکبیرەی لەسەر کرد.

**دووهەم:** لە (عبدالله)ی کوڕی عەباسەوە هاتووە، کە وتویەتی: (لما وقف رسول الله صلى الله عليه وسلم على حمزة...أمر به فهيى إلى القبلة، ثم كبر عليه تسعا...)[591]. واتە: کاتێ کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر حەمزە وەستا...و فەرمانی کرد کە بیهێنن بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکات، لە ڕووی قیبلەوە دانرا، پاشان نۆ تەکبیرەی لەسەر کرد[592].

### ٥- ئینکاری لەگەڵ کەسێ لەدوای فاتیحەوە سورەتێ بخوێنێ:

هەندێ لە نوێژخوێنان ئینکاری لەگەڵ کەسێ دەکەن کە لەدوای فاتیحەوە سورەتێ بخوێنێ( لەدوای تەکبیرەی یەکەمەوە) لەگەڵ ئەوەشدا کە سابت بووەو سەلمێنراوە لەفەرمودەی صەحیحی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم... ئەمە لەکاتێکدایە کە پاڕانەوەی دەست پێکردنی نوێژ دەخوێنن کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

---

[589] – أخرجه الطحاوي والبيقهي (٤ / ٣٦) بسند صحيح على شرط مسلم – لكن أعله البيهقي بقوله: " إنه غلط، لان أبا قتادة رضي الله عنه بقي علي رضي الله عنه مدة طويلة ".

ورده الحافظ في " التلخيص " (١٦٦٥) بقوله: " قلت: وهذه علة غير قادحة، لانه قد قيل: إن أبا قتادة مات في خلافه علي، وهذا هو الراجح وسبقه إلى هذا ابن التركماني في " الجوهر النقي " فراجعه.

[590] – وقد مضى بتمامه وتخريجه في (الثاني) من المسألة (٥٩) (ص ٨٢).

[591] – وتقدم أيضا في المسألة (٦٩) الحديث الثاني، (ص ١٠٤).

[592] – أحكام الجنائز للألباني: (ص: ١١٢-١١٤).

شێخ ئەلبانی لە کتێبی (أحکام الجنائز)دا دەڵێ: پاشان دوای تەکبیرەی یەکەم سورەتی فاتیحە دەخوێنێ، لەگەڵ سورەتێکدا[٥٩٣]، ئەوەش لەبەر فەرمودەی (طلحة) کوڕی (عبدالله)ی کوڕی عەوفە کە تێیدا فەرموویەتی: (صلیت خلف ابن عباس رضي الله عنه علی جنازة، فقرأ بفاتحة الکتاب (وسورة، وجهر حتی أسمعنا، فلما فرغ أخذت بیده، فسألته؟ ف) قال: (إنما جهرت لتعلموا أنا سنة (وحق)[٥٩٤]. واتە: جارێ بەدوای (ابن عباس)ەوە نوێژم لەسەر جەنازەیەك دەکرد، سورەتی فاتیحە و سورەتێکی تری بەدەنگی بەرز خوێند، کە لە نوێژەکەی بوویەوە دەستم گرت و لێم پرسی؟ لەوەڵامدا پێی وتم: خۆم دەنگم تێدا بەرزکردنەوە بۆ ئەوەی بزانن ئەو خوێندنەوانەش لە سوننەتدا هاتوون و خوێندنەوەشیان تێدا ڕەوایە [٥٩٥].

**٦- نوێژکردن لەسەر کەسی (غائب)کە نوێژی لەسەر کرابێت:**

ئەم بابەتە موناقەشەی دوورودرێژ و جیاوازی زۆری لەسەرە لە نێوان زۆربەی زانایان و جگە لەوانیشدا... ئەی برای بەڕێز من لێرەدا پوختەی قسەی (ابن قەیم)ت ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە لەم بارەوە بۆ دەگێڕمەوە کە وتویەتی: لە عادەت و سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نەبووە کە نوێژ لەسەر هەموو مردوویەکی ئامادە نەبوو بکات، هەروەك دەبینین خەڵکێکی زۆر لە موسڵمانان مردوون، ئەویش ئامادەیان نەبووە، کەچی نوێژیشی لەسەر نەکردوون، کەچی بە صەحیحی پێمانگەیشتووە و سەلمێندراوە کە نوێژی لەسەر نەجاشی کردووە، هەروەك چۆن نوێژی لەسەر مردوو کردووە، بۆیە زانایان لەو باسەدا جیاوازیان لەسەر سێ بۆچوون هەیە:

---

593 – فيه إشارة إلى عدم مشروعية دعاء الاستفتاح، وهو ملهب الشافعية وغيرهم، وقال أبو داود في المسائل " (١٥٣). " سمعت أحمد سئل عن الرجل يستفتح على الجنازة: سبحانك...! قال: ما سمعت".

594– أخرجه البخاري: (٣ / ١٥٨) وأبو داود: (٢، ٦٨).

595 – قال شيخ الألباني في أحكام الجنائز: (ص: ١١٩–١٢٠). قلت: وهذا الحديث وما في معناه حجة عليهم، لا يقال: ليس فيه التصريح بنسبة ذلك إلى النبي صلى الله عليه وسلم لانا نقول: أن قول الصحابي من السنة كذا. مسند مرفوع إلى النبي صلى الله عليه وسلم على أصح الاقوال حتى عند الحنفية، بل قال النووي في، " المجموع " (٥ / ٢٣٢): " إنه المذهب الصحيح الذي قاله جمهور العلماء من أصحابنا في الاصول وغيرهم من الاصوليين والمحدثين ". قلت: وهذا جزم المحقق ابن الهمام في " التحرير "، وقال شارحه ابن أمير حاج (٢ / ٢٢٤): " وهذا قول أصحابنا المتقدمين، وبه أخذ صاحب الميزان والشافعية وجمهور المحدثين ".

١- ئەمە تەشریعە و سوننەتە بۆ ئوممەتەکەی کە نوێژ لەسەر هەموو مردوویەکی ئامادەنەبوو بکەن، ئەمەش وتەی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەدە.

٢- هەردوو پێشەوا ئەبو حەنیفە و مالك فەرمویانە: ئەوە تایبەتە بە خۆیەوە، بۆ کەسی تر نیە.

٣- شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: وتەی هەڵبژاردە و راست ئەویانە کە بوترێت: مردووی ئامادەنەبوو ئەگەر لەشارێکدا مرد کەس نوێژی لەسەر نەکرد لەو شارەدا، ئەوا نوێژی غایبی لەسەر دەکرێت، هەروەك چۆن پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی لەسەر نەجاشی کرد، چونکە لەناو کافراندا مرد، کەس نوێژی لەسەر نەکرد، بەڵام ئەگەر مرد و نوێژی لەسەر کرا لەو شارەدا، ئەوا نوێژی غایبی لەسەر ناکرێت، چونکە ئەو فەرزە لەسەر موسڵمانان کەوتووە بە نوێژکردنی ئەو موسڵمانانە لەسەری، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی کردووە و وازیشی لێ هێناوە، وازهێنان و کردنی سوننەتە، ئەمەش شوێنی خۆی هەیە، خوای پەروەردگاریش زاناترە.

وە سێ وتەکەش لە مەزهەبی پێشەوا ئەحمەددا هەن، باشترینیان ئەم (تفصیل)ەیە کە باسمانکرد.

منیش دەڵێم: هەندێ لێکۆڵەوەرانی شافیعیەکان ئەم رایەیان هەڵبژاردووە، (خطابي) لە کتێبی (معالم السنن)دا کە ئەمە دەقەکەیەتی دەڵێ:

منیش دەڵێم: نەجاشی پیاوێکی موسڵمان بوو باوەڕ بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم هەبوو بەڕاستی دەزانی، بەڵام ئیمانەکەی شاردبۆوە بۆ ئەوەی گەلەکەی پێی نەزانن، هەر موسڵمانێکیش بمرێت واجبە موسڵمانان نوێژی لەسەر بکەن، تەنها ئەوەندە بووە لەناو کافراندا ژیاوە، کەس نەبووە مافی بەجێ بهێنێ و نوێژی لەسەر بکات، بۆیە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نوێژی غایبی لەسەر کرد، چونکە پەیامبەر گەورەو سەرپەرستی بوو، نزیکترین کەس بوو بۆی ئەمەش-خوای پەروەردگار زاناترە- هۆی ئەوەبوو کە نوێژی غایبی لەسەر کرد.

لەسەر ئەمە ئەگەر موسڵمانێك لە وڵاتێ لە وڵاتەكان مرد، مافەكەی لەسەر جێ بەجێ كرا واتە: نوێژی لەسەر كرا ئیتر پێویست نیە نوێژی غایبی لەسەر بكرێت، ئەگەر زانرا نوێژی لەسەر نەكراوە لەبەر هەر رێگری و هۆكار و عوزرێك بێت، سوننەت وەهایە نوێژی لەسەر بكرێت وازی لێ ناهێنرێت لەبەر ماوەی دووری.

كاتێ نوێژیان لەسەر كرد واجبە رووبكەنە قیبلە، نەك ئەو وڵاتەی كە لێی مردووە ئەگەر لەرووی قیبلەوە نەبوو.

ئەوەی پشتگیری ئەو رایە دەكات كە سوننەت نیە نوێژی غایب لەسەر هەموو مردوویەك بكرێت ئەوەیە كاتێ خەلیفە راشیدینەكان و جگە لەوانیش مردن هیچ موسڵمانێك نوێژی غایبی لەسەر نەكردن، ئەگەر بیانكردایە ئەوا بە (تواتر) كۆمەڵ دەیانگێڕایەوە، بەرامبەر بەمە زۆربەی موسڵمانان ئەم رۆژگارە نوێژی غایبی لەسەر هەموو مردوویەك دەكەن، بەتایبەتی ئەگەر خاوەن ناوبانگ و شۆرەت بێت[596]

٧- داهێنان لە زۆربەی پاڕانەوەكانی نوێژی جەنازەدا:

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: زۆربەی ئەو دوعایانەی لەناو راڤەو حاشیەی كتێبی فوقەهاكاندا هەیە لە سوننەتدا هیچ بنەمایەكیان نیە، بەڵكو داهێنراوە لەلایەن خۆیانەوە هۆشیاربن، هەندێ لە خۆ بە فوقەهازانەكان كاتێ نوێژ دەكەن لەسەر مردوویەك بەدەنگی بەرز دەڵێن: «سبحان من قهر عباده بالموت، وسبحان الواحد الحي الذي لايموت». بیدعەیەكی داهێنراوە لە شەرعدا خوای گەورە و پەیامبەرەكەی رێگەیان پێ نەداوە، هەروەها خوێندنی سورەتی فاتیحە بە دەنگی بەرز دواى سەلام دانەوەی نوێژی مردوو بەدوای ئەویشدا خوێندنی ئەم ئایەتە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ﴾ الأحزاب: ٥٦.

596 – أحكام الجنائز: (ص: ٩١– ٩٣).

دوو بیدعەی خراپن، هەروەها وتەکەیان کە دەڵێن: چۆن شایەتی بۆ ئەمە دەدەن؟ بەم شێوەیە وەڵام دەدەنەوەو دەڵێن: صالح... لەوانەیە هەندێ جار نوێژی نەکردبێ یان مەی و شەرابی خواردبێتەوە یا کەسێکی دەرچوو لە دین بێ و خراپەکار بێ — وەك چەندەها جار ئەمە دەبینین بەردەوامیش دەیبینین ناتوانین ئینکاری بکەین مەگەر زۆر بەکەمی نەبێت- درۆیەو تاوانێکی گەورەیە لە تاوانە گەورەکان و بیدعەی گومڕایی و خراپە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم گوێی لە(أم العلاء) بوو چۆن هەڵی دەدا بەسەر (عثمان)ی کوڕی (مظعون)دا کاتێ لەماڵی ئەواندا مرد دەیوت: ڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەی (أبا السائب)من شایەتیت بۆ دەدەم کە خوا ڕێزی لێ ناویت؟ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمووی: (وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَكْرَمَهُ). واتە: چۆن دەزانیت کە خوا ڕێزی لێ ناوە؟ وتم: دایك و باوکم بە قوربانت بێ ئەی خوا ڕێز لێ کێ دەنێت؟ فەرمووی: (أَمَّا هُوَ فَوَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ وَاللَّهِ إِنِّي لَأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ، وَ وَاللَّهِ مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ مَاذَا يُفْعَلُ بِي ). واتە: بە نیسبەت ئەوەوە سوێند بێ بە خوا گومانم نیە و بەدڵنیاییەوە، سوێند بە خوا هیواو ئومێدی خێری بۆ دەخوازم، سوێند بێ بە خوا کە من پێغەمبەری خوام صلی الله علیه وسلم نازانم چیم بەسەر دێ. وتم: سوێند بێ بە خوا لەمەو دوا تەزکیە بۆ کەس ناکەم. ئەم بەسەرهاتە لە کتێبی پێشەوا بوخاریدا هاتووە: ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ۝٢﴾ الحشر: ٢. واتە: ئینجا پەند وەرگرن ئەی خاوەنانی بیرو هۆش[٥٩٧].

**٨- سەلام دانەوە لەدوای تەکبیرەی چوارەم (بەبێ پاڕانەوە):**

ئەمەش هەڵەیەو پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

ڕاستیەکەی ئەوەیە نوێژخوێن لەدوای تەکبیرەی چوارەمەوە بپاڕێتەوە بە پێی فەرمودوکەی (عبدالله)ی کوڕی ئەبی ئەوفا کە نوێژی کرد لەسەر منداڵێکی چوار تەکبیرەی لەسەر کرد، پاشان ئەوەندەی نێوان دوو تەکبیرە پاڕایەوە ئینجا وتی: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَصْنَعُ فِي الْجِنَازَةِ هَكَذَا)[٥٩٨]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەم شێوەیە نوێژی دەکرد لەسەر جەنازە.

---

597 – السنن والمبتدعات: (ص: ١٠٩).

598 – أحكام الجنائز للشيخ الألباني: (ص: ١٢٦) والحديث أخرجه أحمد.

## سەرپێچیەکان لە نوێژی جەژندا

### ١- زیندوکردنەوەی شەوانی جەژن:

هەندێ کەس بیروباوەڕیان وایە زیندوکردنەوەی شەوی جەژن شتێکی موستەحەبە.. ئەمەش هەڵەیە چونکە هیچ فەرموودەیەکی صحیح لە بارەیەوە نەهاتووە.

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: ئەو فەرمودانەی لەبارەی گەورەیی نوێژی رۆژ و شەوەکانی جەژنی رەمەزان و قوربان و رۆژی عەرفەوە هاتوون هەر هەموویان درۆی هەڵبەسراون ئاوڕیان لێ مەدەنەوە[٥٩٩].

لەناو ئەو فەرمودانەدا کە کردوویانە بە حوجە ئەم فەرمودەیە: (من أَحْيَا اللَّيَالِي الْأَرْبَع، وَجَبت لَهُ الْجنَّة: لَيْلَة التَّروِيَة ، وَلَيْلَة عَرَفَة ، وَلَيْلَة النَّحْر ، وَلَيْلَة الْفطر)[٦٠٠]. واتە: هەر کەسێ ئەم چوار شەوانە زیندوبکاتەوە بە عیبادەت، بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، شەوی هەشتەمی مانگی(ذي الحجة)ە، شەوی عەرەفە، شەوی جەژنی قوربان، شەوی جەژنی رەمەزان.

ئەم فەرمودە فەرمودەیەکی(موچوع)ە دروستکراوە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بە سابتی نەهاتووە.

هەروەها فەرمودەی صلى الله عليه وسلم: (من أَحْيَا لَيْلَة الْفطر أَو لَيْلَة الْأَضْحَى، لم يمت قلبه يَوْم تَمُوت الْقُلُوب)[٦٠١]. واتە: هەر کەسێ شەوی جەژنی قوربان یان شەوی جەژنی رەمەزان زیندوبکاتەوە بە عیبادەت، دڵی نامرێت، لە رۆژێکا دەڵەکان دەمرن.

### ٢- هەڵەکان لە شێوەی (الله اکبر) کردندا:

بێگومان وەها باوەو بڵاوبۆتەوە لەناو نوێژخوێناندا چۆنیەتی (الله اکبر) کردن لە رۆژی جەژندا کە هیچ بنەمایەکی نیە لە سوننەتدا، وەك ئەوەی کە دەڵێن: (اللهُ أَكْبَرُ كَبِيراً وَالْحَمْدُ للهِ كَثِيراً وَسُبْحَانَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً... نصر عبده وأعز جنده وهزم الأحزاب وحده) هەتا کۆتایی.

---

599 – السنن والمبتدعات: (ص: ١١٧).

600– رواه ابن عساكر عن معاذ – ضعيف الجامع: (٥٣٥٨) موضوع.

601– رواه الطبراني في الكبير عن عبادة – ضعيف الجامع: (٥٣٦١) موضوع.

ئەم شێوە (الله اكبر) كردنە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیە وسلم، بەڵكو ئەوەی سابت بووە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم بەم شێوەیە بووە: (الله أكبر الله أكبر لا إله إلا الله والله أكبر الله أكبر ولله الحمد)[602].

**٣- وتەكەیان: نوێژی جەژن سوننەتە!!!**

زۆر كەس وادەزانن كە نوێژی جەژن سوننەتە، ئەوەی وازی لێ بهێنێ پێی گوناهبار نابێت... ئەمەش هەڵەیەكی گەورەیە، چونكە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم فەرمانی پێكردووە، بەڵكو فەرمانی كردووە بە ئافرەتانیش كە بچنەدەر بۆی و بەشداری نوێژی جەژنەكان بكەن بۆ ئەوەی خێرو چاكەیان دەسكەوێت.

(تعلیق)ی شێخ ئەلبانی دەربارەی ئەو كەسانەی دەڵێن: نوێژی جەژن سوننەتە:

وتەی: نوێژی جەژن سوننەتی(مؤكدة)یە، پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بەردەوام بووە لەسەری، فەرمانی داوە بە پیاوان و ئافرەتان بچنە ددر بۆی.

منیش دەڵێم: ئەو فەرمان كردنەی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بەڵگەیە لەسەر واجب بوون، جا ئەگەر دەرچوون واجب بێت، ئەوا نوێژكە لەپێشترە بۆ واجب بوون، هەروەك شاراوە نیە، جا ئەوەی هەق بێت ئەوەیە كە واجب بێت نەك تەنها سوننەت بێت و هیچی تر، لەو بەڵگانەی كە واجبێتی دەگەیەنێ ئەوەیە كە واجبێتی نوێژی جومعە لادەبات ئەگەر هەردووكیان لەیەك رۆژدا كۆببوونەوە[603].

پێشەوا شەوكانی دەڵێ: بزانن كە ئەو بەردەوام بوونەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەسەر نوێژی جەژنەكان و وازنەهێنانی نوێژی هیچ جەژنێ لە جەژنەكان، فەرماندانی بە پیاوان و ئافرەتان بۆ چوونەدەر بۆی... ئەمانە هەر هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی كە نوێژی جەژن واجبە و واجبێكی عەینیە نەك كیفایە، واتە لەسەر هەموو تاكێكی موسڵمان واجبە ئەگەر كۆمەڵێك كردیان لەسەر كۆمەڵێكی تر لادەچێت[604].

---

602– أخرجه ابن أبي شيبة: ٢/ ٢، والبيهقي: ٣/ ٣١٥ بإسناد صحيح.

603– تمام المنة: (١/ ٣٤٤).

604 – سيل الجرار: (١/٣١٥).

٤- (الله اكبر)نەكردن بەدەنگی بەرز لەپێش نوێژدا:

واجبە لەسەر موسڵمان سووربێ لەسەر سونتەتی خۆشەویست صلی الله علیه وسلم بەدەنگی بەرز (الله اکبر) بکات، چونکە وتنی بەدەنگی بەرز فەرمودەی صەحیحی لەسەر هاتووە.

بەڵام دەبینین زۆربەیان بەبێ دەنگی لەماڵ دەردەچن و تەکبیر ناکەن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

**لێرەدا مەبەست تەکبیر کردن نیە بەکۆمەڵ –خەڵك بەیەك دەنگ (الله اکبر) بکەن– بەڵکو مەبەست ئەوەیە بەتەنیا (الله اکبر) بکەن، هەرکەس بۆ خۆی... چونکە تەکبیرکردنی بەکۆمەڵ لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نەکراوە.**

٥- بانگ و قامەت بۆ نوێژی جەژن:

ئەو شوێنانەی کە دوورن لە زانایان و زانیاری و خەڵك شارەزاییان نیە - سەرپێچی و بیدعەیان تێدا بڵاودەبێتەوە- یەکێك لەو بیدعەو سەرپێچیانەش ئەوەیە بۆ نوێژی جەژن بانگ دەدەن و قامەت دەکەن.. ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

لە جابری کوڕی سەمورەوە هاتووە، کە وتویەتی: (**صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْعِيدَ غَيْرَ مَرَّةٍ، وَلاَ مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ، وَلاَ إِقَامَةٍ**)[605]. واتە: لەخزمەت پێغەمبەری خوادا صلی الله علیه وسلم نوێژی دوو جەژنەکەم کردووە زیاتر لەجارو دووجار بەبێ بانگ و قامەت.

لە ئیبن عەباس و جابیرەوە هاتووە فەرمویانە: (**لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَلاَ يَوْمَ الأَضْحَى**). (متفق علیه). واتە: بۆ نوێژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان نە بانگ دەدرا نە قامەت دەکرا.

پێشەوا (مسلم) لە (عطاء)ەوە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (**أَخْبَرَنِي جَابِرٌ: أَنْ لاَ أَذَانَ لِلصَّلاَةِ يَوْمَ الْفِطْرِ حِينَ يَخْرُجُ الإِمَامُ وَلاَ بَعْدَ مَا يَخْرُجُ، وَلاَ إِقَامَةَ، وَلاَ نِدَاءَ، وَلاَ شَيْءَ لاَ نِدَاءَ يَوْمَئِذٍ وَلاَ إِقَامَةَ**)[606].

---

[605]- أخرجه مسلم: (٢/٧)، والترمذي: ٥٣٢/٢، وأحمد: (٥/ ٩١).

[606]- أخرجه البخاري: (٢/ ٩٦٠) ومسلم: (٢/٥) وأحمد: (٥/ ١٠٧).

واتە: جابیر بۆی گێڕامەوە کاتێ پێشنوێژ دەردەچوو لە نوێژی جەژنی ڕەمەزاندا بانگ نەدەدرا، وە دوای ئەوەی کە دەردەچوو نەبانگ درا نەقامەت دەکرا لەو کاتەدا هیچ شتێ نەدەکرا نەبانگ نەقامەت.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: فەرمودەکانی ئەم باسە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە بانگ و قامەت شەرعی نین بۆ نوێژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان... پێشەوا (عراقی) دەڵێ: کردەوەی هەموو زانایانە. (ابن قدامە) لەکتێبی (المغنی)دا دەڵێ: هیچ ناکۆکیەك نابینین لە نێوان ئەوانەی کە بایەخ بۆ خیلافیان دادەنرێت[٦٠٧].

**٦- نوێژکردن لەپێش نوێژی جەژن و دوای نوێژ:**

زۆر لە نوێژخوێنان کاتێ گەیشتنە شوێنی نوێژی جەژن دوو ركات نوێژی سوننەت دەکەن، هەروەها لەدوای نوێژی جەژن دوو ركاتی تریش دەکەن. ئەمەش پێچەوانەی سوننەتە، چونکە سابت نەبووە لە پێغەمبەرەوە صلى الله علیە وسلم کە لەپێش و لەدوای نوێژی جەژنەوە نوێژی کردبێت.

لە ئیبن عەباسەوە ڕەزای خوایان لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (خَرَجَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَوْمَ عِيدٍ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهُمَا وَلَا بَعْدَهُمَا...(رَوَاهُ الْجَمَاعَةُ). واتە: پێغەمبەر صلى الله علیە وسلم کاتێ چوو بۆ نوێژی جەژن تەنها دوو ركات نوێژی کرد، ئیتر نە لە پێشیەوە نە لە دوایەوە نوێژی تری نەکرد. (رَوَاهُ الْجَمَاعَةُ) جگە لە (التِّرْمِذِي) و (ابن ماجه) ئەمەشیان بۆ زیاد کردووە: (ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَبِلَالٌ مَعَهُ فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَجَعَلَتْ الْمَرْأَةُ تَصَدَّقَ بِخُرْصِهَا وَسِخَابِهَا)[٦٠٨]. واتە: پاشان دەهات بۆ لای ئافرەتان و بیلالی لەگەڵ بوو، فەرمانی پێ دەکردن کە لە ماڵ و سامانیان ببەخشن، ئینجا ئافرەتان ملوانکە و گوارەکانیان دەبەخشی.

---

[607] – نيل الأوطار: (٣/ ٣٥١).

[608] – أخرجه البخاري: (٢/ ٩٨٩) ومسلم: (٢/ ١٣).

له ئیبن عومەرەوە هاتووە: کە چووە بۆ نوێـژی جـەژن نـە لـەپێش نوێـژی جەژنـەوە نـە لـە دوایەوە هیچ نوێـژی نـەکردووە، دەیفـەرموو: پێغەمبـەر صـلی اللە علیـە وسـلم بـەو شـێوەی کردووە[609].

پێشەوا بوخاری لە ئیبن عەباسەوە دەیگێڕێتەوە دەفەرموێت: نوێژکردنی لەپێش نوێژی جەژنەوە پیێ باش نەبووە.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: فەرمودەکانی ئەم باسە بەڵگەن لەسەر ئەوەی نوێژکردن لـەپێش نوێژی جەژن و لەدوای نوێژەوە کەراهەتی هەیە، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل راو بۆچـوونی لەسەر ئەمەیە، ئیبن قدامە دەڵێ: ئەمە مەزهەبی ئیبن عەباس و ئیبن عومەرە.

پێشەوا (زهري) دەڵێ: لە هیچ یەکێ لە زاناکانم نەبیستووە کە باسی ئـەوە بکـات یـەکێ لە سەلەفی ئەم ئومەتە نوێژی کردبێ لەپێش نوێژی جەژن و لەدوای نوێژەوە.

پێشەوا (حافظ) لە (الفتح)دا دەڵێ: پوختەی قسە ئەوەیە سابت نەبووە کـە لـەپێش نوێـژی جەژن و لەدوای نوێژەوە سوننەت هەبێت، ئەمەش پێچەوانەی رەئی ئەوانەیە کە لەگەڵ نوێـژی جومعەدا قیاسی دەکەن. بەڵام (مطلق النفل) سابت نەبووە کە قەدەغە کرابێت، مەگەر کاتی کەراهەت بێ لە هەموو رۆژەکاندا... تەواو[610].

**٧- وتەکەیان: (الصلاة جامعة):**

ئەمەش سەرپێچیەکی باوە لە نوێژی جەژندا ئەویش ئەوەیە ئەگەر کاتی نوێژ هات پێشنوێژ هاوار دەکات و دەڵێ: (الصلاة جامعة). واتە: نوێژ دابەسترا بە جەماعەت.

ئەوەش ئێوەو ئەوەی لەوبارەوە هاتووە و رەدەکەی:

پێشەوا (زهري) دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم لە نوێژی دوو جەژنەکـەدا فەرمانی دەکرد بە بانگبێژ بڵێ: (الصلاة جامعة).

---

609– أخرجه الترمذي: ٢/٥٣٨، وأحمد: ٢/ ٥٧.

610 – نيل الأوطار: (٣/٣٥٨– ٣٥٩).

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرموده (مرسل ضعيف)ە واتە ناکرێتە بەڵگە چونکە لاوازە، هەندێك قیاسی دەکەن لەگەڵ نوێژی خۆرگیراندا، کە سابت بووە وتەی: (الصلاة جامعة) تیایدا.

بەرپەرچ دراوەتەوە بەوەی قیاس لەسەر دەق ناکرێت بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم چەندەها جار لەبەرچاوی کۆمەڵێ لە هاوەڵانیدا نوێژی جەژنی کردووە، لێیەوە نەیان گێڕاوەتەوە کە فەرمانی کردبێ بە بانگدان و بانگەوازی تر بۆ جەژن، بەڵکو (عطاء) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: (أَخْبَرَنِي جَابِرٌ: أَنْ لاَ أَذَانَ لِلصَّلاَةِ يَوْمَ الْفِطْرِ حِينَ يَخْرُجُ الإِمَامُ وَلاَ بَعْدَ مَا يَخْرُجُ، وَلاَ إِقَامَةَ، وَلاَ نِدَاءَ، وَلاَ شَيْءَ)[٦١١]. (أخرجه مسلم). واتە: جابیر بۆی گێڕامەوە کاتێ پێشنوێژ دەردەچوو لە نوێژی جەژنی ڕەمەزاندا بانگ نەدەدرا، وە دوای ئەوەی کە دەردەچوو نەبانگ درا نەقامەت دەکرا لەو کاتەدا هیچ شتێ نەدەکرا[٦١٢].

ئەمە بەگشتی نەفی وتەکەیان دەکات: (الصلاة جامعة)، لەوبارەوە پێشەوا (إبن قدامه) دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵەکانمان دەڵێن: بانگەوازی بۆ دەکرێ، واتە بۆ جەژن: (الصلاة جامعة). ئەمەش قسەی پێشەوا شافیعیە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لەپێشترە کە شوێنی بکەوین[٦١٣].

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کاتێ دەگەیشتە شوێنی نوێژی جەژن یەکسەر دەستی دەکرد بە نوێژکردن بەبێ ئەوەی بانگ بدرێ یان قامەت بکرێ بۆی، وە نەشیان دەوت: (الصلاة جامعة)، سوننەت ئەوەیە: هیچ شتێکی لەو جۆرە نەکرێت[٦١٤].

---

611– أخرجه البخاري: (٢/ ٩٦٠) ومسلم: (٥/٢) وأحمد: (٥/ ١٠٧).

612 – مسلم بشرح النووي: (٦/ ١٧٦).

613 – المغني: (٢/ ٢٣٦).

614– زاد المعاد: (١/ ٤٤٢).

**٨- وتنی(الله اکبر) بە دەنگی بەرز لەلایەن مەئموکانەوە:**

ئەمەش لەو هەڵانەیە کە پێشتر لەباسی نوێژدا بەگشتی و بە هەموو جۆرەکانیەوە باسمان لێوە کردووە... ئەم کردەوەیە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: بەڵام بەنهێنی تەکبیر کردن سوننەتە بۆ بێجگە لە پێشنوێژ، ئیتر مەئموم بێت یان بەتەنیا نوێژ بکات، لانی کەمی نهێنیش ئەوەیە خۆی بیبیستێت ئەگەر گوێی ساغ و سەلامەت بێ، نەیکات بە ژاوەژاو، ئەمەش گشتیە بۆ خوێندن و تەکبیرکردن، تەسبیح لە رکوعدا، وە لە تەحیات و سەلام دانەوەو پاڕانەوەدا جا ئیتر واجبەکانیان بێت یان سوننەتەکانیان[٦١٥].

**٩- بەرزکردنەوەی دەستەکان لەکاتی تەکبیردا:**

زۆر لە پێشنوێژەکان ئەم هەڵەیە دەکەن، بەڵکو نوێژخوێنانیش بەهەمان شێوە لەکاتێکدا کە دەستەکانیان بەرزدەکەنەوە لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەك لە تەکبیرەکانی نوێژی جەژندا... چونکە ئەمە سوننەت و رێبازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم نیە.

شێخ ئەلبانی لە ڕەدی ئەوانەدا کە دەڵێن: دەست بەرزدەکەنەوە لەهەموو تەکبیرەیەکدا سوننەتە، وتەکەی دەربارەی تەکبیر لە نوێژی جەژندا: (سوننەتە... بەرزکردنەوە دەستەکان لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەکدا).

دەڵێت: راستی ئەوەیە بوترێ سوننەت نیە. لەبەر ئەوەی شتی وەها لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت نەبووە، وە ئەگەر لە عومەر و کوڕەکەیەوە ریوایەت کرا بێت ئەوە نابێتە بەڵگە، بەتایبەت کە ریوایەتی عومەر و کوڕەکەی لێرەدا صەحیح نیە، چونکە ئەوەی عومەر (بیهقی) بە سەنەدی لاواز(ضعیف) گێڕاویەتیەوە، ئەوەی کوڕەکەی تا ئێستا لێی نەکۆڵاومەتەوە، پێشەوا مالیك فەرموویەتی: هیچم لەبارەیەوە نەبیستووە، سەیری (الإرواء) ژمارە: (٦٤٠) بکە[٦١٦].

---

615 – المجموع: (٣/ ٢٩٥).

616– تمام المنة: (ص: ٣٤٨- ٣٤٩).

## ١٠- وتەی زیکری نێوان تەکبیرەکان واجبە:

زۆر لە نوێژخوێنان بیروباوەڕیان وایە خوێندنی هەندێ لە زیکرەکان لە نێوان تەکبیرەکاندا واجبە... لەگەڵ ئەوەشدا ئەم وتەیە پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە هەرگیز لەوەوە سابت نەبووە.

شێخ (محمود خطاب السبکی) دەڵێ: ماوە خستنە نێوان هەموو دوو تەکبیرەیەك لە تەکبیرەی جەژندا شتێکی ڕەوایە بەقەدەر ئەوەندە کە مەئموم بتوانێ (الله أکبر) بکات بۆ ئەوەی هەڵە ڕونەدات، حەنەفیەکان و مالیك و ئەوزاعی پێیان وایە زیکری سوننەت نیە لە نێوان تەکبیرەکاندا، چونکە ئەگەر سوننەت بوایە بۆیان دەگێڕاینەوە وەك چۆن تەکبیرەکانیان بۆ گێڕاوینەتەوە.

پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد دەڵێن: زیکرکردن لەنێوان تەکبیرەکانی جەژندا شتێکی ڕەوایە وەك ئەوەی بڵێ: "سبحان الله، والحمد لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر". یان بڵێ: "لا إله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" سلاوات بدات لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە نێوان هەموو دوو تەکبیرەیەکدائەگەر پێی خۆش بوو با بڵێ: "الله أكبر كبيرا، وسبحان الله بكره وأصيلا" ئەم (أثر مضطرب)ە لە ئیبن مەسعودەوە دەکەنە بەڵگە بۆ خۆیان، جمهوری زانایان بە پێویستیان نەزانیوە[٦١٧].

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: "زیکری دیاریکراو لە نێوان تەکبیرەکانی جەژندا لەوەوە لەبەر نەکراوە"[٦١٨].

بەڵام ئەوەی لە ئیبن مەسعودەوە ڕەزای خوای لێ بێ دەگێڕنەوە: (من قوله وفعله أنه كان يحمد الله ويثني عليه ويصلي على النبي صلى الله عليه وسلم)[٦١٩]. واتە: لە وتەو کردەوەیەوە، کە ئەو (الحمد لله) ستایشی خوای کردووە و سلاواتی داوە لەسەر پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و لە نێوان تەکبیرەکاندا. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕەوایە نەك واجب.

---

617– الدين الخالص: (٤/ ٣٣٧).

618– زاد المعاد: (١/ ٤٤٣).

619– رواه البيهقي والطبراني بسند صحيح – إرواء الغليل: (١١٤/٣).

### ١١- دەست پێكردنی وتار بە(الله اكبر):

زۆر لە بانگخواز و وتارخوێنەكان وتاری جەژن بە(الله اكبر) دەست پێدەكەن، لەگەڵ ئەوەدا كە پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم.

بێگومان وتەكەی (عبيدالله كوڕی عبدالله كوڕی عتبه) تابيعی دەكەنە بەڵگە بۆ خۆیان كە دەفەرموێ:" سوننەت وایە وتاری جەژن بە نۆ(الله اكبر)ی یەك لەدوای یەك دەست پێ بكرێت، دووهەمجار بە حەوت (الله اكبر)ی بەدوای یەكدا".

پێشەوا ئیبن قەیم ڕەدی ئەمەی داوەتەوە دەڵێ: وتەی زۆربەی فوقەهاكان كە دەڵێن: "دەست پێكردنی وتاری نوێژە بارانە بە (استغفر الله)كردن و وتاری دوو جەژنەكەش بە (الله اكبر) هیچ بەڵگەیەكی لە سوننەتدا لەسەر نیە، بەڵكو سوننەت پێچەوانەی ئەمەیە، ئەویش ئەوەیە هەموو وتارێ بە (الحمد لله) ستایشی خوا دەست پێ دەكرێت، وەك دەزانیت وتەكەی (عبيدالله كوڕی عبدالله)ی تابيعی كە دەڵێ: (من السنه). نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی كە سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلى الله عليه وسلم وەك لە زانستی (الأصول)دا بڕیاری لەسەر دراوە"[٦٢٠].

### ١٢- خوێندنەوەی دوو وتار:

ئەمەش هەڵەیەكی گەورەیە چونكە لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم سابت نەبووە، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لەكاتی خوێندنەوەی وتاری جەژندا دانیشتبێت (وەك ڕۆژی جومعە).

پێشەوا نەوەوی لە (الخلاصه)دا دەڵێ: ئەوەی لە ئیبن مەسعودەوە دەیگێڕنەوە كە فەرموویەتی: " سوننەت ئەوەیە لە نوێژی جەژندا دوو وتار بخوێنرێت و بەكەمێ دانیشتن ماوە بخرێتە نێوانیان (ضعيف) لاوازە، فەرمودەكە (متصل)نیە وە لەبارەی دووپات كردنەوەی وتارەكەدا هیچ شتێ سابت نەبووە"[٦٢١].

---

620 – نيل الأوطار: (٣/ ٣٦٣).

621 – فتح القدير: (١/ ٤٢٨).

جابر دەڵێ: (شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الصَّلاَةَ يَوْمَ الْعِيدِ فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ ثُمَّ قَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى بِلاَلٍ فَأَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَحَثَّ عَلَى طَاعَتِهِ وَوَعَظَ النَّاسَ وَذَكَّرَهُمْ ثُمَّ مَضَى حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ فَوَعَظَهُنَّ)[٦٢٢].

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوا صلی اللە علیە وسلم نوێژی هەردوو جەژنەکانم کردووە بەبێ بانگ و قامەت لەپێش وتاردا نوێژی دەکرد، پاشان دەستی خستە سەرشانی بیلال و هەستایەوە، فەرمانی دەکرد بە لە خوا ترسان و هانی دەدەن بۆ فەرمانبەرداری و ئامۆژگاری دەکردن و وە بیری دەهێنانەوە و پاشان رۆشت هەتا لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن[٦٢٣].

ئەمەش بەڵگەیەکی روون و ئاشکرایە کە لە پێغەمبەرەوە صلی اللە علیە وسلم سابت نەبووە کە لە جەژندا دوو وتاری دابێت وە لەنێوانیاندا دانیشتبێت.

---

622– أخرجه البخاري: (٢/ ٣٧٧) ومسلم: (٨٨٥).

623– أخرجه البخاري: (٣٧٧/٢) ومسلم: (٨٨٥).

# سەرپێچییەکان لە نوێژی جومعەدا

## ١- وازهێنان لە نوێژی جومعە:

هەندێ کەس گوێ نادەن بەکاروباری دینەکەیان وازدەهێنن لە نوێژی جومعە لە مزگەوتدا لەماڵەوە چوار رکات نوێژی نیوەڕۆ دەکەن.. ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی زۆری نەزانینە بەوەی کە چەندە خێرو پاداشتی گەورەی هەیە هەروەها نەزانین بەوەی کە چەندە گوناهی دەگات ئەو کەسەی تەرکی دەکات.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (لَيَنتَهِنَّ أَقوامٌ وَدْعِهِـم الجُمعـات، أو ليختِمَنَّ اللهُ عَلى قُلُوبِهِم ثُمَّ لَيكونَنَّ مِن الغافِلين)[٦٢٤]. واتە: ئەوانەی وازیان لە نوێژی جومعە هێناوە کۆتایی دێنن بەو کارەیان، یان خوای گەورە مۆر دەنێ بەسەر دڵیاندا، پاشان دەیانخاتە ریزی بێ ئاگایانەوە.

وە دەفەرموێت: (مَنْ تَرَكَ ثَلاث جُمُعَاتٍ، مِنْ غَيرِ عُذْرٍ كُتِبَ مِنَ الْمُنَافِقِين)[٦٢٥]. واتە: هەر کەسێ سێ جومعە لەسەریەك بەبێ بەهانەیەکی شەرعی و پێویست واز لە نوێژی جومعە بهێنێ لە ریزی مونافیقەکان ناوی دەنوسرێت.

هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ تَرَكَ ثَلَاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِـهِ)[٦٢٦]. واتە: هەر کەسێ سێ جومعە لەسەریەك واز لە نوێژی جومعە بهێنێ لەکاتێکدا بەسوك سەیری بکات ئەوە خوای گەورە مۆر دەدا لەسەر دڵی[٦٢٧].

پێشەوا (عراقی) دەڵێ: مەبەست لەمۆر دەدا لەسەر دڵی چونکە بووە بە دڵی مونافیق.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: وتەکەی (تَهَاوُنًا) ئەوەی لێ وەردەگیرێ ئەو مۆرەی باسکرا

---

[624]- أخرجه مسلم وأحمد والنسائي عن ابن عباس – صحيح الجامع: (٥٤٨٠).

[625]- رواه الطبراني في الكبير عن أسامة بن زيد – صحيح الجامع: (٦١٤٤).

[626]- رواه أحمد والترمذي والنسائي عَنْ أَبِي الْجَعْدِ- صحيح الجامع: (٦١٤٣).

[627]- تێفکرە ئەی برای بەڕێزم چۆن خوای گەورە سێ سزای داناوە بۆ ئەو کەسەی کە تەرکی نوێژی جومعە دەکات: یەکەم: ئەو کەسە لەریزی بێ ئاگایانە، دووەم: لەریزی دووڕووەکانە، سێیەم: مۆر دەدرێ لە دڵی.

دەدرێت لەسەر دڵی کەسێك کە بەسوکی سەیری بکات و واز لە نوێژی جومعە بهێنێ[628].

دەی ئیتر تێ فکرەو بیربکەرەوە ئەی ئەو کەسەی کە بە قەستی و بەبێ بەهانەیەکی شەرعی واز لە نوێژی جومعە دەهێنی.

**٢- بیروباوەڕ بەوەی کە خوێندنی سورەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ السجدة، ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ الإنسان: ١. واجبە بخوێنرێن لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان بیروباوەڕیان وایە خوێندنی ئەم دوو سورەتە واجبە لە نوێژی بەیانی جومعەدا، ئەمەش تێگەیشتنێکی هەڵەیە، چونکە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیە وسلم ئەوە سابت بووە کە خوێندوویەتی، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بەردەوام بوویێت لەسەری، ئەگەر بەو شێوەیە بوایە ئەوەشیان بۆ دەگێڕاینەوە.

لە ئەبو هورەیرەوە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (أَنّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ،كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاةِ الصُّبْحِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ [الم تَنْزِيلُ] وَ [وَ هَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ][629]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سورەتی سورەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ ی دەخوێند.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: ئەم فەرمودانە ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە سونەتە خوێندنی سورەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾.

پێشەوا (عراقی) دەڵێ: لەوانەی ئەم کارەیان کردووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم (عبد الله کوڕی عباس)، لە تابعین ئیبراهیمی کوڕی (عبدالرحمن)ی کوڕی عەوف ئەمەش مەزهەبی شافیعی و ئەحمەد و هاوەڵانی فەرمودەناسە.

ئەوانەی لەوبارەوە قسەیان کردووە ڕایان جیاوازە لەسەر خوێندنی سورەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾ و ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا کە ئایا ڕەوایە پێشنوێژ سورەتێکی تر بخوێنێ لە جیاتیدا کە سەجدەی تێدا بێت و سەجدە ببات یان نا؟

---

628- نيل الأوطار: (٣/٢٦٦).

629- أخرجه البخاري: (٢/ ٨٩١) ومسلم: (٢/ ٦٥) الجمعة.

پێشەوا نەوەوی لە (الروضة من زوائده: ٤٢/ ٢ ٠٤- ٢ ٠ ٥)دا دەڵێ: ئەگەر بیەوێت ئایەتێ یان دوو ئایەت بخوێنێ کە سەجدەی تێدابێت بەمەبەستی سەجدەبردن، لەوبارەوە هیچ وتەیەکم نەبیستووە لە هاوەڵەکانمان، تەنانەت لەسەر کەراهەتیشی سەلەف رایان جیاوازە. (شیخ ابن عبد السلام) فەتوای لەسەر ئەوە داوە کە قەدەغەیەو نوێژ پوچەڵ دەکاتەوە[630].

پرسیار کرا لە ئیبن تەیمیە رەحمەتی خوای لێ بێ دەربارەی سەجدەی نوێژی بەیانی رۆژی جومعە کە ئایا بەردەوامی لەسەری واجبەیان نا؟

ئەویش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: سوپاس بۆ خوا خوێندنی سورەتی: ﴿الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ﴾.

کە لە سورەتی سەجدەدایە وە ئەو سورەتانەی تریش کە سەجدەیان تێدا دەبرێت واجب نین لە نوێژی بەیانی رۆژی جومعەدا بخوێنرێن بەیەکدەنگی پێشەوا شەرعزانەکان، ئەوەی باوەڕی وەها بێت کە واجبە یان سەرزەنشت و زەمی ئەوانە بکات کە وازیان لێ هێناوە ئەوە گومڕایە و بەهەڵەدا چووە پێویستە لەسەری تەوبە بکات و پەشیمان ببێتەوە بەیەکدەنگی پێشەوا شەرعزانەکان. پاشان فەرمووی: پێویست بە بەردوام بوون ناکات لەسەری بۆ ئەوەی نەزانەکان وا گومان نەبەن کە واجبە و ئەوەی وازی لێ بهێنێ پێی گوناهبار دەبێت، بەڵکو پێویستە هەندێ جار تەرك بکرێت لەبەر واجب نەبوونی. خوای پەروەردگاریش زاناترە.

شێخی پایەبەرزی ئیسلام ئیبن تەیمیە دەڵێ: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم هەردوو سورەتەکەی بەتەواوی خوێندووە بۆیە خوێندنیان بە تەواوی سونەتە.

**٣- وازهێنان لە خۆشتن و بۆنی خۆش لەخۆدان:**

دەبینین زۆر لە نوێژخوێنان کەمتەرخەمی دەکەن لەم سونەتانەدا کە خۆشەویست صلى الله عليه وسلم هانی موسڵمانانی داوە لەسەریان.. لە ئەبو سەعیدەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: (غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ ، وَالسِّوَاكُ ، وَأَنْ يَمَسَّ مِنْ الطِّيبِ مَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ)[631].

---

630– نيل الأوطار: (٣/٣٣٠).

631– أخرجه البخاري: (٢/٨٧٩) مختصرا – ومسلم: (٢/ ٥-٧) جمعة.

واته: خۆشتن له رۆژی جومعەدا واجبه لەسەر هەموو موسڵمانێکی باڵغ، وه سیواك کردن و چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات.

له ئبن عومەرەوه رەزای خوایان لێ بێ هاتووه، کـه وتویـەتی: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ). واته: ئەگەر کەسێکتان هات بۆ نوێـژی جومعـه بـا خـۆی بـشوات. لـه ریوایـەتی پێشەوا (مسلم)دا هاتووه، کـه وتویـەتی: (إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْتِيَ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ)[٦٣٢]. واتـه: ئەگەر کەسێکتان ویستی بڕوات بۆ نوێژی جومعه با خۆی بشوات.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: فەرمودەکه بەڵگەیه لەسەر ئەوەی که خۆشتن له رۆژی جومعەدا شەرعیه، خەڵك رایان جیاوازه لەمـەدا، پێـشەوا نـەوەوی دەڵـێ: لـه کۆمـەڵێ لـه سـەلەفەوه گێڕاویانەتەوه که واجبه، ئەوانیش گێڕاویانەتەوه له هەندێ له هـاوەڵانی پێغەمبـەرەوه صلی الله علیه وسلم، (ظاهریەکان) رایـان لەسـەر ئەمەیـه. (ابـن المنـذر) لـه پێشەوا مالیکـەوه گێڕاویەتیەوه، (خطابي) له (حسن البصري)ی و مالیکەوه گێڕاویەتیەوه.

جمهوری زانایانی (السلف والخلف) پێشین و پاشین و فوقاهای وڵاتان راوبۆچوونیان لەسـەر ئەوەیه که موستـەحەبه. (القاضـي عیـاض) دەڵـێ: ئەمـه ناسراوه لـه مەزهـەبی مالیـك و هاوەڵەکانیدا[٦٣٣].

حیکمەت له سوننەتی سیواك کردن و خۆشتن و بۆنی خـۆش لـەخۆدان و پۆشـاکی جـوان و پاکوخاوێن لەبەرکردن له رۆژی جومعەدا لەبەر ئەوەیه که نوێژخوێن حاڵەتێکی تـەواو و چـاك و پاکوخاوێنی هەبێ و ئازاری کەس نەدرێت، چونکه مەلائیکه لەسەر دەرگای مزگەوتەکانـدا رادەوەستن ناوی ئەو کەسانه دەنوسن که یەك لەدوای یەك دێن بۆ مزگـەوت بگـره تەوقەشـیان لەگەڵ دەکەن[٦٣٤].

---

632– أخرجه البخاري: (٨٧٧/٢) ومسلم: (١/ ١) جمعة.

633– نيل الأوطار: (٢٩٠/١).

634– الدين الخالص: (١٣٢/٤).

٤- قورئان خوێندن له بڵندگۆی مزگەوتەکاندا پێش نوێژی جومعە:

ئەمەش بیدعەیەکی داهێنراوە و لەسەردەمی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانیدا رەزای خوایان لێ بێ نەبووە.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەنگ بەرزکردنەوەی له مزگەوتدا قەدەغەکردووە با بە قورئان خوێندنیش بێت، چونکە هەرکەس بۆ خۆی خەریکی پەرستشەو لەگەڵ پەروەردگاریدا موناجات دەکات هەیانە نوێژ دەکات هەیانە یادی خوا دەکات هەشیانە فێری فەرمودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەبێت...هتد.

قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لەو کاتەدا دەبێتە تەشویش و ژاوەژاو لەسەر خەڵکانی مزگەوت بەڵکو لەسەر دراوسێکانی مزگەوتیش.

٥- پێش وەخت ئامادەنەبوون بۆ نوێژی جومعە:

زۆر له نوێژخوێنان وا راهاتوون دوای ئەوەی وتارخوێن سەرکەوتە سەر مینبەر ئەوکات دەچن بۆ مزگەوت یان لەکاتێ دەست پێکردنی نوێژدا یا لە ڕکاتی دووهەمدا... ئەمانەش هەر هەموویان بێبەش بوونە لەخێرو پاداشتی پێش وەخت ئامادەبوون.

پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم سەبارەت بەو پاداشتە گەورەیە دەفەرموێت: (من غسَّلَ يَومَ الجُمعَةِ واغسلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابتَكرَ، وَمَشى وَلَم يَرْكب، ودنا مِن الإمام، وَاسْمَع ولم يَلغُ، كان لَهُ بِكُل خُطوةٍ عَمَلُ سَنة أجْرُ صِيامِها و قِيامِها)[٦٣٥]. واتە: هەر کەسێك لە رۆژی جومعەدا خۆیشوات و پێش وەخت ئامادە بێت بۆ نوێژ، بە پیادە بڕوات نەك بە سواری، لە نزیك پێشنوێژەوە دانیشێت، گوێ بگرێت بەبێ دەنگی و قسەی نابەجێ نەکات، بۆ هەموو هەنگاوێکی خێر و پاداشتی ساڵێك شەونوێژی بۆ دەنوسرێت کە لە رۆژەکەیدا بە رۆژوو بوو بێت.

هەروەها پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلاَئِكَةٌ يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِى يُهْدِى الْبَدَنَةَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى بَقَرَةً ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الْكَبْشَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الدَّجَاجَةَ ثُمَّ كَالَّذِى يُهْدِى الْبَيْضَةَ)[٦٣٦].

---

635- رواه أحمد عن أوس ابن أوس – صحيح الجامع: (٤٦٠٥).

636- اخرجه مسلم عن أَبِي هُرَيْرَةَ: (٢٤) كتاب الجمعة.

واتە: ئەگەر رۆژی جومعە بوو، لەسەر هەر دەرگایەك لـە دەرگاکـانی مزگـەوت مـەلائیکـە رادەوەستن ناوی ئەو کەسانە دەنوسن کە یەك لەدوای یەك لەپێش خەڵکەوە دێن بۆ مزگـەوت، کاتێ پێشنوێژ دێت و دادەنیشێت ئیتر مەلائیکەکان تۆمارەکانیان دەپێچنەوە، دێن گـوێ لـە یادی خوا دەگرن، نمونەی ئەو کەسەی کەزوو دێت بۆ مزگەوت وەك کەسێك وایە کە وشترێکی کردبێ بەخێر، پاش ئەو وەك کەسێك وایە کە مانگایەکی کردبـێ بـەخێر، پـاش ئـەویش وەك کەسێك وایە کە بەرانێکی کردبێ بەخێر، پـاش ئـەویش وەك کەسـێك وایـە کـە مریـشکێکی کردبێ بەخێر، پاش ئەویش وەك کەسێك وایە کە هێلکەیەکی کردبێ بەخێر.

ئەی بێبەش لەو خێرو پاداشتە خۆت لەبیر نەکەی هەوڵ بدە پـێش وەخـت ئامادەبـە ئـەو خێرو پاداشتە گەورە لەدەست خۆت مەدە... خوا پشتیوانت دەبێ و پاداشتت دەداتەوە.

**٦- وازهێنان لە خوێندنی سورەتی (الکهف):**

زۆر لە نوێژخوێنان بێ ئاگان لە خوێندنی سورەتی کەهف لە شەو یـان لـە رۆژی جومعـەدا، لەگەڵ ئەوەدا کە خوێندنی رەوایە و خێرو پاداشتێکی گەورەی هەیە راستگۆ و بەراست زانراو هەواڵی داوە و لەکاتێکدا کە دەفەرموێت: (مَنْ قَرَأَ سُوْرَةَ الْكَهْف يَوْمَ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ النُّور مَـا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْت الْعَتِيْق)[٦٣٧]. واتە: هەر کەسێك رۆژی جومعـە سـورەتی کـەهف بخـوێنێ دەبێتـە نوورو روناکی بۆی لە نێوان ئەو جومعەو جومعەکەی تر بە شەوەکان و رۆژەکانیەوە.

هـەروەها دەفـەرموێت: (مَنْ قَرأَ سورة الكَهف يَومُ الجُمعه أَضَاءَ لَهُ مِنَ النور مابين الجمعتين)[٦٣٨]. واتە: هەر کەس رۆژی جومعە سورەتی کەهف بخوێنێ دەبێتە نوورو روناکی بۆی لەنێوان ئەو جومعەو جومعەکەی تردا.

وە دەفەرموێت: (مَنْ قَرأَ سورةَ الكهفِ في يومِ الجمعةِ سُطِعَ له نورٌ من تحتِ قَدَمِـه إلى عنـانِ السماءِ، يضيءُ له يومَ القيامةِ، وغُفِرَ له ما بين الجمعتين)[٦٣٩]. واتە: هەر کەسێك لە رۆژی جومعـەدا سورەتی کەهف بخوێنێ لەژێر پێیەوە رۆشناییەك پەیدا دەبێت هـەتا لای ئاسمـانی بـۆ روونـاك دەکاتەوە لە تاوانی نێوان ئەو دوو جومعەیەی دەبووری.

---

637- رواه البيهقي في الشعب عَنْ أَبِي سَعِيْدِ الْخُدْرِيِّ – صحيح الجامع: (٦٤٧١).

638- رواه الحاكم والبيهقي في السنن عَنْ أَبِي سَعِيْدِ – صحيح الجامع: (٦٤٧٠).

639- رواه البيهقي: (٣/ ٢٤٩) والحاكم في المستدرك: (٢/ ٨٦٣) بسندٍ ضعيف.

**٧- وازهێنان له سڵاواتدان له ڕۆژی جومعه‌دا:**

پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم ده‌فه‌رموێت: (إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ)[٦٤٠]. واته: له چاكترین ڕۆژه‌كانتان ڕۆژی جومعه‌یه، ئاده‌می تێدا دروستكراوه، له ڕۆژی جومعه‌دا ڕۆحی كێشراوه، وه تێیدا فوو ده‌كرێت به‌كه‌ڕنادا، وه تێیدا هه‌موو گیانداران ده‌مرن، جا ئێوه زۆر سڵاواتم له‌سه‌ر بده‌ن له‌م ڕۆژه‌دا، چونكه سڵاواته‌كانتان نیشانم ده‌درێت...

كه‌چی له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌دا ده‌بینین زۆر له موسڵمانان بێ ئاگان له سڵاواتدان له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم كه هۆی ڕزگاربوون و ده‌رهێنانی ئوممه‌ت بوو له تاریكی هاوه‌ڵ بۆ خوا بڕیاردان و تاوانه‌وه بۆ ڕووناكی یه‌كتاپه‌رستی و گوێڕایه‌ڵی.

**٨- له ڕۆژی جومعه‌دا زیاتر له‌بانگێ ده‌درێت:**

زۆر له نوێژخوێنان لایان وایه بۆ نوێژی جومعه سوننه‌ته دووجار بانگ بدرێت... ئه‌مه‌ش بیدعه‌یه‌كی داهێنراوه هیچ بنه‌مایه‌كی نیه.

به هیچ شێوه‌یه له شێوه‌كان ئێمه ناتوانین به‌راوردی ئه‌مه بكه‌ین له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی كه عوسمانی كوڕی عه‌ففان ڕه‌زای خوای لێ بێ، ئه‌و بانگه‌ی له عوسمان زیادی كرد له‌سه‌ر (الزوراء) دووربووه له مزگه‌وته‌وه و بۆ ئه‌وه بووه كه ئه‌وانه‌ی له بازاردا بوون ئاگادار بن كاتی نوێژه، به‌ڵام ئه‌و دوو بانگه‌ی له‌سه‌ربانی مزگه‌وته‌كان ده‌درێ یان یه‌كێكیان له سه‌ربانی مزگه‌وت و ئه‌وی تریشیان له‌ناو مزگه‌وتدا ده‌درێ (ئه‌وه) پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌یه كه له‌سه‌رده‌می پێغه‌مبه‌ر صلى الله عليه وسلم و ئه‌بوبه‌كر و عومه‌ردا كراوه ڕه‌زای خوایان لێ بێ، هه‌روه‌ها له‌سه‌رده‌می عوسمانیشدا ڕه‌زای خوای لێ بێ- ئه‌و مه‌به‌سته‌ی كه له پێناویدا سه‌رووه‌رمان عوسمان بانگی زیادكردووه ئه‌وه‌بووه كه ئه‌وانه‌ی گوێیان له‌بانگ نه‌بوو له‌سه‌ربانی مزگه‌وته‌وه گوێیان له‌بانگ بێت- له‌م سه‌رده‌مه‌دا ئه‌وه نیه... به‌هۆی بڵندگۆی مزگه‌وته‌كانه‌وه خه‌ڵك له‌ده‌ره‌وه‌ی گوێیان له‌بانگ ده‌بێت.

---

[640]– رواه أحمد وأبو داود عن أوس ابن أوس – صحيح الجامع: (٢٢١٢).

(لەبەرئەوە) چاك وایە لە رۆژی جومعەدا یەكجار بانگ بدرێت لە دەرەوەی مزگەوتدا هەروەك لەسەردەمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و ئەبوبەكر و عومەردا بەو شێوەیە بووە.

پێشەوا شافیعی لە (الأم)دا دەڵێ: پێم خۆشە بانگی رۆژی جومعە لەكاتێكدا بێت كە پێشنوێژ دێتە مزگەوت و لەو شوێنەی خۆی كە وتاری تێدا دەدات دادەنیشێت، ئیتر منبەر بێت یا شوێنێكی بەرز یان زەوی بێت، كاتێ دانیشت بانگبێژ بانگ بدات، كاتێ لە بانگ بوویەوە وتارخوێن هەستێ بۆ وتاردان لێی زیاد نەكرێت، وە پێم باشە یەك بانگبێژ بانگ بدات ئەگەر لەسەر مینبەر بێ نەك كۆمەڵێ بانگبێژ[641].

فەرمودەكان بەڵگەن لەسەر ئەوەی لە رۆژی جومعەدا تەنها یەك بانگ دراوە لەدەرەوەی مزگەوت ئەویش لەكاتێكدا بووە كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەسەر مینبەر دادەنیشت، هەروەها لەسەردەمی ئەبوبەكر و عومەریشدا رەزای خوایان لێ بێ بەو شێوەیە بووە[642].

لە (سائب كوڕی یزید)ەوە هاتووە، كە وتویەتی: (ما كان لرسول الله صلى الله عليه و سلم إلا مؤذن واحد. إذا خرج أذن وإذا نزل أقام. وأبو بكر وعمر كذلك . فلما كان عثمان وكثر الناس زاد النداء الثالث على دار في السوق يقال لها الزوراء . فإذا خرج أذن وإذا نزل أقــام)[643]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم تەنها یەك بانگبێژی هەبوو كاتێ دەردەچوو بانگی دەدا، كاتێ دادەبەزی قامەتی دەكرد، لەسەردەمی ئەبوبەكر و عومەریشدا بەو شێوەیە بووە، بەڵام لەسەردەمی عوسماندا خەڵك زۆربوون بانگی سێهەم زیادیكرد لەسەر ماڵێ لە بازاڕ پێیان دەوت: (الزوراء)، كاتێ دەردەچوو بانگ دەدرا، كاتێ دادەبەزی قامەت دەكرا.

---

641– الأم: (١/١٧٢–١٧٣) وقت الأذان للجمعة.

642– الدين الخالص: (٤/١٥١–١٥٢).

643– أخرجه البخاري: (٩١٢ ،٩١٣ ،٩١٥ ،٩١٦).

٩- وازهێنان له نوێژی دیاری مزگەوت لەکاتی وتاردا:

زۆر له نوێژخوێنان وازدەهێنن له نوێژی سەوقاتی مزگەوت، هەیه کاتێ پێشنوێژ وتاردەدات دێت بۆ مزگەوت، دادەنیشێت گوێ دەگرێت له وتارەکە دوو رکات نوێژی چوونه مزگەوت ناکات، ئەمەش هەڵەیه.

چونکه له پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم سابت بووه که فەرمانی کردووه بەو کەسەی دێته مزگەوت دوو رکات نوێژ بکات تەنانەت ئەگەر دانیشتبێ فەرمانی پێکردووه که هەستێ ئەو دوو رکات نوێژه بکات.

له جابری کوڕی (عبدالله)وه رەزای خوای لێ بێ هاتووه، کە وتویەتی: (جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَخْطُبُ فَجَلَسَ فَقَالَ لَهُ: يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا – ثُمَّ قَالَ – إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا)[٦٤٤]. واته: رۆژی جومعه سولەیك هات پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم وتاری دەدا، سولەیك پێش ئەوەی نوێژ بکات دانیشت، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێی فەرموو: ئەی سولەیك هەسته دوو رکات نوێژ بەکورتی بکه، پاشان فەرمووی: کاتێ کەسێکتان رۆژی جومعه دێته مزگەوت پێشنوێژ وتاری دەدا، با دوو رکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت بەڵام بەکورتی بیکات.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودانه هەموویان بەڵگەی روون و ئاشکران بۆ مەزهەبی پێشەوایان شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاق و فوقەها فەرمودەناسەکان، ئەو کەسەی رۆژی جومعه چووه مزگەوت پێشنوێژ وتاری دەدا سوننەته دوو رکات نوێژی چوونه مزگەوت بکات، کەراهەتی هەیه دانیشێت پێش ئەوەی ئەو دوورکات نوێژه بکات، وه سوننەته بەکورتی بیکات بۆ ئەوەی دوای نوێژەکە گوێ له وتارەکە بگرێت.

---

644- أخرجه مسلم: (٥٩) كتاب الجمعة.

هەروەها ئەم فەرمودانە ئەوەیان لێ وەردەگیرێت کە قسەکردن دروستە لەکاتی وتاردانـدا لەبەر پێویستی، بۆ وتارخوێن و جگە لەویش. وە ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە فەرمان بەچاکە و رێنیشاندان بۆ بەرژەوەندی لەهەموو حاڵەت و جێگایەکدا دروستە، ئەوەیان لێ وەردەگیرێ کە نوێژی چوونە مزگەوت دوو رکاتە، سوننەتی رۆژەکـان دوو رکـاتن، نوێـژی چـوونە مزگـەوت بەدانیشتن نافەوتێت لە حەقی ئەو کەسانەدا کە نەزانن بە حوکمەکەی، لای هاوەڵەکانی ئێمـە بەدانیشتن دەفەوتێت، وە ئەمە تایبەتە بە کەسێ کە بزانێ سوننەتە، بـەڵام بـۆ کەسـی نـەزان لەهەر کاتێکی نزیکدا دەتوانێت بیکات بەپێی فەرمودەکە[٦٤٥].

بەڵام ئەوەی فەرمودەکـەی ئـیبن عومـەر رەزای خوایـان لـێ بـێ دەکـات بـە بەڵگـە کـە دەفەرموێت: (إذا دخل أحدُكم المسجدَ والإمامُ على المنبرِ فلا صلاةَ ولا كلامَ حتى يفرغَ الإمامُ)[٦٤٦]. واتە: کاتێ کەسێکتان رۆژی جومعە چووە مزگەوت پێشنوێژ لەسەر مینبەر بوو، نوێژکردن و قسەکردنی بۆ نیە هەتا پێشنوێژ وتارەکەی تەواو دەکات. ئەم فـەرمودە زۆر لاوازە (ضـعیف جدا) چونکە (أیوب کوڕی نهیك)ی تێدایە فەرمودەی لێ وەرناگیرێت.

**١٠- داهێنانی دوو رکات نوێژی پێش جومعە:**

ئەم سەرپێچیە لەناو موسڵماناندا بڵاوبۆتەوە.

هەندێ ئەم فەرمودەیان کردووە بە بەڵگە لەسەر مەشروعیەتی سوننەتی دوو ڕکات نوێژی پێش جومعە: (ما من صلاة مفروضة إلا وبين يديها ركعتان)[٦٤٧]. واتە: هـیچ نوێـژێکی فـەرز نیـە ئیللا دوو ڕکات نوێژی سوننەتی لەپێشەوە دەکرێت.

(بوصـیری) لـەدوای باسـکردنی فەرمودەکـە دەڵـێ: ئەمـەش چـاکترین بەڵگەیـە کـە دەهێنرێتەوە بۆ ئەو بـەناو سـوننەتەی جومعـە، دەڵـێ: وە ئەمـەش ناگونجـاوە لەگـەڵ نوێـژی پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم، لەبەرئەوە لە نێوان بـانگ و قامەتـدا وتاردانـە ئـەو کاتە نوێژ لە نێوانیاندا نیە[٦٤٨].

---

645 – مسلم بشرح النووي: (٦/ ٢٣٤).

646– أخرجه الطبراني كما في مجمع الزوائد (٢/١٨٤) قال الهيثمي : فيه أيوب بن نهيك وهو متروك ، ضعفه جماعة أخرجـه مـسلم: (٥٩) كتاب الجمعة.

647– رواه ابن حبان: (٦١٥) والدارقطني: (٩٩) بسند صحيح، سلسلة الصحيحة: (١/ ٤١١).

648– سلسلة الصحيحة: (٢٣٢).

نوێژی جومعە سوننەتی لەپێشەوە نیە، کاتی ئەو سوننەتە نیە، سابت نەبووە لـ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاوەڵانیەوە ڕەزای خوایان لێ بێ کە کردبێتیان، بەڵکا سوننەتی دوای نوێژی جومعە سابت بووە لە مزگەوت بێ یان لەماڵ بێگومان لەماڵەو چاکترە، ئەویش دوو ڕکات یان چوار ڕکاتە.

بەڵام بەنیسبەت ئەوەی کە نوێژی جومعە سوننەتی هەیە دەڵێین: سوننەتی جومعە لەدوای جومعەوەیە بە بەڵگەی ئەم فەرموودە کە (مسلم) دەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خـ صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی: (إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيُصَلِّ بَعْدَهَا أَرْبَعًا)[٦٤٩]. واتە: هـە کەسێکتان نوێژی جومعەی کرد لە دوایەوە چوار ڕکات نوێژی سوننەت بکات.

هەروەها (مسلم) دەیگێڕێتەوە کە ئیبن عومەر وتویەتی: (أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّ كَانَ لاَ يُصَلِّي بَعْدَ الْجُمُعَةِ حَتَّى يَنْصَرِفَ فَيُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ فِي بَيْتِهِ)[٦٥٠].

واتە: عادەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم وابوو لەمزگەوت نوێژی جومعەی دەکرد ئیتر نوێژی تری نەدەکرد هەتا دەهاتەوە بۆ ماڵ، لەماڵەوە دوو ڕکات نوێژی دوای جومعەی دەکرد.

لەم دوو فەرموودەوە دەردەکەوێت کە سوننەتی دوای نوێژی جومعە دوو ڕکاتە یان چوا ڕکات، بەڵام سوننەتی پێش نوێژی جومعە سابت نەبووە، خوای پەروەردگار زاناترە[٦٥١].

**١١- دانیشتن لەڕیزی دواوە بۆ کەسێ کە زوو ئامادەبووبێ:**

هەندێ لە نوێژخوێنان ئەگەر یەکێ لەوان ڕۆژی جومعە زوو ئامادەبوو لە مزگەوتدا، پێش وەخت ئامادەبێ بەڵام لەڕیزی دواوە دادەنیشێت... ئەمەش پێچەوانەی فەرمان و سوننەتی پێغەمبەری خوایە صلی الله علیه وسلم، چونکە لەدەستدانی خێر و پاداشتی نزیک بوونەوەی لە پێشنوێژ... لەکاتێکدا کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هانمان دەدات بۆ ئەنجامدانی بە فەرمودەیە: (ودنا من الإمام). واتە: نزیک بێتەوە لە پێشنوێژ.

---

649– رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ عَنْ يَحْيَى بْنِ يَحْيَى.

650– رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الصَّحِيحِ عَنْ يَحْيَى بْنِ يَحْيَى.

651– السنة والبدعة: (١/١٤٧-١٤٩).

هەروەها لەدەستدانی خێر و پاداشتی ریزی یەکەمە، بەپێی ئەم فەرمودەیە: (لَو يَعلَمونَ مَافِي الصَّف الْمُقَدَّم، مَاكَانَت إلاّ قرْعَةٌ)[٦٥٢]. واتە: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە خێری ریزی پێشەوە چەندە گەورەیە، بۆ کەس نەبوو بچێتە پێشەوە هەتا تیروپشکیان بۆ نەکردایە.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: ئەوەی یەکەم کەس بڕواتە مزگەوت، بچێتە ریزەکانی ترەوە و نەچێتە ریزی یەکەم، ئەوە پێچەوانەی سوننەت جوڵاوەتەوە، لەگەڵ ئەوەدا ئەگەر نوێژەکەی تەواو نەبێ و قسەی زیادە یان مەکروە یا حەرام بکات، کە پێویستە مزگەوتی لێ پارێزراو بێت ئەوە وازی هێناوە لە بەرزڕاگرتنی دروشمەکانی شەریعەت[٦٥٣].

**١٢- هەنگاونان بەسەر خەڵکدا:**

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیە باوانەی کە بڵاوبۆتەوە لەناو موسڵماناندا -مەگەر کەسێك خوا رەحمی پێکردبێ- بێگومان پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەمەی قەدەغەکردووە.

لە (عبدالله کوڕی بسر)ەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فَقَالَ: اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ وآنَيْتَ)[٦٥٤]. واتە: رۆژێکی جومعە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا، پیاوێك هات هەنگاوی نا بەسەر خەڵکدا پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: دانیشە دوادەکەویت و ئازاری خەڵکیش دەدەی.

وە دەفەرموێت: (مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ ... ثُمَّ رَاحَ فَلَمْ يُفَرِّقْ بَيْنَ اثْنَيْنِ فَصَلَّى مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ إِذَا خَرَجَ الْإِمَامُ أَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)[٦٥٥]. واتە: هەرکەسێك رۆژی جومعە خۆی بشوات ... پاشان بچێت بۆ مزگەوت و دوو کەس لەیەك جیانەکاتەوە بە هەنگاونان بەسەریاندا، ئینجا ئەوەندەی کەبۆی دانراوە نوێژ بکات و گوێ لە وتاری پێشنوێژ بگرێت، ئیللا خوا لەو گوناهانەی خۆشدەبێت کە لەنێوانی ئەو جومعەیە و جومعەکەی پێشوودا هەیبووە.

---

[652]- أخرجه مسلم وابن ماجة عن أبي هريرة – صحيح الجامع: (٥٢٦٤).

[653]- الفتاوى الكبرى: (٢/١١٤).

[654]- رواه أحمد وأبو داود والحاكم والبيهقي بسند صحيح.

[655]- أخرجه البخاري: (٩١٠).

پێشەوا شەوكانی دەڵێ:زانایان لە حوكمی هەنگاونان بەسەر خەڵكدا رایان جیاوازە، پێشەوا (ترمذي) لە زانایانەوە دەگێڕێتەوە كە هەنگاونانیان بەسەر خەڵكدا بە مەكروە زانیوەو زۆر توندیان گرتووە.

(أبو حامد) دەربارەی حەرامی هەنگاونان بەسەر خەڵكدا لە پێشەوا شافیعیەوە دەگێڕێتەوە، پێشەوا نەوەوی لە (زوائد الروضة)دا دەڵێ:وتەی هەڵبژاردە ئەوەیە كە حەرامە بە بەڵگەی فەرمودە صەحیحەكان. هەواڵەكانی پێشەوا ئەحمەد دەڵێن تەنها كەراهەتی هەیە. (عراقی) لە (كعب الأحبار)ەوە دەگێڕێتەوە هاتووە، كە وتویەتی: وازهێنان لە جومعەم پێ خۆشترە هەتا هەنگاونان بەسەر خەڵكدا.

پێشەوا (عراقی) دەڵێ: حەرامی و كەراهەتی هەنگاونان بەسەر خەڵكدا پێشنوێژ و كەسێك ناگرێتەوە كە بەینێ هەبێ و بە هەنگاونان نەبێ نەیگاتێ، پێشەوا نەوەوی لە (الروضة)دا بڕیاری لەسەر ئەمەداوە، لە (شرح المهذب)دا دەڵێ: ئەگەر رێگا نەبوو بۆ گەیشتنە میحراب ئیللا بە هەنگاونان نەبێ ئەوە كەراهەتی نیە، چونكە زەرووری و پێویستە، وێنەی ئەمەش دەگێڕنەوە لە پێشەوا شافیعیەوە[٦٥٦].

لە عوقبەی كوڕی (حارث)ەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: (صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بِالْمَدِينَةِ الْعَصْرَ فَسَلَّمَ ثُمَّ قَامَ مُسْرِعًا فَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ إِلَى بَعْضِ حُجَرِ نِسَائِهِ فَفَزِعَ النَّاسُ مِنْ سُرْعَتِهِ فَخَرَجَ عَلَيْهِمْ فَرَأَى أَنَّهُمْ عَجِبُوا مِنْ سُرْعَتِهِ فَقَالَ ذَكَرْتُ شَيْئًا مِنْ تِبْرٍ عِنْدَنَا فَكَرِهْتُ أَنْ يَحْبِسَنِي فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ)[٦٥٧]. واتە: جارێ لە مەدینە لەدوای پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم نوێژی عەسرم كرد، كە سەلامی دایەوە بەپەلە هەستاو هەنگاوی نا بەسەر خەڵكدا و رۆشت بۆ ماڵی یەكێك لە هاوسەرەكانی، پاشان كە هاتەوە روانی خەڵكەكە سەیریان دێ لە پەلەكردنەكەی، فەرمووی: ئەوە بۆیە وامكرد شوشەیە زێڕمان لەلا هەیە جا حەزم نەكرد لەماڵی مندا ئێوارەی بەسەردا بێت، یان شەوی بەسەردا بێ، پێم وتن دابەشی بكەن بەسەر هەژاراندا.

---

656- نيل الأوطار: (٣٠١/٣).

657- رواه البخاري: (٨٥١/٢) والنسائي: (٨٤/٣).

### ١٣- نوێژی دیاری مزگەوت دوای بانگ یان لەنێوان دوو وتارەکەدا:

هەندێ لە نوێژخوێنان کاتێ ڕۆژی جومعە چوونە مزگەوتەوە لەو کاتەدا بانگبێژ بانگی دەدا چاوەڕێ دەکەن هەتا بانگ تەواو دەبێت، پاشان نوێژی چوونە مزگەوت دەکەن. ئەمەش هەڵەیە چونکە بەوە سوردەبن لەسەر سوننەتی (وتنەوەی بانگ) و کەمتەرخەمی دەکەن لە واجبدا (کە گوێگرتنە لە وتاری جومعە). بۆیە لەسەریەتی لەگاتی بانگەکەدا دوو ركات نوێژی چوونە مزگەوت بکات و دانیشێت بۆ گوێگرتن لە وتاری جومعە. هەندێکیان ئەگەر بینیان وتارخوێن وتار دەدات بەبێ ئەوەی نوێژی چوونە مزگەوت بکەن دادەنیشن کاتێ وتارخوێن لەنێوان دوو وتارەکەدا بۆ حەوانەوە دانیشت ئەو کاتە هەڵئەسنەوە دوو ركات نوێژی چوونە مزگەوت دەکەن، ئەمەش هەر هەڵەیە چونکە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا) [٦٥٨].

واتە: کاتێ کەسێکتان هات بۆ مزگەوت ڕۆژی جومعە پێشنوێژ وتاری دەدا، با دوو ڕكات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت بەڵام بەکورتی بیکات.

پێشەوا شەوکانی دەڵێ: (وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا).ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئەو نوێژە سوننەتە بەکورتی بکرێت، بۆ ئەوەی گوێ لەوتار بگیرێت[٦٥٩].

بەڵام وتەی هەندێکیان کە دەڵێن: کاتێك نوێژخوێن چووە مزگەوت و دانیشت ئەوە نوێژی چوونە مزگەوتی لەدەست دەچێت، ئەمە ڕاست نیە فەرمودەکەی سولەیك ئەمە ڕەد دەکاتەوە.

لە جابری کوڕی (عبدالله)وە ڕەزای خوای لێ بێ هاتووە، کە وتویەتی: (جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَخْطُبُ فَجَلَسَ فَقَالَ لَهُ: يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا..)[٦٦٠]. واتە: ڕۆژی جومعە سولەیك هات پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم وتاری دەدا، سولەیك پێش ئەوەی نوێژ بکات دانیشت، پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێی فەرموو: ئەی سولەیك هەستە دوو ڕكات نوێژ بکە بەکورتی.

---

658- أخرجه مسلم: (٢/ ٤٥-٥٧) الجمعة- وأحمد: (٢٩٧/٣).

659- نيل الأوطار: (٣٠٧/٣).

660- أخرجه مسلم: (٥٩) كتاب الجمعة.

هەرکە سولەیك دانیشت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێکرد کە هەستێ دوو رکات نوێژ بکات.

**١٤- قسەکردن لەکاتی وتاردا:**

زۆر لە نوێژخوێنان کەوتونەتە ئەم هەڵەوە لەئەنجامی نەزانی زۆرەوە بە سوننەتی پاك و بێگەرد لە بەڵێن و پەیمانەکانی و بەوەی هاتووە دەربارەی خێر و پاداشتی ئەو کەسانەی کە بەبێدەنگی گوێ لەوتاری جومعە دەگرن، وە بەوەی هاتووە دەربارەی ئەو سزاو تۆڵەیەی کە دانراوە بۆ ئەو کەسانەی قسەی نابەجێ و پڕوپوچ دەکەن و گوێ لە وتاری جومعە ناگرن.

پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ وَدَنَا مِنَ الإمَامِ وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ وَلَمْ يَلْغُ كانَ لَهُ بِكُلِّ خَطْوَةٍ يَخطُوهَا مِنْ بَيْتِهِ إلَى المَسْجِدِ عَمَلُ سَنَةٍ أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا)[٦٦١]. واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشوات و پێش وەخت ئامادە بێت بۆ نوێژ، بە پیادە بڕوات نەك بە سواری، لە نزیك پێشنوێژەوە دانیشێت بەبێ دەنگی و قسەی نابەجێ نەکات، بۆ هەموو هەنگاوێکی خێرو پاداشتی ساڵێك شەونوێژی بۆ دەنوسرێت کە لە ڕۆژەکەیدا بە ڕۆژوو بوو بێت.

هەروەها دەفەرموێت: (إذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ وَالْإمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ)[٦٦٢]. واتە: ئەگەر لەکاتی وتاری جومعەدا بە هاوەڵەکەت بڵێی بێدەنگ بە ئەوە قسەی نابەجێ و پڕوپوچت کردووە و خێری جومعەکەت نامێنێ.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرموودە نەهی دەکات لە هەموو جۆرە قسەیەك لەکاتی وتارداندا[٦٦٣].

لە (عبدالله)ی کوڕی عەمری کوڕی (عاص)ەوە هاتووە، کە وتویەتی: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَمَسَّ مِنْ طِيبِ امْرَأَتِهِ إنْ كَانَ لَهَا وَلَبِسَ مِنْ صَالِحِ ثِيَابِهِ ، ثُمَّ لَمْ يَتَخطَّ رِقَابَ النَّاسِ ، وَلَمْ يَلْغُ عِنْدَ الْمَوْعِظَةِ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهُمَا، وَمَنْ لَغَا وَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ كَانَتْ لَهُ ظُهْرًا)[٦٦٤].

---

[661]– رواه أحمد والترمذي أوس بن أوس – صحيح الجامع: (٦٤٠٥).

[662]– أخرجه البخاري: (٢/٣٩٤)، ومسلم: (٦/١١) جمعة.

[663] – مسلم بشرح النووي: (٦/١٩٦–١٩٧).

[664]– رواه أبو داود وابن خزيمة في صحيحه– صحيح الترغيب والترهيب: (٧٣٢).

واتە: هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشوات، چەندیش بتوانێت بۆنی خۆش لەخۆی بدات لەو بۆنەی کە ژنەکەی هەیەتی لەماڵەوە، پۆشاکی جوان و پاکوخاوێنی لەبەر بکات، هەنگاو نەنێت بەسەر خەڵکدا، لەکاتی وتاردا قسەی نابەجێ نەکات، دەبێتە کەفارەتی ئەو گوناهانەی کە لەنێوانی ئەو جومعەیە و جومعەکەی پێشوودا هەیبووە، بەڵام ئەوەی قسەی نابەجێ بکاو هەنگاو بنێت بەسەر خەڵکدا ئەوە بەس نوێژی نیوەڕۆی بۆ دەنوسرێت.

پێشەوا ئیبن حەجەر دەڵێ: دەگونجێ و مومکینە گشتێتی فەرمانی بێدەنگ بوون تایبەت بکرێت بە کارێك لەبەرژەوەندی گشتیدا بێت، وەك چۆن هەندێکیان وەڵامدانەوەی سەلامیان تایبەت کردووە لەبەر واجبی، خاوەنی کتێبی (المغنی) یەکدەنگی زانایانی لەوبارەوە نقلّ کردووە لەسەر ئەوەی هەر قسەیەك لەکاتی نوێژکردندا دروست بێت لەکاتی وتاریشدا دروستە وەك ئاگادارکردنەوەی کوێر هەتا نەکەوێتە ناو بیرێکەوە[٦٦٥].

**١٥- ئاوگێڕان و کۆکردنەوەی خێر لەکاتی وتاردا:**

هەندێ لە نوێژخوێنان لەکاتی وتاردا بەناو خەڵکدا ئاودەگێڕن... هەندێکی تریان سندوقی خێر دەگێڕن و خەڵك هان دەدەن بۆ خێرکردن و خێر کۆدەکەنەوە... سێهەم بەنێوانیاندا بە بخوردێکەوە دەڕوات!!

ئەمانەش هەر هەموویان پێچەوانەی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خودان صلی الله علیه وسلم، چونکە ئەمەش لەو شتە نابەجێیانەیە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم قەدەغەیکردوون لەم فەرمودەیدا: (واستمع ولم یلغ). واتە: گوێ بگرێت بەبێ دەنگی و قسەی نابەجێ نەکات. بەڵکو ئەو کەسەی ئەم کارە دەکات هەنگاویش دەنێت بەسەر نوێژخوێناندا و دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵك لە قسەی وتارخوێن تێنەگەن و سەرقاڵ بن بەوانەوە کە بەبەردەمیاندا تێپەڕ دەبن.

---

665 – فتح الباري: (٤٨٢).

### ١٦- سیواك كردن و زۆر جوڵان لەكاتی وتاردا:

ئەمەش یەكێكی ترە لەو سەرپێچیانەی كە باوە لەناو زۆر لە مزگەوتەكاندا - مەگەر كەسێك خوا رەحمی پێ كردبێت- پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم قەدەغەیكردووە دەفەرموێت: (مَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا)[٦٦٦]. واتە: ئەوەی دەست بدات لە وردە بەرد ئەوە نابەجێیی كردووە و خێری جومعەكەی نامێنێ.

### ١٧- دانیشتن بە شێوەی (الإحتباء)[٦٦٧] كاتێك وتارخوێن وتار دەدات:

لە (معاذ)ی كوڕی ئەنەسەوە رەزای خوای لێ بێ هاتووە، كە وتویەتی: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ نَهَى عَنْ الْحَبْوَةِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ)[٦٦٨]. واتە: پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم دانیشتنی بە شێوەی (الإحتباء) قەدەغەكردووە كاتێك كە وتارخوێن وتار دەدات لە رۆژی جومعەدا.

(ابن الأثیر) لە (النهایة)دا دەڵێ: (الإحتباء) بریتیە لەوەی ئینسان هەردوو پێی بلكێنێ بە سكیەوەو بە قوماشێك توندیان بكات لەگەڵ پشتیدا، بێگومان دەشبێت بەدەستی (الإحتباء) بكات لە جیاتی قوماش. پاشان دەڵێ: لەسەر قەدەغەكردنی ئەم فەرموده هاتووە: (أَنَّهُ نَهَى عَنِ الحِبْوَةِ يَومَ الجُمعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ).

قەدەغەیكردووە چونكە دەبێتە هۆی خەولێكەوتن و نەبیستنی وتارەكە و نەمانی دەستنوێژ[من النهایة لإبن الأثیر].

ئەمەو لەگەڵ ئەوەشدا كە پێشتر باسكرا هەندێ جار دەبێتە هۆی دەركەوتنی عەورەت بەتایبەتی ئەگەر لەژێرەوە پۆشاكی كورتی لەبەردا بێت[٦٦٩].

---

[666]– رواه ابن ماجة عن أبي هريرة– صحيح الجامع: (٧٣٧).

[667]- (إحتباء) بريتيـة لة طرتنى هةردوورودةست بة شيَوةيةكى بازنةيي لةطةلَ داناني هةردوورثيَ و نوساندني بة رِان و سنطةوة يان نزيك لة سنط.

[668]– رواه أحمد وأبو داود والترمذي – صحيح الجامع: (٦٨٧٦).

[669] – نقلا من مختصر مخالفات الطهارة والصلاة: (ص: ١٠٧–١٠٨).

### ١٨- سڵاواتدان بەدەنگی بەرز لەکاتی وتاردا:

ئەمەش یەکێکی ترە لەو سەرپێچیە باوانەی لەناو نوێژخوێندا دەبینرێت بەزۆری لە رۆژی جومعەدا. کاتێك وتارخوێن ناوی پێغەمبەری صلی الله علیه وسلم برد دەبینین بەدەنگی بەرز سڵاواتی لەسەر دەدەن..وە ئەگەر ناوی یەکێك لە هاوەڵانی برا بەدەنگی بەرز دەڵێن: رەزای خوی لێ بێ.

ئەم کارە پێچەوانەی رێنمایی پێشینە پیاو چاکەکانە ئەوانە ئەم کارەیان نەکردووە.. هەروەها فەرمودەکان فەرمان بەبێدەنگی دەکەن لەکاتی وتاردا، بێگومان پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەفەرموێت: (إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ والإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَنْصِتْ، فَقَدْ لَغَوْتَ)[٦٧٠]. واتە: لەکاتی وتاری جومعەدا ئەگەر بڵێی بە هاوەڵەکەت بێدەنگ بە ئەوە خۆت بەشتی پڕوپوچەوە خەریك کردووە، خێری جومعەکەت نامێنێ.

### ١٩- پاسەوانی پاشاکان لەکاتی نوێژی جومعەدا:

یەکێك لەکارە هەرە خراپەکان پاسەوانی کردنی ئەمیر یان پاشا یا سەرۆکە لەکاتی نوێژی جومعەدا بەچەکەوە بەبێ ئەوەی نوێژ بکەن لەگەڵ نوێژخوێناندا، وەك ئەوەی بۆ پاسەوانی بەندەیە لە بەندەکان دروستکرابن، وە تەکلیفی گوێڕایەڵی پەروەردگاریان لەسەر نەبێت، ئەم فەرمودەی پێغەمبەریان صلی الله علیه وسلم نەبیستبێت: (لاَ طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللّهِ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ)[٦٧١]. واتە: نابێت گوێڕایەڵی لە نافەرمانی خوادا بکرێت، بەڵکو دەبێت لەچاکەدا گوێڕایەڵی بکرێت.

### ٢٠- دەستهێنان بە وتارخوێندا دوای ئەوەی لەسەر مینبەر دادەبەزێ:

هەندێ کەسی نەزان دەسدەهێنن بە وتارخوێندا دوای ئەوەی لەسەر مینبەر دادەبەزێ، دەستهێنان دروست نیە ئیللا بە بەردە رەشەکەی کەعبەدا نەبێت، دەستهێنان بە جگە لەویش بیدعەیە[٦٧٢].

---

[670]- متفق عليه عن أبي هريرة- صحيح الجامع: (٧٣٧).

[671]- الدين الخالص: (٣١٢/٤).. والحديث متفق عليه عن علي.

[672]- الدين الخالص: (٣١١/٤).

### ٢١- هەزار جار خوێندنی سورەتی (الإخلاص):

خاوەنی کتێبی (الدين الخالص) باسی کۆمەڵێك بیدعەی رۆژی جومعەی کردووە لەوانە هەزار جار خوێندنی سورەتی (الإخلاص)ە لە رۆژی جومعەدا، ئەمەش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، فەرمودەی: (من قرأ قل هو الله أحد ألف مرة، فقد أشترى نفسه من الله)[٦٧٣]. واتە: هەرکەس هەزار جار (قل هو الله أحد) بخوێنێ ئەوکەسە خۆی لە خوای گەورە کڕیوەتەوە. (هەڵبەسراوە).

### ٢٢- دواکەوتنی تازە زاوا لە نوێژی جومعە و جەماعەت:

یەکێکی تر لەو سەرپێچیە باوانەی لەناو نوێژخوێندا بڵاوبۆتەوە (باوەڕبوونە) بەوەی تازە زاوا ئەگەر هاوسەرەکەی کچ بوو ئەوا بۆی هەیە هەتا هەفتەیەك نەچێت بۆ جومعە و جەماعەت، بەڵام ئەگەر بێوەژن بوو هەتا سێ رۆژ بۆی هەیە، ئەم فەرمودەیان کردووە بە بەڵگە: (لِلْبِكْرِ سَبْعٌ، وَلِلثَّيِّبِ ثَلاثٌ)[٦٧٤]. واتە: بۆ کچ حەوت رۆژ، وە بۆ بێوەژن سێ رۆژ.

لەڕاستیدا ئەمە هەرگیز نابێتە بەڵگە لەسەرئەوە، پێشەوا بوخاری مانای ئەمەی روون کردۆتەوە سەرباسێکی داناوە بەناوی (باسی ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا) فەرمودەیەکی (موقوف)ی لە ئەنەسەوە گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (من السّنة إِذا تزوج الْبكر عَلَى الثّيِّب أَقَامَ عِنْدهَا سبعا وَقسم، وَإِذا تزوج الثّيِّب أَقَامَ عِنْدهَا ثَلَاثًا ثُمَّ قسم)[٦٧٥]. واتە: سوننەتە ئەگەر تازە زاوا کچی هێنا بەسەر بێوەژندا حەوت رۆژ لەلای بمێنێتەوە ئینجا دابەشی بکات، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچدا سێ رۆژ لەلای بمێنێتەوە پاشان دابەشی بکات.

تەنها یەك بەڵگە نەهاتووە لەسەرئەوە کە تازە زاوا وازبهێنێ لە نوێژی جومعە و جەماعەت.

---

[673]– الدين الخالص: (٤/٣١٤). والحديث أخرجه الخياري في فوائده عن حذيفة. وفي سنده مجاشع الكذاب وحجاج بن ميمون البصري منكر الحديث. فلا يعول عليه ولا يعمل به. وقال الألباني موضوع في ضعيف الجامع: (٥٧٧٦).

[674]– أخرجه البخاري: (٥٢١٣/٥٢١٤)، ومسلم: (١٤٦١).

[675]– أخرجه البخاري: (٥٢٦٤) موقوفا عن أنس.

(ئاگاداری): كەراهەتی هەیە دواكەوتن لە نوێژی جەماعەت ئیتر حەوت رۆژ بێت یان سێ رۆژ وە باقی كردەوە چاكەكانی تریش كە پێشتر دەیكردن، دەقی قسەی پێشەوا شافیعی لەسەرە و پێشەوا (رافِعِيّ) دەڵێ: ئەمە بۆ رۆژ، بەڵام بۆ شەو نا، چونكە لەبەر خاتری سوننەت واز لە واجب ناهێنرێت، هاوەڵان فەرمویانە: بۆ دەرچوون بۆ جەماعەت و كارە چاكەكان پیاو دەبێت لەنێوان دوو ژنەكەیدا وەكو یەك هەڵسوكەوت بكات یان لەشەوی هەردوو ژنەكەیدا دەرچێت یان لەشەوی هیچیاندا دەرنەچێت، حەرامە ئەگەر فەرقیان بخات لەمەدا، ئەمە لە عوزری وازهێنان لە جەماعەت دەژمێرێت. (اِبْن دَقِيق الْعِيـد) دەڵێ: هەندێ لە فوقەهاكان زیادەڕەویان كردووە كە مانەوەی لای بوكیان بە عوزر داناوە بۆ لەكۆڵ كەوتنی نوێژی جومعە، وەڵامی داوەتەوە بەوەی كە ئەمە قیاسی وتەی ئەو كەسانەیە كە دەڵێن مانەوە لەلای بوك واجبە، ئەوە قسەی پێشەوا شافیعیە[٦٧٦].

**٢٣- گەیاندنی نوێژی جومعە بە نوێژی دوای خۆی بەبێ ماوە و قسەكردن:**

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: سوننەتە نوێژی فەرز و سوننەت لە نێوانیاندا ماوە هەبێت لە جومعەو جگە لە جومعەیشدا، هەروەك لە فەرمودەی صحیحدا سابت بووە و هاتووە: (أنه صلى الله عليه و سلم نهى أن توصل صلاة بصلاة حتى يفصل بينهما بقيام أو كلام). واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم گەیاندنی نوێژێكی بەنوێژێكی تر قەدەغەكردووە هەتا ماوە نەخرێتە نێوانیان بەهەستانەوە یان بەقسەكردن. ئەوەی نەدەكرد كە زۆربەی خەڵك دەیكەن. سەلام دانەوە دەگەیەننە ركاتی یەكەمی نوێژی سوننەت، حیكمەتی ئەم قەدەغەكردنە لەلایەن پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم بۆ ئەوەیە جیاوازی بكرێت لەنێوان نوێژی فەرز و نوێژی سوننەتدا، وەك چۆن جیاوازی دەكرێت لەنێوان عیبادەت و جگە لە عیبادەتدا. [مجموع الفتاوى: (٢٤/٢٠٢- ٢٠٣].

---

676 – فتح الباري: (٩/٢٢٦).

### ٢٤- نوێژی نیوەڕۆ لەدوای جومعەوە:

ئەم بیدعەیەش زۆر لە نوێژخوێنان تێی کەوتون چونکە پێیان وایە نوێژی جومعە بەر نوێژی نیوەڕۆ ناکەوێت!!!

(زین الدین)ی کوڕی نەجیم دەڵێ: ئەوەی لەم ڕۆژگارەدا لەدوای نوێژی جومعە نوێژی نیوەڕۆ دەکاتەوە ئەوە کارێکی زۆر ناشیرین دەکات، چونکە ئەوە بیروباوەڕی نەزانەکانە ئەوانە نوێژی جومعە بەفەرز نازانن بۆیە لەدوای نوێژی جومعە نوێژی نیوەڕۆ دەکەنەوە، پێیان وایە ئەوە فەرزە جومعە فەرز نیە، لە ئەنجامدانیدا تەمەڵی دەکەن کەواتە ئەحتیات ئەوەیە وازی لێ بهێنرێت[٦٧٧]. واتە لە نوێژی نیوەڕۆ، شتێکی شاراوە نیە کە پاککردنەوەی دڵی خەڵك لە باوەڕی ناڕاست بەڕونکردنەوەی راستیەکان دەرگایەکی گەورەیە لەدەرگاکانی بانگەواز بۆ چاکە[٦٧٨].

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەوەی بگات بەنوێژی جومعەدا دروست نیە نوێژی نیوەڕۆ بکات مەگەر جومعەکەی فەوتابێت بەبێ جیاوازی زانایان، ئەگەر پێش فەوتانی جومعە نوێژی نیوەڕۆ بکات ئەو دوو وتەی مەشهوری لەسەرە، راستەکەیان ئەوەیە نوێژەکەی بەتاڵەو دەبێت بیکاتەوە، چونکە نوێژی فەرز نوێژی جومعەکەیە[٦٧٩].

[677] – البحر الرائق: (١٤٣/٢) الجمعة.

[678] – الدين الخالص: (١٧٥/٤).

[679] – شرح المهذب: (٤٩٦/٤).

# سەرپێچیە گوفتاری و کردارییەکانی وتاربێژان

**١- وازهێنان لە سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار:**

ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم چونکە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لەسەرەتای هەموو وتارێکەوە سوپاس و ستایشی خوای دەکرد.

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: وتاری پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم لە رۆژی جومعەدا، لەسەرەتاوە سوپاس و ستایشی خوای دەکرد، پاشان بەدەنگی بەرز بابەتی وتارەکەی دەست پێدەکرد.

لە گۆ(لفظ)ێکی تردا: لەسەرەتاوە سوپاس و ستایشی خوای دەکرد بە جۆرێك کە هەر شیاوی ئەو بێت، پاشان دەیفەرموو: (مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ وَخَيْرُ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ)[٦٨٠].

**٢- پاڕانەوە لەکاتی سەرکەوتنە سەر مینبەردا:**

زۆرجار دەبینین وتاربێژ لەبەردەم مینبەردا رادەوەستێ و دوعایەکی دیاریکراو دەخوێنێ پاشان سەردەکەوێتە سەر مینبەرو بۆ هەر پلەیەك دوعایەکی تر دەخوێنێ... بەو شێوەیە هەتا خەڵك وادەزانن لەکاتی سەرکەوتنە سەر مینبەر بۆ وتاردان و دابەزیندا دوعای تایبەتی هەیە... ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیە وسلم.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: دوعای سەرکەوتنە سەر مینبەر هیچ بنەمایەکی نیە[٦٨١].

**٣- وازهێنان لە سەلام کردن لە نوێژخوێنان لەکاتی سەرکەوتنە سەر مینبەردا:**

ئەم کارە پێچەوانەی سوننەتە چونکە پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم: (كَانَ إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ سَلَّمَ)[٦٨٢]. واتە: کاتێ دەچووە سەر مینبەر سەلامی دەکرد.

---

[680]– زاد المعاد: (١/ ٤٢٦).

[681]– الأختيارات الفقهية: (٤٨).

[682]– رواه ابن ماجة عَنْ جَابِر– صحيح الجامع: (٤٧٤٥).

٤- وتاری دووهەم بەبێ پەند و ئامۆژگاری:

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: ناوهێنـانی وتـاری دووهـەم بـە وتـاری باسـکردن و پیاهەڵدان بیدعەیە، هەروەها روتکردنەوەی لەپەند و ئامۆژگاری و رێنمایی و وەبیرهێنانەوە و ترساندن و مژدەدان بیدعەیە... چونکە وتاری پێغەمبەر صلی الله علیـە وسـلم بـەو شـێوەیە نەبووە[٦٨٣].

٥- دیاری نەکردنی بابەتی وتارەکە:

زۆر لە وتاربێژەکان بابەتی وتارەکەیان دیاریی ناکەن، بەمەش بابەتی وتارەکە لە زەینیدا نامێنێ و لە بابەتی زۆر دەدوێت، سەرەنجام دەبێتە هۆی درێژەپێدانی وتارەکە بەبێ سوود، گوێگر نازانێ وتاربێژ باسی چی دەکات و هیچ سوودێکی لێ وەرناگرێت.

٦- پابەند بوون بە (سجع)ەوە:

(سجع) ئەوەیە کە بڕگەکان بەهەمان پیت کۆتاییان بێت.

دەبینین زۆر لە وتاربێژەکان (سجع) بەکاردەهێنن، بەتایبەتی لەکاتی پاڕانەوەدا دوعایەك دەکەن لەوەزن و قافیەدا بگونجێ لەگەڵ ئەو دوعایەی کە بەدوایدا دێت.

پێشەوا ئیبن حەجەر دەڵێ:غـەزالی دەڵـێ: (سـجع) کاتێـك کەراهـەتی هەیـە کـە بـەزۆر لەخۆکردن بێت، چونکە ناگونجێت لەگەڵ لالانەوەو ملکەچی و زەبونیدا، بەڵێ هەنـدێ دوعـای (مأثور) بە شێوەی(سجع) هەیە بەڵام بەزۆر لەخۆکردن نەبووە. [من فتح الباری: ١١/٩٣١].

بەکارهێنانی وشـەی غـەریب و وتـەی دوور لـە تێگەیـشتنی گـوێگران کەراهـەتی هەیـە بەپێی وتەکەی پێشەوا عەلی رەزای خوای لێ بێ: (حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَـذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ؟)[٦٨٤].. واتە: بە شێوازێ لەگەڵ خەڵك قسەبکەن و بدوێن کە تێبگـەن، ئایـا پێتـان خۆشە خواو پێغەمبەرەوە بەدرۆدا بخرێنەوە؟.

---

683 – السنن والمبتدعات: (٩١).

684 – ذکرة امام ابن حجر في الفتح: (١/١٦٠).

وتاریێژ لەسەریەتی و ئەوەی لێ داواکراوە حاڵەتی خەڵکەکە موراعات بکات، هۆشیاری بدات سەبارەت بەو سەرپێچی و بیدعانەی کە خەڵکەکە تێیدا نقوم بوون، پابەند نەبێت بە(سجع)و گرنگیدان بە چاککردنی وتەکانی و وازهێنان لەحاڵەتی ئامادەبووان، چونکە پابەندبوون بە (سجع)ەوە دەرچوونە لەمەبەست[٦٨٥] .

**٧- درێژکردنەوەی وتار و کورتکردنەوەی نوێژ:**

هەندێ لە وتاربێژەکان ئەوەندە درێژ بە وتارەکانیان دەدەن هەتا خەڵك بێزار دەبن و بەبێ ئەوەی سوودی لێ ببینن دەچنەوە ماڵەوە... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

لە (وَاصِلِ کوڕی حَيَّانَ)ەوە دەگێڕنەوە کە (أَبُو وَائِلٍ) وتویەتی: (عَمَّار) وتارێکی کورت و پوختی بۆداین، کاتێك دابەزی وتمان: ئەی (أَبَا الْيَقْظَانِ!) بەڕاستی وتارەکەت کورت و پوخت بوو. خۆزگە زیاتر دەبوو! وتی: لە پێغەمبەرم صلی الله علیه وسلم بیستووە دەیفەرموو: (إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ فَأَطِيلُوا الصَّلاَةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا)[٦٨٦]. واتە: درێژی نوێژی پیاو و کورتی وتارەکەی نیشانەی زانایەتیەتی، جا نوێژ درێژبکەنەوە و وتاریش کورت.

پێشەوا نەوەوی دەڵێ: ئەم فەرمودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێچەوانەی فەرمودە مەشهورەکان نیە کە فەرمان دەکەن بەکورتکردنەوەی نوێژ، بەپێی وتەکەی کە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: (وَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْدًا وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا) . واتە: هەم نوێژ و هەم وتاری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مام ناوەندی و میانەکار بووە. لەبەرئەوە مەبەست لەو فەرمودەی ئێمە باسی دەکەین ئەوەیە نوێژەکە درێژتر بێت بەچاو وتارەکەوە نەك ئەوەندە درێژ بێت ببێتە هۆی بێزاربوونی مەئمومەکان و مام ناوەند بێت، هەم وتارەکەش مام ناوەند بێت[٦٨٧] .

---

685– الدين الخالص: (٤/٢١١).

686– أخرجه مسلم: (٤٧) كتاب الجمعة.

687 – مسلم بشرح النووي: (٦/٢٢٦).

**٨- بەردەوامی لەسەر وتەکەیان: (أو کما قال..) لە وتاری یەکەمدا:**

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: بەردەوام بوونیان لەسەر وتەی: (أو کما قال..). واتە: یان ئاوای فەرموو. لە کۆتایی وتاری یەکەمەوە هەروەها لەدوای فەرمودەوە نەزانی و لاسایی کردنەوەی کوێرانەیە بەڵام ئەگەر گومانی هەبوو یان فەرمودەکەی لێ تێك چوو ئەوە هیچی تێدا نیە[٦٨٨].

**٩- خوێندنی سورەتی (الإخلاص) سێ جار لەنێوان دوو وتارەکەدا:**

دەبینین زۆر لە وتاربێژەکان لەدانیشتنی نێوان دوو وتارەکەدا سورەتی (الإخلاص) سێ جار دەخوێنن یان زیکر و دوعای زۆر دەکەن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم.

ئەوەی لەوبارەوە بەراستی و بە سابتی هاتووە بێدەنگ بوونە... لەبەر ئەو فەرمودەی کە پێشەوا (النسائي) لە (سنن)ەکەیدا (لەباسی بێدەنگ بوون لەدانیشتنی نێوان دوو وتارەکەدا) دەیگێڕێتەوە: پاشان سەنەدەکەی دەداتە پاڵ (جَابِرِ کوڕی سَمُرَةَ) کە فەرموویەتی: (رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَائِمًا ثُمَّ يَقْعُدُ قِعْدَةً لَا يَتَكَلَّمُ ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ خُطْبَةً أُخْرَى فَمَنْ حَدَّثَكُمْ أَنَّهُ رَآهُ يَخْطُبُ قَاعِدًا فَقَدْ كَذَبَ). واتە: پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم بینوە لەرۆژی جومعەدا بەپێوە وتاری دەدا پاشان دانیشت بەبێدەنگی و قسەی نەدەکرد، ئینجا هەستایەوە بۆ وتاردان و وتارێکی تری دەخوێندەوە، هەرکەس باسی ئەوەی بۆکردن کە گوایە پێغەمبەری صلى الله عليه وسلم دیوە بەدانیشتنەوە وتاری داوە بێگومان ئەوە درۆ دەکات.

لەهەمووی سەیر تر ئەوەیە هەندێ نووسەر ئەم سەرپێچیە ئاشکرا و روونەیان لە نوسینەکانیاندا سەلماندووە سوننەتەکانیان مراندووە و بیدعەیان زیندووکردۆتەوە لەخوا بترسن[٦٨٩].

---

688- السنن والمبتدعات: (ص: ٩٠).

689- السنن والمبتدعات: (ص: ٩٠-٩١).

**١٠- وتەکەیان: (اذكروا الله يذكركم):**

هەندێ لە وتاربێژەکان عادەتیان وایە بە وتەی: (أذكروا الله يذكركم) کۆتایی بە وتاری دووهەم دەهێنن بۆ ئەوەی نوێژخوێنان بەدەنگی بەرز بڵێن: (لا إله إلا الله)، ئەمەش لە سوننەتی پێغەمبەر نیە صلى الله عليه وسلم.

**١١- ئاوڕدانەوە بەلای ڕاست و چەپدا لەکاتی وتاردا:**

سوننەت ئەوەیە وتاربێژ ڕووی لە خەڵکەکە بێت و بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕنەداتەوە.

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: ئەو مینبەرەی کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم جگە لە ڕۆژی جومعە لەسەری دادەنیشت یان ڕۆژی جومعە بەپێوە وتاری دەدا لەسەری ڕووی لە هاوەڵەکانی بوو ئەوانیش ڕوویان لە ڕووخساری پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بوو[٦٩٠].

**١٢- وتەکەیان: (التائب من الذنب كمن لا ذنب له):**

(شيخ محمد عبدالسلام الشقيرى) دەڵێ: بەردەوام بوونیان لە کۆتایی وتاری یەکەمەوە لەسەر وتەی: (التائب من الذنب كمن لا ذنب له) واتە: ئەوەی تەوبە بکات لە گوناه وەك ئەوە وایە گوناهی نەبێت. هەروەها لەسەر وتەی: (ادعوا الله وأنتم موقنون بالإجابة). واتە: بپاڕێنەوە لە خوای گەورە دڵنیابن دێت بەهاوارتانەوە. بێگومان ئەمە بیدعەیە و جگە لە نەزانی هیچی تر نیە، وای لێ هاتووە هەندێ لە خەڵك پێیان وایە وتاری جومعە بەبێ ئەم ڕستانە ناتەواوە[٦٩١].

**١٣- وتەکەیان لە کۆتایی وتاردا:** ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَـٰنِ ﴿٩٠﴾﴾ النحل: ٩٠:

هەندێ لە وتاربێژەکان وەها دەزانن وتاری دووهەم هەردەبێ بەم ئایەتە پیرۆزە کۆتایی بێت... کردویانە بە سوننەت و هەرکەس وازی لێ بهێنێت سەرزەنشتی دەکەن... ئەمەش هەڵەیە چونکە لە سوننەتی پێغەمبەر نیە صلى الله عليه وسلم.

---

690- زاد المعاد: (١/ ٤٣٠).

691- السنن والمبتدعات: (ص: ٩٠).

**١٤- دەنگ نزمکردنەوەو لەسەرخۆیی لەکاتی وتارداندا:**

هەندێ لە وتاربێژەکان بەشێوەیەك دەنگیان نزم دەکەنەوە کە ئامادەبووان گوێیان لێی نەبێت، یان هەندێ جار ئەوەندە لەسەرخۆن نوێژخوێنان بێزار و بێ تاقەت دەبن... ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

پێشەوا ئیبن قەیم دەربارەی سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لە وتارداندا دەڵێ: (كَانَ رَسُولُ اللَّهِ –صلى الله عليه وسلم– إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلاَ صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ). واتە: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کاتێك وتاری دەدا چاوەکانی سور هەڵئەگەڕاو دەنگی بەرزدەکردەوە و رق و قینی هەڵئەسا ئەتگوت وریاکەرەوەی سوپایە دەیفەرموو: بەیانی یان ئێوارە سوپا دەدات بەسەرتاندا[٦٩٢].

**١٥- پشت بەستن و وەستانی وتاربێژ لەسەر شمشێر یان گۆچان:**

هەندێ لە وتاربێژەکان پێیان وایە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەکاتی وتارداندا شمشێرێکی دەگرت بەدەستەوە... ئەمەش هەڵەیە و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلی الله علیه وسلم.

پێشەوا ئیبن قەیم دەڵێ: پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەکاتی وتارداندا شمشێر و جگە لەویشی نەگرتووە بەدەستیەوە، بەڵکو پێش ئەوەی مینبەری هەبێت پشتی دەبەست یان دەوەستا لەسەر کەوان یا گۆچان، لەکاتی جەنگدا لەسەر کەوان، لە جومعەدا لەسەر گۆچان، لێیەوە نەگێڕاوەتەوە کە پشتی بەستبێ یان وەستابێ لەسەر شمشێر، ئەوەی کە هەندێ نەفام وادەزانن هەمیشە پشتی بەستووە یان وەستاوە لەسەر شمشێر و ئاماژەیە بەوەی کە دین بە شمشێر پیادە دەکرێت، لە زیادەڕەوی نەزانینیانەوەیە، لێیەوە سابت نەبووە لەدوای دانانی مینبەر پشتی بەستبێ یان وەستابێ لەسەر شمشێر یا گۆچان یا هەرشتێکی تری لەو جۆرە، لەپێش دانانی مینبەریشەوە هەرگیز شمشێری نەگرتووە بەدەستیەوە، بەڵکو پشتی بەستووە یان وەستاوە لەسەر شمشێر یان گۆچان[٦٩٣].

---

[692]– زاد المعاد: (١/ ٤٢٥).

[693]– زاد المعاد: (١/ ٤٢٩٠).

**١٦- پشت بەستن بە فەرمودەی هەڵبەستراو:**

ئەمەش خوو نەریتی زۆر لە وتاربێژەکانە ئەوانەی کار بۆ دینی خوای گەورە ناکەن، وە هەوڵ نادات هەتا بزانێ کام فەرمودە صحیحە و کامەش لاوازە، بۆیە دەبینین لەسەر مینبەر بیدعە بڵاودەکاتەوە بەناو خەڵکدا وادەزانێت سوننەتی فێرکردوون... نازانێ بەوە درۆی کردووە بەدەم خواو پێغەمبەرەکەیەوە.

بێگومان پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم سەبارەت بەوە هۆشیاری داوەو دەفەرموێت: (...وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ)[٦٩٤]. واتە: هەرکەس بەدەم منەوە درۆبکات با جێگایی خۆی لەدۆزەخدا خۆش بکات.

**١٧- گوێنەدان بە کاروباری ئوممەت:**

هەندێ لە وتاربێژەکان: دەبینین یەکێ لەوان کاتێ وتار دەدات باسەکەی هەمووی بەسەرهاتە بەبێ ئەوەی بەسەرهاتەکە پەند و ئامۆژگاری تێدا بێت، تەنها لە پێناوی ئەوەدا کە کاتەکەی پڕبکاتەوە.

لەهەمان کاتدا دەبینین برا موسڵمانەکانمان لەهەموو شوێنێکی سەر زەویدا سەردەبڕێن ئاوارە دەکرێن، لەگەڵ ئەوەدا وتاربێژە نابینی باسیان بکات تەنانەت بە پاڕانەوەش بێت بۆیان، وەك ئەوەی وتاربێژ لە شیوێکدا بێت و حاڵی موسڵمانەکانیش لە شیوێکی تردا بێت.

**١٨- نەزانینی بنچینەو بنەماکانی زمانی عەرەبی:**

بەنسبەت ئەم سەرپێچیەوە چۆن باسی دەکەیت بیکە هیچی تێدا نیە، تەنانەت وتاربێژێك نابینی شتێك بزانێت و شارەزایی هەبێت لە قەواعید و بنەماکانی زمانی عەرەبیدا -مەگەر کەسێك خوا رەحمی پێ کردبێت- ... بۆیە دەبینین قسەکانی بەشێوەیەکە ئازاری ئەو خەڵکانەی چواردەوری دەدات.

---

[694]– رواه أخرجه البخاري وأحمد عَنْ ابن عمرو– صحيح الجامع: (٢٨٣٧).

شێخ مەحمود (خطاب السبكي) دەڵێ: پێویستە وتاربێژ شارەزایی چاکی هەبێت لەزمانی عەرەبیدا بەتایبەتی لەزانستی دارشتن(الإنشاء)دا بۆ ئەوەی بتوانێت وتەکانی بەجوانی دابڕێژێت و قسەی پڕ ماناو کاریگەر بکات، دڵی گوێگران روناك بکاتەوە، وریاکەرەوە بێت، زمان پاراو بێت، زاراوەی رەوان و تێگەیەنەر بێت، قسەکانی تێکەڵ و پێکەڵ نەبێت هەتا خەڵك بێزار نەبن و هەڵنەیەن، ئاراستەکار بێت بەشێوەیەك کاریگەری هەبێت بۆ دڵ و دەروون[٦٩٥].

**١٩- بەرزکردنەوەی دەستەکان لەکاتی پاڕانەوەدا:**

ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم.

ئەمەش یەکێکە لەو هەڵانەی باوە لەناو وتاربێژەکاندا، زۆربەیان لەکاتی پاڕانەوەدا دەستیان بەرزدەکەنەوە... لە (عُمَارَةَ)ی کوڕی (رُؤَيْبَةَ)ەوە هاتووە کە (بِشْرَ)ی کوڕی (مَـرْوَانَ)ی لەسەر مینبەر دیوە دەستەکانی بەرزکردۆتەوە فەرموویەتی: (قَبَّحَ اللَّهُ هَاتَيْنِ الْيَدَيْنِ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم مَا يَزِيدُ عَلَى أَنْ يَقُولَ بِيَدِهِ هَكَذَا. وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الْمُسَبِّحَةِ)[٦٩٦]. واتە: خوا ئەو دوو دەستەی بێ خێر و ناشیرین بکات، چونکە من پێغەمبەرم صلى الله عليه وسلم دیوە لەوتاری جومعەدا ئاماژەی بە پەنجەی دەکرد لەکاتی پاڕانەوەدا بەو شێوەیە دەستەکانی بەرز نەدەکردەوە.

پێشەوا ئیبن تەیمیە دەڵێ: کەراهەتی هەیە پێشنوێژ لەکاتی پاڕانەوەی وتاری جومعەدا دەستەکانی بەرزکاتەوە، چونکە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم تەنها ئاماژەی بە پەنجەی دەکرد لەکاتی پاڕانەوەدا[٦٩٧].

---

695– الدين الخالص: (٢٠٧/٤).

696– أخرجه مسلم: (٨٧٤) والنسائي: (١٠٨/٣) وأبو داود (١١٠٤).

697– الأختيارات الفقهية: (ص: ٤٨).

پێشەوا (قاضي عیاض) دەڵێ: پێشەوا مالیك و هەندێ لە پیاو چاكانی پێشین راوبۆچونیان وەهایە بەرزكردنەوەی دەستەكان لەكاتی پاڕانەوەی وتاردا كەراهەتی هەیە لەبەر ئەم فەرمودە، چونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تەنها ئاماژەی بە پەنجەی دەكرد لەكاتی پاڕانەوەداو لەوە زیاتری نەدەكرد.

بەلاّم هەندێ لەهاوەڵەكانمان رێیان پێداوە، چونكە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەوتاری جومعەدا لەكاتی پاڕانەوەی نوێژە بارانەدا دەستەكانی بەرزكردۆتەوە[698].

ئەوانەی رێگریان لێكردووە بەم شێوەیە وەلاّمیان داوەتەوە دەست بەرزكردنەوەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەكاتی نوێژە بارانەدا بەرزكردنەوەی دەستەكان ناگەیەنێت لەكاتی وتاری جومعەدا، لەبەر ئەوە كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پاش داواكردنی باران وازی لە دەست هەڵهێنان هێناوە لەكاتێكدا كە هۆكار بۆ بەركردنەوەیان بوە رێگریش لەرێیدا نەبوە كەوتە واز لێ هێنانی سوننەتەو دەست بەرزكردنەوە بیدعەیە[699].

**٢٠- بەردانەوەی پۆشاك:**

ئەمەش كارێكی باوە، بەتایبەتی لەناو ئەو وتاربێژانەدا كە دینیان كردووە بە پیشەو لەپێناو موچەی مانگانەدا كار دەكەن.. بۆیە ئەوانە هەموویان دەبینین -مەگەر كەسێك خوا رەحمی پێ كردبێت- پۆشاكەكانیان هەتا سەر زەوی شۆڕدەكەنەوە و دەكەونە ناو تاوانی بەردانەوەی پۆشاك كە خۆشەویست صلی الله علیه وسلم دەربارەی دەفەرموێت: (ثَلاَثَةٌ لاَ يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلاَ يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالْمَنَّانُ، وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ)[700]. واتە: سێ كەس لە رۆژی قیامەتدا خوا نایان دوێنێ و روویان تێ ناكات و لە تاوان پاكیان ناكاتەوەو سزای توندیان بۆ دەبێت: كەسێك جلی شۆڕ لەبەر بكات، وە كەسێك خێر بكات و دوایی و بیداتەوە بەناوچاودا، كەسێ شمەك و كەلوپەلی بە سوێندی درۆ بفرۆشێت و ساغی بكاتەوە.

---

[698]– المنهل العذب: (٦/ ٢٦٩).

[699]– الدين الخالص: (٤/٢٠٩).

[700]– أخرجه مسلم: (١٠٦) والترمذي: (١٢١١).

بەمە وتاربێژ دەبێتە پێشەنگێکی خراپ بۆ موسڵمانان و ئەوانەی لە دەوروبەریدان.

**٢١- ریش تاشین و خۆچواندن بەکافران لە پۆشاکیاندا:**

(شیخ محمد عبدالسلام الشقیری) دەڵێ: یەکێك لە خراپەکانی موسڵمانان لەم رۆژگارەدا ئەوەیە وتاربێژەکان ئالەتێکی کەرولاڵن لەدیواندا پاریزراون، بەبێ هیچ هەست و نەستێك حیکایەت دەکەن، نە دەبەخشن وە نە سوودیان هەیە، نیشانەی ئەمەش ئەوەیە زاناکان و تاربێژو پێشنوێژی مزگەوتەکان ریشیان دەتاشن و پۆشاکی ئاوریشم لەبەردەکەن و چاویلکەی ئاڵتونی لەچاو دەکەن و بەو شێوەیە دەچن بۆ مزگەوتەکان بەگومانی ئەوەی بۆ نوێژی جومعە خۆیان دەرازێننەوە بێ ئاگان لەوەی ئەو خۆرازاندنەوەیە خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە صلی الله علیه وسلم حەرامی کردووە، بەڵکو ئەو زینەت و جوانیە بۆ ئافرەتانە نەك بۆ پیاوان، پاشان ئەوەی دەیڵێن خۆیان پەندو ئامۆژگاری لێ وەرناگرن و کاری پێ ناکەن، ئیتر چۆن رێنمایی و پەندو ئامۆژگاریەکانیان کاریگەری دەبێت بۆسەر خەڵك: ﴿ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ البقرة: ٤٤ . واتە: ئایا فەرمان بەخەڵکی دەدەن بە چاکە؟ وە خۆتان فەرامۆش دەکەن (لەگەڵ ئەمەشدا) کە ئێوە دەوری پەڕاوەکە (تەورات) دەکەنەوە، دەی ئایا ژیرنابن و تێ ناگەن؟. ئایا وتەکەی شوعەیبتان نەبیستووە کە بە قەومەکەی فەرموو: ﴿ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ هود: ٨٨ . واتە: وە من هەرگیز نامەوێ پێچەوانەی ئێوە بکەم لەو (کارەی) بەرگری ئێوەی لێ دەکەم (خۆم بیکەم) من هیچ مەبەستێکم نیە بێجگە لە چاککردن ئەوەندەی بتوانم، سەرکەوتوویم تەنها بەپشتیوانی خوایە پشتم هەر بەو بەستووە هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە. ئەی بەرپرسانی موسڵمانان سوێند بەخوا ئێوە بەرپرسیارن و خۆتان بەدووربگرن لە سزای سەخت و بەسۆ[٧٠١].

---

[701]- السنن والمبتدعات: (ص: ٨٩).

### ٢٢- پێشەنگی خراپ:

سوێند بەخوا دەبینین زۆر لە وتاربێژەکان یەکێ لەوان رادەوەستێ لەسەر مینبەر باسی حەلاڵ و حەرام دەکات بۆ خەڵك خەریکە مینبەرەکە بڕوخێنێ ئەوەندە بە توندی وتار دەدات... کاتێ دوای نوێژ لە مزگەوت هاتەدەرەوە لەبەردەم دەرگای مزگەوتدا رادەوەستێ و جگەرەی لێ دادەگیرسێنێ، بەڕێگاو باندا سەیری ئافرەتان دەکات کە خەڵك بەم شێوەیە دەیبینن ئیتر دین شتێکی ئاسایی دەبێت لەناو دڵیاندا پێشەنگی چاك لەدەست دەدەن، خراپە بەلایانەوە شتێکی ئاسایی دەبێت، چونکە پێشەنگ و پێشنوێژەکەیان دەبینن خۆی لە گوناهو تاوان ناپارێزێت.

پێشەوا (أبو الأسود الدؤليّ) رەزای خوای لێ بێ دەڵێ:

يا أيها الرجـــل المعلم غيره ... هلا لنفسك كان ذا التعليم

تصف الدواء لذي السقم وذي العنا ... كيما يصح بـــه وأنت سقيم

ونراك تصلح بالرشاد عقولنا ... صفة وأنت من الرشاد عديم

ابدأ بنفسك فانهها عن غيها ... فإن انتهت عنه فأنت حكيم

وهناك يُقبل ما تقول ويُشتفي ... بالقول منك وينفع التعليم

لا تنه عن خلق وتأتي مثله ... عار عليك إذا فعلت عظيم

* * *

## برای خۆشەویست ... خوشکی بەڕێزم:

ئەم کتێبەی بەردەستت داواکارم لە خوای گەورە سوود بگەیەنێت بە هەموو موسڵمانێك لەهەموو کات و زەمانێکدا، بیخاتە سەر تەرازووی کردەوە چاکەکانی دایك و باوکم لە ڕۆژی ڕەستاخێزدا.

ڕاستی و دروستیی کتێبەکە تەنها لە خواوەیە، هەر ناتەواویی و سەهو هەڵەیەکیشی تێدا بێت ئەوە لە من و لە شەیتانی نەفرەتیەوەیە.... خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم لێی بەرین... پەنادەگرم بە خوای گەورە لەوەی وەبیری ئێوەی بهێنمەوە و خۆم لەبیری بکەم.

جا ئەوەی خوێندیەوەو کەڵکی لێ وەرگرت با لە دوعای خێر بێ بەشمان نەکات بەڵکو خوای گەورە لە هەڵەو کەموکوڕیەکانی منیش و ئێوەش ببورێت، وە هەمووومان کۆبکاتەوە لە بەهەشتە جوان و ڕازاوەکەیدا بەرامبەر بەیەك لەسەر کورسی و قەنەفەکاندا.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد أن لا إله إلا الله أستغفرك وأتوب إليك

وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم

هەژاری بەر قاپی ڕەحمەتی پەروەردگار

(محمود المصري أبو عمار).

# پێرستەکان

# بەرهەمەکانی ناصح ئیبراهیم سازانی

١- فەزڵی نوێژ و کاریگەری لەسەر پەروەردە و تەزکیەی نەفس چوار جار چاپکراوە.

٢- خواپەرستی و ئاسەوارەکانی لەسەر پەروەردەی دەروون.

٣- گەشتی قیامەت دووجار چاپکراوە.

٤- پەروەردەی منداڵان لە ئیسلامدا. نووسینی د. عبدالله ناصح عەلوان، وەرگێڕان.

٥- ئەم کتێبەی بەردەستت (هۆشیاریدان سەبارەت بە هەڵەی هەندێ لە نوێژخوێنان).

٦- دایە و بابە فێرم بکەن چۆن نوێژ بکەم؟ دووجار چاپکراوە.

بە پشتیوانی خوای گەورە چاوەڕانی بەرگی یەکەمی فەرمودەکانی ئەبو داود بن.